کەسێکی تر سوربوو لەسەر ئەوەی کە ئەوان بۆیە چوونەتە ئەوێ تا پشتیوانی لە کوردانی سوریە بخوازن. جیا لەوانەیش دیارە کە شتەکان بێ پلان نەبوون. قایقچی لەوێ زەنگیدا بۆ شوێنی مانەوەی ئۆجەلان‌و لێی پاڕایەوە تا لێخۆشبێت. هاوکات ئەوەی خستە ڕوو کە لەپێناو ئەوەی ڕێگەی پێبدرێت جارێکی تر بژی، بەڵێن دەدا ئیدی توخنی سینەر نەکەوێت.

هاوکات لە یەکی مانگی یازدەی هەمان ساڵدا سینەرو خانمێك لە ئاپارتمانەکەیاندا بە کوژراوی دۆزرانەوە. باران لەم بارەیەوە ئاماژە بەوەدەکات کە کاتێك سینەر کوژراوە ئەو لە شاری دهۆکدا بووە. باران دەیووت:" هەمان ڕۆژ هەواڵەکەم بیستن کەسێك نێردرا تا بەمن بڵێتن هێشتا سینەر نەمردبوون ئەو بەبرینداری برابوو بۆ خەستەخانە. کاتێکیش بیستم سینەر مردووەن وا بیرمنەدەکردەوە ئیتر هەموو شتێك تەواو". لەم کاتەدا باران‌و نێزیکەی پەنجا لەشوێنکەوتوانی لەتورکیاو سوریا گردبوونەوە تا گفتوگۆ لەبارەی ئەگەرە نوێیەکان بکەن. دوواجار ئەوان پابەندبوون بەوەی درێژە بەخەبات‌و کارەکانیان بدەن. باران دەیگوت:" ئێمە هەوڵماندا، وەلێ چەندین گرفتمان هەبوو".

گرفتەکان تەنها خۆیان لە نەیاریەتی دەوڵەتی تورك نەدەبینییەوە کە دژی چێبوونی هەر گروپێکی کوردی بوو، وەلێ خودی پەکەکە گرفتی بەردەم گروپەکەی باران بوو. هاوکات زۆرێك لەوانەی کە لەهەوڵی ئەوەدابوون لە ڕیزەکانیاندا خۆیان ڕێکبخەن کوژران‌و لەنێوبران. ئیتر باران پێش ئەوەی واز لە هەوڵە بەرهەڵستکارییەکانی بهێنێت‌و بەرەو ئەورووپا ملبنێت، بۆ چەند ساڵێك پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێراق لەلای خۆی هێشتیەوەو داڵدەیان دا.

لەراستیدا جودا بوونەوەی باران‌و سینەر جددیترین هەڕەشە بوو کە تا ئەوکات رووبەڕووی ڕێبەرایەتییەکەی ئۆجەلان بێتەوە، هەروەها لەپاش ئەو جودابوونەوە هیچ ڕەوشێکی هێند مەترسیدار رووبەڕووی ئۆجەلان نەبووەتەوە.

پاش کوشتنی سینەر، ئیدی هێزو دەسەلاٌتی ئۆجەلان بەتەواوی لەمپەری لەبەردەمدا نەما. ئیدی لە شوناسی ئۆجەلاندا ئەو رووداوە بوویەبەشێك لەو رووداوانەی کە لەمێژووی پەکەکەدا وەك پلانێگێڕییەکی مەزن تەماشا دەکرێت. هاوکات پاش کوشتنی سینەر ئۆجەلان ئیدی ئەوەی دووپاتکردەوە کە هیچ یاخیبوونو ئاژاوەیەك لێبووردنی بۆنییە، هاوکات بوارێکیش بوو تا ئۆجەلان ئەو هێزانەی تا ئەوکات لەبەردەم ئۆجەلاندا چۆك دانادەن بەتەواوی وابەستەیان بکاتەوە بە پەکەکەوەو هەمووان بهێنێتە ژێر رکێفی دەسەلاٌتی خۆیەوە.

لە راستیدا هەرچەند تەنها چەند کەسێکی کەم باوەرشی وابوو کە سینەر بەکرێگیراوە، وەلیٚ هیچ کەسێك نەیدەوێرا راستیو دروستی سینەر بلێتو بەرگری لەبۆچوونەکەی بکات. باران دەیوت کاتێك سینەر دەستگیرکرا لەلایەن جەمیل بایك، وەك هەموو ئەوانی تر پێم راگەیاند کە بڕواناکەین سینەر ناپاك بێت، جەمیل لەوەلاٌمدا گووتی، ئەوە فەرمانی سەرۆکەو ئەم مشتومڕە هەر لەویٚ بڕاوەتەوە، لەبەر ئەوە کەسێك بیرینەدەکردەوە کە سینەر بەکرێگیراو بێت، بەلاٌم هەمووان کۆیلەی ئۆجەلان بوون".

ئۆجەلان هیچ رکابەری نەماو زالٌ بوو بەسەر هەمووانداو تەحەداکانی بێدەنگ کرد، ئیدی خۆی بۆ هەنگاوی ئایندە ئامادەکرد، کە بەهەرچۆنێك بووە تورکیا ناچاربکات بێتە نێو دانوستانی سیاسییەوە. ئۆجەلان نەخشەی بۆ ئەوە دارشت، ئەو لەرێگەی فراوانکردنی دەسەلاٌتی پەکەکەو خزانی بۆ نێو تۆڕو کۆمەلٌە یاساییەکان هاتە ناو، هاوکات بڕیاریاندا هەر پرۆتستۆیەکی مەدەنیو جەماوەریی بقۆزنەوەو دەسەلاٌتیان شۆڕکەنەوە بۆنێو نارەزاییە جەماوەرییەکان . هەروەها بڕیاریاندا جەنگی چەکداریی بەجارێك لە هەرێمەکەدا درێژە پێبدەن، بەجۆرێك ئیتر تورکیا نەتوانێت بانگەشەی ئەوە بکات کە دارای دەسەلاٌتی تەواوە لە هەرێمەکەدا.

## باسی یەکەم:

## جەنگ لە شەقامەکاندا (١٩٩١-١٩٩٢)

دوو مانگ دوواتر کوردەکان لە نوسەیبین‌و سیعرت‌و گەلێ لەشارەکانی تر لەباشووری ڕۆژهەڵاتدا، ئیتر هاتنە نێو شەقامەکانەوەو دروشمەکانی سەر بەپەکەکەیان وەك سروود دەهۆنییەوەو بەردیان دەگرتە باڵەخانە حکومییەکان‌و بینایەی هێزە ئاسایشییەکان. ئەیهان سیفتسی تەمەن ٢٢ساڵ بڕیاری دابوو بچێتە نێو ڕیزی یاخیبووەکانەوە، ئەو دەیوت: "سەرهەڵدانەکان هەستێکی وروژێنەریان لەناخماندا چاندبوو". سیفستی دواتر بووە خوێنکاری زانکۆ لە ئەستەمبوڵ. هەمیشە دەیوت ئێمەی قوتابی باوەڕمان وابوو کە دارای هێزو هەرەکەتێکین تا بتوانین دەوڵەتێکی کوردی دروستبکەین.

هەرچەند کە سیفستی بەدانپێدانانی خۆی، ئەوکاتەی کە نەوییە خەبات لەپێناو ئامانجەکانی پەکەکەدا هیچی لەبارەی پەکەکەوە نەدەزانی. چوون بڵاوکراوەکانی پەکەکە بەئەستەم چنگ دەخران‌و ڕۆژنامە لۆکاڵییەکانیش تەنێ تیشکیان دەخستە سەر تێرۆریزمی پەکەکەو خۆیان لەپرس‌و پێناوی نەتەوایەتی کوردان دەبووارد. هەموو ئەو ڕاپۆرتە نێوخۆییانە لەلای سیفتسی نە باوەڕپێکراو بوون نەیش زانیاری بەخش‌و بەسود بوون. لەجیهانبینی سیفتسی دا ئەوەی دەیزانی لەبارەی پەکەکەوە بەس بوو بۆ ئەوەی سەرگەرمبێت بە وێردو وانەی نەتەوەییەوە. سیفستی لەوە تێگەیشتبوو کە پەکەکە بەرگری دەکات لەسەربەخۆیی کورد، لەبەر ئەوە جەنگەکەی ئەوان جەنگێکی بەرزو پیرۆزبوو، هاوکات هیچ بەدیلێکیشیان بۆ خەباتی چەکداری نەدەبینی، گەر بهاتایە کوردەکان هەموویان وابەستە بەمیری‌و میراتی مستەفاکەمال بوونایە.

بەیانییەکیان لە مانگی پێنجی ١٩٩٠دا. سیفستی‌و یەکێك لەهاوڕێکانی کە لەهاموشۆکردنی پەکەکەدا بوو لەڕێگەی پاسەوە بەرەو باکووری ڕۆژئاوای وڵات وەڕێکەوتن‌و گەیشتنە ئەدرنە. ئەوان لەلایەن نوێنەری ئەستەمبوڵی پەکەکەوە

هاوەڵایەتی دەکران و پێیانی وتبوو کە گەرەکیە ببێتە چەمساغو ڕێنوێنیان بکات تا بیانگەیەنێتە یەکێ لەبارەگا ئارام و پەنهانەکانی پەکەکە لە ئەسینا دا.

ئەدرنە شارێکی سنووریی نێزیك بە یۆنان بوو. لەوێ هەرسێکیان هەر لەپاسێ دابەزین، تەکسییەکیان بەکرێ گرت بەرەو یەکێ لە کێڵگە گەورەکانی برنج لەدەرێی شاری ئەدرنە دا. لەوێدا کەسێکی دی چاوەڕێیان بوو، ئەو ئەندامانی پەکەکەی بەشێوەی نایاسایی رەوانەی دەرێی تورکیا دەکرد. نێوبراو ئاماژەی دا بەوەی پێویستە بەنێو زۆنگاو و زۆنی کێڵە برنجەکەدا هەمووان شوێنی کەون، ئیدی لەڕێگەی نێزیك لەرووباری ماریتساوە هەموویان دەرچوون. رووبارەکە ئاماژەبوو بەسنووری جیاکەرەوەی یۆنان و تورکیا، لەوێندەر چوونە نێو رووبارەکەوە، نیوە بەپێ و نیوە بە مەلان کشان بەردو ئەوبەری رووبارەکە.سیفتسی بەپێکەنینەوە دەیگێڕایەوە کە ئاو تا ملیان هاتبوو، نازانێ چۆن ئەو رێوشوێنە رێکخرا، باسی دەکرد چۆن پەکەکە هەمووشتێکی بەباشی و رێکخراوەیی ئەنجامدەدا، ئەوان سەریان سوڕمابوو لەو رێوشوێنەو حەپەسابوون. هەروەها دەیوت: "وامان دانابوو کە بەلەمێك لەوێ رێکخرابێت تا بمان کاتە ئەو بەری رووبارەکە یان هیچ نەبێت کە گەیشتینە ئەوبەر یەکێك هەبووایە بۆ پێشوازیمان و بمانباتە شوێنی مەبەست". بەڵام پاش ئەوەی لە بەلەمەکە دێنە ئەم بەر، ئیدی هاوکارەکەیان پێیان دەڵێ پێویستە بەرەو ماڵگەلێکی خوارێی رێگەکە برۆن و لەلێواری ئاوەدانییەکەدا چاوەڕێ بکەن تاپۆلیسی یۆنانی دەیانکات بەچاوەوەو لێیاندەپرسێتەوە، ئەوکات پێویستە خۆیان رادەستبکەن و بڵێن ئێمە هاوسۆزی پەکەکەین و پێویستبوو هەر زوو تورکیا جێبهێڵین. سیفستی لەگێڕانەوەی یادەوەرییەکاندا سەرێکی باداو گوتی: "پۆلیس ئێمەی قۆڵبەسکردوو رەوانەی ئەسینای کردین، لەوێ ژمارەتەلەفۆنێکمان لەلابوو، لەو رێگەیەوە پێوەندیمان کرد بەکەسێکی سەر بەپەکەکەوە تا بێت بەهانامانەوە.

سیفتسی تا ئەوکاتیش نیگەرانی ئەوەبوو کە نەکا پۆلیسی یۆنانی بەسانایی وان رادەستی دەسەڵاتدارانی تورکیا بکاتەوە. وەڵێ هاوکارەکەیان سوربوو لەسەر ئەوەی کە

شتی لەو جۆرە ئەستەمە رووبدات. ناوبراو بەمجۆرە وتوێژەکەیان دەگێڕێتەوە:
"ڕێنیشاندەرەکە وتی پێویست بە دڵخوتخوتە ناکات، چەندینجار کاری لەمجۆرەمان ئەنجامداوە. هەر بەتەنیشت ڕێگەکەوە پیاوانێك گردببوونەوە، ئەوان لەچاوەڕوانیدابوون تا ئاماژەیان پێبکرێتو کارەکەیان ڕاپەڕێنن. نێزیکەی دەمەو بەیان سیفتسی گوێبیستی ورەی سەگێك بوو کە لەپشت پەردەی پەنجەرەکەیەوە دەهات. پاش قەیرێك دەمووچاوی ژنێك دەرکەوت. چەند دەقیقەیەك دواتر پۆلیس هاتن. ئێمە پەشۆکاو و تەڕو شەکەت بووین، دروست هەڵهاتوویەکی نایاسایی بووین، وەلێ ئەوان وادیاربوو بەکارەکەیان ڕاهاتبوون. سەردەستەی پۆلیسەکان کەمێك بەتورکی قسەی کردن ئیدی سیفتسیو هاوەڵەکانی بۆماوەی ٢٠ ڕۆژێك دەستبەسەرکرانو دواتر نێردران بۆ سالۆنیکاو پاش ئەوەیش برانە ئەسینا.

لەوێ لەپێتەختی یۆنانیش بۆماوەی ١٠ ڕۆژی تر توندی زیندانکرانو پاشان بەرەڵاکران. سەرەتا پرسیاریان لێکردین لەبارەی ئەوەی ئایا شوێنێکمان هەیە بۆ مانەوە ە ئەسینا، ئیدی ڕێپیشاندەرەکەی ئەستەمبوڵ پێی ڕاگەیاندن کە ئەوان شوێنیان ەئەسینادا هەیە، پاشان برانە ئەوێ.

تورکیا هەمیشە یۆنانی وەك یەکێك لەو وڵاتانە دەژمارد کە کۆمەکی پەکەکە دەکەن، وەلێ یۆنانییەکان ئەم بانگەشەی تورکیایان دەدایە دوواوە. هەرچەند کە دەسەڵاتدارانی یۆنانیش گەشتبوونە ئەو ڕاستییەی کە باشتر وایە چاوپۆشی بکەن لە پێوەندییو ێنکەکانیان لەتەك پەکەکەدا. ئەوێ دەم وەك سەراسەر ئەورووپا میتۆدێك باو بوو کە خۆی لە چالاکی ناتوندوتیژیو خەباتی سیاسی دەبینییەوە. وەلێ ڕەوشی یۆنان جۆرێکی تر بوو، ئەو وڵاتە گەلێ پێکدادانو تەنگژەی لەگەڵ تورکیادا هەبوو. لەوانە هەیمەنەی تورکیا بۆ کۆنترۆڵکردنی دەریای نێوان دوو وڵاتو داگیرکردنی بەشێك لەقوبرس. هەربۆیە چاوپۆشی کردن لەبوونی چالاکییەکانی پەکەکە لەیۆنان تەنها بۆ ئەوەبوو ختوکەی تورکیابداتو لەو ڕێگەیەوە نەیارەکەی خۆی قوشقی بکات. پەکەکەیش لەو ڕوانگەیەوە بەرژەوەندی خۆی لەتەنگژەی نێوان دوو وڵاتدا بینیبوویەوە.

دڕزی سنووریی نێوان دوو وڵات ببویە ڕێگەیەك تا هەوادارو هاوسۆزانی پەکەکە بتوانن بەخێرایی لەتورکیا هەڵبێنو بلکێن بەرێکخستنەکانی پەکەکەوە، بەتایبەتی ئەو ئەندامە نوێیانەی پەکەکە کە لەشارەکانی خۆرئاوای تورکیا دا دەژیان ڕێگەیەکی ئاسان بوو. هەر لەو ڕێگەیەشەوە سیفتسیو هاوەڵەکانی خۆیان گەیاندە یۆنان. پەکەکە توانی ساڵی ١٩٩٠ لەیۆناندا بەنەزمێکی سەرکەوتووانە دەستبکات بەچالاکی سیاسیو پروپاگەندە، بۆ ئەم مەبەستەیش ٤ یەکەی نیشتەجێبوونی لەو شارەدا تەرخانکردبوو بۆ چالاکی ئەندامەکانی. سیفتسی دەیوت: "وەختێ هێنرامە ئاپارتمانەکە، نێزیکەی کەسێك لەوێ بوون، بۆخۆم چەند کەسێکی فرە کەمم لەوانە دەناسییەوە کە کاتی خۆی لە زانکۆ دا پێیان ئاشنا ببووم". زۆربەی زۆری ئەوانە هاوتەمەنی سیفتسی بوون، بەشێکیشیان بەتەمەنتر دەیاننوانو تازە بەتازە لە زیندانێ دا قوتار ببوون. هیچ کە لەوانەیش نەیان دەزانی لە کەنگێوە لەوێن. هەندێك لەوانە وا دانرابوو کە پێویستە بنێرێنەوە تا لەنێو شارە جیاوازەکانی تورکیا دا کار بۆ پەکەکە بکەن . لەکاتێك بەشێکیشیان ساز درابوون تا بیاننێرنە بەرەکانی جەنگی پەکەکەوە. هەموو ئەوانەپێداگرییان دەکر دو گەرەکیان بوو ببنە گەریلایەکی چەکدار. سیفتسی درێژەی ڕوونکردنەوەکانی دا دەیگووت: "تەنانەت دەبوو کەسێك بیویستایە شتێکی دیکە بکات، نوتقی لێوە نە دەهات، هەمووان بە جۆرێك لە جۆرەکان گەرەکیان بوو گوێڕایەڵیو ئازایەتی خۆیان نومایان بکەن". لەوێندەر ژنو پیاو جودا کرابوونەوە بۆ ژوورە جیاوازەکانی ئاپارتمانەکە، وەلێ گشت سوبحانێ هەمووان گرد دەکرانەوە تا لەوێندەر مێژووی پەکەکەو ڕاڤەکانی ئۆجەلان بخوێننەوەو مشتومڕ لەبارەی هەڵە پەڵەکانی چالاکی پەکەکە بکەن.

ئۆجەلان لەڕاڤەکانی دا بەتەواوەتی بەیانگەلێکی دەرچوواندبوو کە کۆنترۆڵی هەمووکایەکانی ژیانی کۆمەڵگەی سوننەتی کور دی کر دبوو. ئەو لەهەموو بوارەکان قسەی هەبوون بۆ وتنو ڕەخنەی لە نەزمی ڕێبەرایەتی دەگر تو لە زۆرێك لە بوارەکان دا ستایشی ڕێو شوێنەکانی خۆی دەکرد کە بۆ خەباتو چالاکیی گرتبوویە بەر. هەموو

ئەو وتارو وتانەی ئۆجەلان یان تایپکرابوون‌و بەشێوەی کتێب وەشانکرابوون یاخۆ وەك کاسێت‌و نەوار تۆمارکرابوون‌و نێر درابوون بۆ نوسینگەو ناوەندەکانی پەکەکە بۆ مەبەستی راهێنان‌و بواری پەروەردەی حزبی وەك سەرچاوە بەکار دەهاتن.

هەروەها سیفتسی دەیگوت: "پێموابوو مەشق‌و مەرامی پەکەکە فرە ترسناك بوو. ئۆجەلان بۆخۆی سوێندی دەخوارد لەسەر وتارەکانی. ئەو لە فەرمانەکانی دا گەلێ جار توندو تیژ بوو، لەبەر ئەوە تاڕا دەیەك هەست‌و هێزی نائومێدی رووپلێنابووم".

لەراستی دا تۆ پێویستە دەستبکەیت بە پرس‌و جۆ، گەر بتەوێ شوێنی دروست بدۆزیتەوە. وەلێ بە دلّنیاییەوە تۆ بۆت نەبووئەمە بلّێیت. ئەم هەولّو هەرەکەتە هزرییە مانای ئەوە نەبوو تۆ گەرەکتە را دەستی تورکیا یاخۆ وەگەرێیتەوە ولاّتێ. ئەوە شتێك نەبوو کە تۆ بیری لەبارەوە بکەیتەوە. هەرکاتێك دووچاری شکست‌و نامۆیی دەبووین، ئیدی هەمووان پەنامان دەبردە بەر کتێبەکانی مارکسیزم‌و کەسێك توخنی شرۆڤەو شیکارەکانی ئۆ جەلان نەدەکەوت.

سیفتسی لەهاوینێکی گەرم‌و بۆقدار دا لە ئەسینا دا ژیانی بەسەر دەبرد. ئەو دەم جار جار پیاوەکان روویان دەکردە کەناراوەکانی ئەسینا، وەلێ ئەمان بەشێوەیەکی گشتی لە ئاپارتمانە شلۆغ‌و شڕەکەیاندا دەمانەوە. پاشنیوەڕوانان وەختی یۆنانییەکان بۆ قوتاربوون لەگەرمای هاوینێ لە وەنەوزو خەودا بوون، ئەمان دەبوو لەبەر گەرمادا مەشق‌و راهێنان بکەن، تا لەو رێگەیەوە بتوانن پیس‌و پاکی ئەندامان‌و سەلیقەو سیمای راستگۆیی وانیان بۆ دەربکەوێت.

دووا نیوەڕۆیەك سیفتسی بەمەبەستی تەلەفۆنکردن بۆ برایەکی لە تورکیا دا چووە نێو وێستگەیەکی گشتیی تەلەفۆنەوە. سیفتسی وەختێ لەتورکیا دا هەلّهاتبوو کەسێك نەیزانیبوو، ئەو وای بەباشتر زانیبوو خێزانەکەیشی شتێك لەبارەی پلانەکەیەوە نەزانن، چوون پۆلیس لەبارەی ئەوەوە لەخانەوا دەکەیانی دەپرسییەوە. هەر بۆیە ئەویش وای گەیاندە براکەی کە لە ولاّتی ئینگلیز دایەو نیازییە زمانی ئینگلیزی بخوێنێت. ئەو بەشێوەیەك رەوشەکەی گەیاندە براکەی کە بۆ بەسەربر دنی هۆڵی دەی روویکردووەتە

یۆنان‌و بۆی نالوێت بگەڕێتەوە. ئەوەیش بۆ ئەوە بوو تا نەپرسن ئەدی بۆ لە سکوڵەکەی دا نییەو لە گەشت‌و سەفا دایە.

سیفتسی پێی وابوو ئەوە شێوازێکی مەشقە سیاسییەکەیشی بوو کە دەستی دابوویە. ئەو راستە بەشتانێك نامۆبوو، وەلێ دوواجار پێی وابوو هەموو شتەکان بە تێپەڕبوونی کات، ئاسایی دەبنەوە، ئەو هەمیشە لە ئەستەمبوڵەوە درێژەی دابوو بە بیرکر دنەوەکانی. دووا جار نیازی راستەقینەی ئەو لەهەموو رەوشەکان دا خۆی لەوەدا دەبینییەوە کە ئەو پێویستە بگەڕێتەوە بۆ زێدو خاکی خۆیی‌و ببێتە گەریلایەکی جەنگخواز لە چیاکان دا. بەردەوام ئەندامانی نوێ پێوەندییان دەکرد بەپەکەکەوەو ئەندامەکۆنەکانیش رێگەیان بۆ وان چۆڵ دەکردو دەچوون بەشوێن مەهامی تری پەکەکە دا. دوان لەوان پاش هەموو ئەو قۆناغە بڕیاریاندا پێوەندی نەکەن بەپەکەکەوە، بەڵکو نێر درانە کەمپی پەنابەرانی لافریۆن تا لەوێ داوای مافی پەنابەرێتی بکەن.

تەقریبەن پاش پێنج مانگ لە ئەسینا دا، ئیدی سیفتسیش نۆرەی هات‌و پێی گوترا کە نیازیان هەیە بینێرن بۆ سوریاو ئامادەی کەن بۆ بەرەکانی جەنگ. ئیتر ئەو نێردرا بۆ کەمپی بیقاع تا لەوێ دا ئاما دەبکرێت بۆ مەشق‌و مەرامی سەربازیی پەکەکە. لەوێ سیفتسی چاوی کەوت بەئەندامانی پەکەکەو ئیدی برایە یەکە سەربازییەکانی پەکەکەوە کە پێشتر لەوێ دەستیان دابوویە ئەجێنداو ئەزموونی سەربازییان. رۆژانی دوواتر نۆجەلان لەرێی تەلەفۆنەوە خۆشهاتی لێکردو پێی راگەیاند کە بەزوویی کارەکانی تەواو دەکات‌و سەر لە ئەندامە نوێکانی پەکەکە دەدات لە کەمپی حلوە دا.

دووا نیوەرۆیەك سیفتسی لەتەك ئەندامگەلێکی دیکەی پەکەکە دا پاسێکیان بەکرێ گرت تا بیانباتە دۆڵی بیقاع، ئەو شیوەی کە لەلایەن سوریاوە لەو دەمە دا کۆنترۆڵکرابوو. ئەوان بە دووی یەکێکەوە بوون تا بیانباتە سەربازگەی مەحسوم قۆرقمز، کە ئەو دەم ناسرابوو بە کەمپی حلوە. چالاکییەکانی پەکەکە ئەوێ دەم لە دۆڵی بیقاع دا فرە بەرەو هەڵکشان‌و فراوانبوون دەچوون. چالاکییەکان لەوکاتەدا تەنها هان دەرو هیوا پێ دەری کوردانی تورکییە بوون، تا زیاتر بازنەی هێرشەکانیان فراوانبکەن بۆ سەر

ئەرتەش و ئامانجی دەوڵەتی تورکیا. ئەویّ دەم هاولاّتیانی مەدەنی تورەو توند بوون لەبەرامبەر هێرشە سەختگیرو مامەڵە مۆرو بیّ مۆراڵەکانی سوپاوە. هەربۆیە نەبوونی بە دیلێك بۆ دیٚموکراسییەت و دنیابینی ئازادیی لەولاّت دا، وایکرد تا هاولاّتیان بەلێشاو روویان لەیاخیبووان و دژە دەوڵەتییەکان دەنا.

کاتێك سیفتسی گەشتە ئەویّ، دروست پایزی ۱۹۹۰ بوو. کەمپی حلوە نێزیکەی ۳۰۰ ئەندامی نوێی لەخۆگرتبوو. سەدانی تر لە بارەگا سنوورییەکانی نێوان ئێراق و تورکییە دا مۆڵ درابوون. کور دانی سوریەو تەنانەت کوردانی ئێراقیش کە پارتە سیاسییەکانی خۆیان لەباکوری ئێراق دا هێشتا نەنەویبوونە چالاکیی و چاپوکی دژ بەرژێمەکەیان، بەر دەوام لەپێوەندیکردندا بوون بۆ نێو ریزی گەریلاکان. لەهەمانکات دا هەندێك لەوانەی کە بەفەرماندەی بالاّی پەکەکە ناسرابوون ئەوکات هاتبوونە کەمپەکان تا ئامادەکاریی بکەن بۆ چوارەمین کۆنگرەی مانگی یازدە.

سیفتسی دەیوت: "ئەوکات ژینگەیەکی تەواو وروژێنەر هەموومانی گرتبوویە خۆ". سیفتسی ئەوکات وێنە چکۆلانەکەی مەحسوم قرقمازی هەر لەلای خۆ پاراستبوو. مەحسوم فەرماندەی سەربازیی پەکەکە ساڵە ١٩٨٦ لەژوورەکەی خۆی دا لە ئاپارتمانی کلن، لەلایەن کەمینی تورکەکانەوە کوژرا. سیفتسی باس دەکات کە هەموو کەس بەرگی سەربازی کوردیی لەبەرابوو، هەمووان دارای چەك بوون و ئالاّی رەنگاورەنگی کورد هەڵکرابوو، هاوکات هەست و هێزێکی وروژاوی نەتەوەیی لەناخ دا جۆشی دەدا. پرۆگرامەکانی راهێنان لە حلوە هەمان پرۆگرامەکانی ئەسینا بوون، تەنیّ جیاوازی ئەوە بوو کە ئەندامە نوێیەکان لەگرە مەشقی سەربازیشیان پێدەکرا.

سیفتسی دەیوت: "هەمووان وا بیریان دەکردەوە کە خولی راهێنانەکان بێزارکەر بوون، چوون هەمووان خولیای ئەوە لە سەریاندا بوو بەزوویی بچنە شاخەکان و ببنە گەریلا".

ئۆجەلان وەك ئەوەی بەڵێنی پێدابوون، چووە نێو کەمپەکان تا لەنێزیکەوە قسە لەتەك ئەندامە نوێیەکان بکات. ئۆجەلان لەوێندەر پرسیاری لەبارەی شوێن و زێدی

ئەندامان کردو باسی لەرەوشی ئەکادیمیاکەکرد، هاوکات وانەو وتاری بۆ وتنەوە لەبارەی مێژووی پەکەکەو قەسدی خەباتی چەکداریو گەریلایی. ئەو زۆرجار لە وتەکانیدا ئاماژەی بە شەمدین سکیك دەکرد، ئەو فەرماندەیەکی تاڕادەیەك ناسراوی پەکەکە بوو، ئۆجەلان باسی لە هەڵەو پەڵەو تۆمەتەکانی سەر شانی ئەو بەرپرسەی، زوو زوو دەهێنایە گۆڕێ. سیفتسی دەڵێ:"جارێك پرسیم لەبەرپرسی بەشەکەم کە جەمیل بایك بوو، بۆچی ئەوانەی زۆرتاوانبارو خراپ بوون، چۆن هاتوونەتە ناو پەکەکەوەو ئاوا رۆشتوون، ئەدی بۆ ئۆجەلان خەریکە ئەم قسانە دەکات. ئەویش لەوەڵامدا گوتی تێناگەم، چوون هەمیشە لەبەرامبەر پرسیارەکاندا ئەوان بە تێناگەین وەڵامیان دەدایەوە".

سیفتسیو ئەندامە نوێیەکانی تر هەمیشە وتارو وتەکانی ئۆجەلان فرە سەرنجی رانەدەکێشان.

لەدەوروبەری مانگی چواری ١٩٩١ سیفتسی فەرمانی پێکرا پێوەندی بەیەکەیەکی سەربازی بکات، بۆ ئەنجامدانی چالاکییەك لە دیاربەکردا. هاوکات سەربازانی سوریا، هەرچەند کە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد بەبێ فەرمانی فەرماندەکەیان هاتوون، نێزیکەی شەست ئەندامی پەکەکەیان رێنوێنی کردن بۆ دیمەشق. لەوێوە سیفتسیو ئەوانی دیکە دابەشکران بۆ چەندین گروپی ٤ بۆ ٥ کەسیی، ئیدی هەموو ئەوانە بە پاس برانە قامیشلۆی نێزیك بەسنووری تورکییەو لەوێشەوە چوونە گوندێکی گچکەی سەرسنووری ئێراق. ئەوان لەوێ هەموویان چەکیان وەرگرتو بەرگی هاوشێوەی گەریلایان پۆشیی. پلانی ئەوان خۆی لەوەدا دەبینییەوە کە لەڕێگەی بەلەمگەلێکی کاتییو لەتەختەو گوریس دروستکراو لە رووباری دیجلەدا بپەڕێنەوە دیوی ئێراق.

لەوەختی پەڕینەوەی گروپەکەی سیفتسیدا، دەبوو پاسەوانەکانی سنوری سورییە دڵنیا نەبووبن، ئەو چەکدارانە کێن، چونکە گروپەکەیان دابوویە بەر دەسترێژی گوللەو ئەوانیش ناچار بەپاشەکشەکرابوون. پاش هەفتەیەك دیسان هەوڵی پەڕینەوەیان دایەوە بەرەو ئێراقو ئیدی ئەمجارە سەرکەوتووبوون لە پلانەکەیاندا. ئەوان پاش مانەوەیەکی کورت لە کەمپی هەفتانینی پەکەکە لەنێزیك زاخۆدا مانەوە، دوواتر گەشتەکەیان بەرەو

خۆرئاوای شاری دیاربەکر دەستپێکرد. سیفتسی دەیگێڕێتەوە کە چۆن خەڵکی لەنێو سنووری تورکییەدا دۆستانە مامەڵەیان لەتەك کردوون. هاوکات دێهاتییەکانیش چۆن لەنێوخۆیاندا کردوویانەتە مقۆمقۆو چۆن گەریلاکانیان پەلگرتوون بۆنێو ماڵو خانەوادەی خۆیانو نانو ئاویان پێداون. سیفتسی لەم بارەیەوە دەیوت: "لەماوەی ساڵێك کە پێوەندیم بەپەکەکەوە کردبوو، بەتەواوی مەعنەویاتو رۆحییەی شۆڕشگێڕیم داتەپیبوو، چوون شتانێکم لەنێو پەکەکەدا دیو وتەکانی ئۆجەلانیش بۆمن قایل کەر نەبوون، هەموو ئەو سەر راوەشاندنانەی ئۆجەلان لەژێر باری قورسی یادەوەریدا دەیسوڕاند بۆمن هەزم نەدەکرا. وەلێ پاش مانەوەی ۳ مانگم لەدیاربەکردا، ئیدی بۆم دەرکەوت لەسەر رێیەکی راستمو لەهەموو روانینە پەشیمان ئامێزەکانم پەشیمان بوومەوەو زانیم بڕیارێکی دروستم داوە کە بوومەتە پەکەکە".

ئەو تەنها کەسێك نەبوو کە بەم جۆرە بڕیدەکردەوە. هەمان ساڵ کە گەڕایەوە نێو تورکیا، هەر لەو ساڵەدا هەزاران ژنو پیاوی کورد پشتیوانیو هاوسۆزی خۆیان بۆ گروپەکە دوپاتکردەوەو پەکەکەیان وەك هێزێکی جەماوەریی تێکەڵ بە خەڵکی کورد ناساند. هۆکارێکی ئەم سەرکەوتنو سەردەستەیەی پەکەکە وەك رێکخستنێکی چەکداریی نهێنی، دەگەڕایەوە بۆ جەنگی بێئامانی گەریلایی کە پەکەکە دەستی لێدابوو. هەر ئەمەیش بوو ئەوینو ئارەزووی خەڵکی بۆ رێزگرتن لەو تەڤگەرە بەدەستهێنا. هۆکارێکی تری ئەم هەستانە جەماوەرییە پەنابردنی گروپەکە بوو بۆ چالاکی یاساییو ناتوندوتیژ، ئەمەیش ئامانجێکی بالآتری لە ئەرێنی بوونی جەنگ لێدەخوێنرایەوە. هەر بۆیە لە ماوەی سێ ساڵی ئایندەدا پەکەکە توانی رامیاریی یاساییانەی کوردو روداو گەلێکی کەلتوریو فەرهەنگیو چەندین بلأوکراوەو چاپەمەنی بهێنێتە نێو مشتی رامیارییەکانی. ئەم رێبازەیش پشتیوانیو دەنگۆیەکی بەرینی بەخشییە بنکەی جەماوەری پەکەکەو هەیمەنەی پەکەکەی بەسەر بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لەتورکیادا کردە ئەمری واقیع. ئەم هەیمەنەو هێمای هێزەی پەکەکە وای لە ئۆجەلان کرد کە سەربکێشێت بۆ کۆمەڵێك خواستی کۆنکرێتی لە دەوڵەتی تورکیا.

قۆناغی ساڵانی ۱۹۹۱ تا ۱۹۹۳ قۆناغێکی سەخت‌و دژوار بوو، هەم لەلایەن یەکەکەوەو هەمیش لەلایەن میرییەوە. ئەم ماوەیە سەرکەوتن‌و نوشستی لەخۆیدا شوێنکردبوویەوە. دوواجار کاریگەرییەکانیشی لەسەر چالاکیی نەتەوەیی کورد درێژە پێدا تا ساڵی ۲۰۰٦و قۆناغەکانی دوواتریش.

**پێوەندیکردن بە پارتەکەوە**

یەکێك لە تۆمەتەکانی سەر موحەمەد سینەر کە بووە هۆی غافڵکوژکردنی لەلایەن گروپەکەیەوە، لەوەوە سەرچاوەی گرت کە دەنگی ناڕەزایی دژ بە عەبدولا ئۆجەلان‌و دەسەڵاتەکەی بەرزکردەوە. موحەمەد خواستی ئەوەی هەبوو ڕێبازی گەریلایی‌و پارتیزانی لە ئەجێندای کارەکانی حزبدا کاڵبکاتەوەو ئاڕاستەی پارتەکە بەرەو کایەکانی سیاسەت‌و دیپلۆماسییەت وەرگەڕێنێت. هەرچەند کە مەیل‌و مەغزی ئۆجەلان بەرەو کایەی سیاسەت دەخوراو پێشنیازی ئەوەی خستبووە روو کە بەڵێ ڕێگە گەلێك هەنە کە جیا لە خەبات‌و خەیاڵی چەك دۆزو درمەکانی نەتەوەی کورد دەرمان دەکەن. بەتایبەتی ئۆجەلان لای وابوو کە پارتێکی سیاسیی نوێ‌و یاسایی لەتورکیادا دەکرێت ڕۆڵی دانوسکارو دابینکەری ڕێگە چارەی ئاشتی بگێڕێت بۆ دۆزی کورد. بە بڕوای ئۆجەلان پارتی ناسراو بە (HEP) دەتوانێت ئەو ئەرکە لە ئەستۆ بگرێت. ئەو هەموو ئەو قسانەی پێش هەڵبژاردنی نەتەوەیی ۱۹۹۱ ڕاگەیاندو وتی : "دەیهەوێت دەرفەت بداتە ئەوان تا ڕێگە چارەی ئاشتی بدۆزنەوە".[173]

ئۆجەلان هیچ کات فرە بە پۆزەتیڤی لەبارەی HEP قسەو باسی نەکردبوو. ئەو هەرگیز بواری بۆ بوونی هێزو ڕێکخراوگەلێکی کوردی نەدەهێشتەوە تا لە دەرێی هەیمەنەو هێزی ویدا بوونیان هەبێت. ئۆجەلان هەمیشە هۆشداری دابوویە لایەنگرانی تا نەتلێن بەتەوژمی ئەوپارتە سیاسییە کوردیانەی نێوخۆی تورکیاوەو ئەوانیش هەمیشە

[173] Serxwebun, October 1991, 19.

گروپگەلێك بوون نارەزا بوون بە میتۆدی دژایەتی پەکەکە بۆ ئەزموونی کاریان. وەلێ ئۆجەلان لە کۆتایی ۱۹۹۰و دەستپێکی ۱۹۹۱ دا ئیدی جاروبار هەڵوێستی خۆی لەبارەی ئەزموونی کاری پارتە سیاسییو فەرمییەکان ئەرێییانە نیشاندەدا. مەحمود کیلینج کە دامەزرێنەری HEP پێی وابوو: "ئۆجەلان دەیگوت پارتەکەی ئەوان لەئێمە نییە، وەلێ گەر بتوانن دامەزراوەکانی تورك لە نەهجێکی دیموکراسیدا والێبکەن دۆزی رەوانی کورد ببینن‌و چارەی دۆزی کوردیان لابێت، ئەوا بەگەرمی پێشوزییان دەکەین‌و بوونی ئەوان لەناوچەکەدا وەك بوونی ئێمەیە"۱۷٤. تا ئەوکات ئەندامانی ئەو حزبە لەقەیرانی جەماوەرییبووندا بوون لە ناوچەکانی باشوری رۆژهەلاتی تورکیادا، چوونکە خەڵکی زیاتر سەروکلاَویان لەتەك پەکەکەدا بوو، وەلێ دوای بیروبۆچوونەکانی ئۆجەلان ئیدی لەپرێکداو بەحەشمەتەوە خەڵکی بوونە ئەندام‌و ئومێدی ئەوحزبە. لەراستیدا زۆربەی ئەوانە هاوسۆزو پشتیوانی پەکەکە بوون. ئەندامانی سەربەخۆی پارتەکە کاری یاسایی خۆیان‌و کاری نایاسایی‌و نهێنی پەکەکەیان وەك هەمان کارو وەك ئەجێندایەکی دوور مەودا دەبینییەوە بۆ ئامانجێکی هاوبەش. مەحمود دەیگوت: "وابیرمندەکردەوە کە ئێمە هەمومان کوردین". ئەو ئێستا لە ئەڵمانیادا ژیان بەرێدەکات، لەدیدارێکدا وتی: "ئێمە باوەرمان وابوو، کە پەکەکە دارای روانینێکە، کە لەهەندێك شتدا ئێمە پێی رازی نین یاخۆ ئێمە جیاواز بیردەکەینەوە، بەلاَم دوواجار پێمان وابوو گەلی کورد یەك ئامانجی هەیە، لەبەر ئەوەو لەو سۆنگەیەوە هیچ رێگرییەك‌و لارییەکمان نەبوو لە بوونی هاوسۆزانی پەکەکە لەناو پارتەکەماندا".

فرە سەخت بوو ئەم هاوکێشەیە بەمجۆرە بەردەوام رابگیرێت، ئەندامە نوێیەکانی ناو حزب پەکەکەیان وەك رێبەری بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد دەبینی، ئەوان باوەریان وابوو، بەرژەوەندی پەکەکە پێویستە لەپێشەوەی هەموو هەنگاوەکانی سیاسەتی حزبەکەوە پێشچاو بگیرێت، ئیدی با پارتەکە پارتێکی یاسایی‌و فەرمیش بێت. ئەم

---

174 Quoted in Olmez, DEP, 119.

روانینە فرە بە سەختی لەنێو ئەندامانی هاوسۆزی پەکەکەدا برەوی پێدەدرا و ئاوێتەی نەزمی سیاسی پارتەکە دەکرا. ئەمەیش دەرفەتی دایە ئۆجەلان تا بەتەواوی خواستو خەیاڵی خۆی لەنێو پارتەکەدا برەو پێبدات[175]. مەحمود بەدەم شانهەڵتەکاندنەوە دەیگوت : "بەڵێ حەشیمەتەکە لەژێر کاریگەریی پەکەکەدا بوون ئەویش دنیابینی خۆی لەنێوحزبدا بەسانایی شوێنکردبویەوە". ئۆجەلان رازی بەوەنەبوو پارتەکە پارتێکی سیاسی و سەربەخۆبێتو هەمیشە دەیویست هێزێك بێت بۆ پشتیوانیو سەرخەری جەنگەگەریلاییەکە. موحەمەد ئەمین سۆر یەکێك لەدیارترین کەسایەتییەکانی حزب دەیگوت: "ئۆجەلان نەیدەتوانی بڵێت لێرە پارتێکی سیاسیی هەیەو نەیدەویست بڵێت پارتێکی ئازادە، ئەو دەیەویست بڵێت کەسی تر نا، تەنها ئەو دەتوانێت هەموو شتێك لەمەڕ ئەو پارتە ئەنجامبدات".

ئۆجەلان بەزوویی ئەندامگەلێکی وەك نوێنەری خۆی دەستنیشانکرد تا لەنێوپارتەکەدا بەڕۆشنی و رەوانی ئەوە بدرکێنن گەرەکیانە چی لەنێوپارتە سیاسیە فەرمییەکەدا ئەنجامبدەن. هەندێك لەنوێنەرەکان ئەندامی خودی حزبەکە بوونو ئەوانی دیکەیش هەڵسوڕاوی دەرێی پەکەکە بوونو دەستنیشانکرابوون. ئەندام گەلێکی کەمی پەکەکە لەنێو حزبەکەکەدا هەرزوو پێگەو پەیوەندیو شوێنەکانی خۆیان قۆستەوە تا ببنە سەرچاوەی دارایی بۆ گردکردنەوەی پوڵو راپێچکردنی لاوگەلێکی نوێ بۆ ریزەکانی گەریلا. هەرچەند کە ئەندامانی سەربەخۆی نێوحزب ناکۆکییان لەگەڵ ئەم جموجوڵەی ئەندامانی پەکەکە هەبوو، وەلێ ئاسان نەبوو بۆیان رێگە لەبەردەم ئەو تەوژمی کۆمەکو پشتیوانییەی پەکەکە بگرن.

روانینی پەکەکە بۆ دەستبەسەرا گرتنی حزبەکە بریتی بوو لەوەی کە لێیەوە سەرچاوەیەکی مرۆییو مادی بەدەستبخاو پێوەندیی راستەوخۆی بە نێوخۆی تورکیاوە وەمێنێت. موراد دەغدل کە یەکێك بوو لەبەرپرسە باڵاکانی حزبو هاوکات یەکێکیش بوو

---

[175] See the analysis provided in Barkey and Fuller, Turkey's Kurdish, 88–89.

له نوێنه‌رانی ئۆجه‌لان، پێی وابوو كه‌ حزبه‌كه‌ نه‌یده‌توانی خۆی رێكبخات. هاوكات گه‌وره‌ترین خاڵی لاوازی حزبه‌كه‌یش له‌وه‌دا بوو كه‌ نه‌یده‌توانی له‌ناو رێكخراوه‌كه‌ی خۆیدا گه‌شونما بكات. له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌یشدا هه‌ڵه‌یه‌ واتێبگه‌ین كه‌ حزبه‌كه‌ به‌ره‌یه‌كی په‌كه‌كه‌ بوو له‌نێو توركیا دا هه‌ڵده‌سوڕا. چوون ئاره‌زووكردن بۆ كۆنترۆڵی شتێك مانای كۆنترۆڵكردنی هه‌موو ئه‌و شته‌ نییه‌. راسته‌ په‌كه‌كه‌ كاری ده‌كرد بۆ كۆنترۆڵكردنی حزبه‌كه‌، وه‌ڵێ ئه‌مه‌ ئه‌وه‌ ناگه‌یه‌نێت كه‌ ته‌واوی به‌رپرسو رێبه‌ره‌كانی پارته‌كه‌ خۆیان راده‌ستی ئیراده‌و ئیسراری په‌كه‌كه‌ كردبێتو به‌شداربووبن له‌ ئه‌جێندای په‌كه‌كه‌دا.

كیلینج كه‌ خۆی به‌ ئه‌ندامێكی به‌رایی و سه‌ربه‌خۆی پارته‌كه‌ ده‌زانی پێی وابوو:"ئاماده‌یی هه‌وادارانی په‌كه‌كه‌ له‌ناو پارته‌كه‌دا فره‌ به‌رینو به‌ربڵاوبوو، وه‌ڵێ له‌ زه‌مینه‌ی میتۆدی سیاسیو چالاكیی سیاسیدا به‌تایبه‌ت له‌سالآنی سه‌ره‌تای دروستبوونیدا په‌كه‌كه‌ فره‌ رۆڵی نه‌بوو. له‌راستیدا گردبوونه‌وه‌ هه‌بوو، ئاپۆچییه‌كانیش دروشمیان ده‌وته‌وه‌، ئه‌وه‌ راستییه‌ك بوو، وه‌ڵێ حزبه‌كه‌ی ئێمه‌یش بزووتنه‌وه‌یه‌كی كوردیی بوو. هه‌ر بۆیه‌ پێشبینیكراو بوو ئه‌م تێكه‌ڵكارییه‌ له‌ هه‌ستو سۆزی نه‌ته‌وه‌ییدا بێته‌ گۆڕێ".

به‌مجۆره‌ حزبه‌ نوێیه‌كه‌ رێبازێكی نوێی له‌ گه‌یاندنی خواستو خولیاكانی خه‌ڵكیی له‌ زه‌مینه‌ی سیاسیدا هێنایه‌ گۆڕێ. ئیدی دۆزی كورد له‌ رێگه‌و رێبازێكی سیاسیو ناتوندوتیژه‌وه‌ بره‌وی پێده‌دراو به‌ره‌و پێشه‌وه‌ ده‌برا. تا ئه‌وكات توركه‌كان كه‌ وه‌ك ره‌گێكی پێوه‌ندیدار به‌ تێرۆریزمه‌وه‌ مامه‌ڵه‌یان له‌گه‌ڵ دۆزی كورد ده‌كرد، له‌پڕ رووبه‌ڕووی خواستگه‌لێكی یاسایيو سیاسی بوونه‌وه‌و ناچاركران بهێنرێنه‌ نێو مه‌یدانی گفتوگۆو گیانی دانوستانه‌وه‌.

موراد ده‌یگوت:"كه‌سێك له‌ شارۆچكه‌یه‌كی سه‌ر ده‌ریای ره‌ش، ده‌بێت چی زانیبێت له‌باره‌ی په‌كه‌كه‌وه‌، ئه‌و ئه‌وانی وه‌ك پێڕو په‌یڕه‌وێكی چه‌په‌و چیایی ده‌زانی". موراد له‌ ئێستادا بابه‌تگه‌لێك بۆ وێب سایته‌ كوردییه‌كان ده‌نوسێت. موراد له‌ درێژه‌ی بۆچوونه‌كانیدا ده‌یگوت : "له‌گه‌ڵ دروستبوونیHEPئیدی خه‌ڵكی ئاشنابوون به‌وه‌ی

پەکەکە کوردن‌و ناچار کران بەوەی شتانێکیان لەمەڕ دۆزو دیمەنی سیاسی کوردستان گوێلێبێت".

بەمجۆرە بڕیارو برەوی ئۆجەلان بۆ نێوەندگیرییەك لە پەرژانە سەر چالاکی سیاسیی، بەبێ وازهێنان لە خەباتی چەکداری بڕیارێکی دروست بوو بۆ پەکەکە. ئەوە یارمەتی پەکەکەیدا تا لەنێو جەماوەردا وەك بزووتنەوەیەك بتەنرێتەوەو رۆبچێت بەنێو تەرزە جیاوازەکانی کۆمەڵگەدا. هاوکات رێگەی بۆ گروپە شۆڕشگێڕەکە کردەوە تا زیاتر دەستیان رابگات بە تۆڕەکانی کۆمەڵگەو توانیان لە رێگەی یاساییەوە هاندان‌و هێما سیاسییەکانیان بگەیەنن. لەگەڵ ئەوەیشدا رێگەیەك بوو بۆ ئەو گروپە نوێیەی کە یان بۆی نەدەلوا یاخود نەیدەویست لە شاخەکاندا درێژە بەخەباتی شۆڕشگێڕیی خۆی بدات. ئیدی هەموو ئەو خەڵکانەی کە زیاتر سەرو کلاویان لەگەڵ خەباتی سیاسی‌و پارتایەتی فەرمیدا دەهاتەوە لەبازنەی پەکەکەدا شوێنیان بوویەوەو دانەبران لە بزووتنەوەکە.

بەمجۆرە ئەم حزبە و لێشاوی ئەندامانی هەواداری پەکەکە بۆ نێو ریزەکانیی ئەو راستیەی سەلماند کە پەکەکە لە رووداوە سیاسییەکانی نێو گۆڕەپانی تورکیە ناتوانرێت پەراوێز بخرێت.

وەلێ ئەوە رۆشن نەبوو کە ئایا ئەم رەوشە لەبەرژەوەندی سیاسەتی کوردا یە یان نا. لەنەوەدەکاندا کایەی سیاسیی بۆ چالاکوانان‌و چالاکیی سیاسیی کورد بەرفراوان بوو. هەموو چالاکوانان لەلایەن ئۆجەلانەوە راستەخۆ دیاریکرابوون تا بە خواست‌و خەمی پەکەکە هەڵسوڕێن. بەتێپەڕبوونی کات نەوەیەك هاتنە پێش شانبەشانی حەزو خولیای پەکەکەو لەو زەمینە سیاسییەدا خۆیانگرت‌و ئەزموونیان وەرگرت.

### قۆناغی نوێ

رژێمی سیاسی تورکیا هەرگیز گەشبینی‌و گیانی تەبایی لەمەڕ مامەڵەکردن بۆ دۆزی کورد لەهەگبەیدا نەبوو. وەلێ لەکۆتایی ساڵی ١٩٩١دا بەناچاریی مل بەرژێم دادا تا

سەرنجی جددی بداتە رەوشەکە[١٧٦]. سەرۆکی پارتی نیشتیمانی دایك، مەسعود یەلماز پێگەو پێناوی خۆی برەوپێدا و خواستی هەڵبژاردنی پێشوەختی کرد بۆ ئەیلولی ١٩٩١. وەلێ هەوڵەکانیان بەپێچەوانەوە شکایەوە. چوون تاڕادەیەك تێکرای خەڵکی تورك کەیفخۆش نەبوون بە بڕیارو بیانووی پارتەکە بۆ پشتیوانی ئەمەریکا لەجەنگی کەنداو و پاشەکشەی هێزەکانی سەدام لە داگیرکردنی کوەیتدا.

تورکەکان شتێکی دیاریکراو و ئەوتۆی وایان پێنەبوو بۆ ئەم پرسە، چوون گەمارۆ ئابوورییەکانی دژ بە عێراق کۆتاییان هێنا بە تێچوونو هەزینەی تورکیا، کە هاوبەشێکی بازرگانی سەرەکیی بوو لە ملیۆنان دۆلار دا. هاوکات سنووردانان بۆ هێزەکانی ئێراق لەباکووری ئێراقدا، هۆیەك بوو بۆ فراوان بوونو گەشەی بنکەو بارەگاکانی پەکەکە لەو سنوورانەدا. بەمچەشنە ناڕۆشنی رامیاریی تورکیا لەمەڕ پشتیوانی ئەنکەرە بۆ هێرشی سەربازی ئەمریکا بۆ ئێراق، مایەی هەڵتۆقینی گرفتگەلێکی ئابووری بوون بۆ وڵاتەکەو هاوکات هۆیەك بوون تا پارتی نیشتیمانی دایك پلەی دووەم لە ئاکامی هەڵبژاردنەکاندا بگرێتو دوواجار پارتی رێگەی راست پلەی یەکەمی هەڵبژاردنەکانی بەدەستهێنا. سولەیمان دیمیریلی رێبەری پارتەکە، سەربازێکی بەئەزموونو رێبەرێکی سیاسی دیاربوو، ئەو سەرۆك وەزیرانی پێشووی وڵات بوو، لەماوەکانی رابردوودا دوو کەڕەت لەلایەن کۆدەتا سەربازییەکانەوە دوورخرابوویەوە. دیمیریل بەهۆی ئەوەی هێند کورسی بەدەستنەهێنابوو تا بتوانێت بۆخۆی حکومەت پێکبهێنێت، ناچار لەگەڵ شۆسیال دێموکرات کە لە پلەی سێهەمی دەنگدانەکان بوون توانی حکومەت پێکبهێنێت. ئەوان رێبەرەکەیان ئەردالْ ئینۆنۆ، پرۆفیسۆرو ئوستازێکی بواری زانستی فیزیا بوو. بەمجۆرە پارتی رێگەی راست هاوبەشێکی نامۆو نارێکی بۆ کابینەکەی هەڵبژارد. چوون پارتی چەپی ناوەڕاست، لەگەڵخۆیدا ٢٢ نوێنەری لە پارتە سیاسییە کوردییەکە هانی بوو. لەبەرئەوەی هەردوو پارتەکە لەمیانی هەڵبژاردنەکاندا پێکەوە دابەزیبوون. چونکە پارتی

[176] This section benefited from Ahmad, Modern Turkey, 201 – 203; Olmez, DEP, 154–212; Kirisci and Winrow, Kurdish Question, 136–151.

کاری خەڵك HEP بەهۆکاری تەکنیکیی نەیتوانیبوو سەربەخۆ لەهەڵبژاردنەکـ بەشداری بکات، هەربۆیە سۆشیال دیموکراتەکان بۆ ئەوەی سەنگی خۆیان لەباشووری رۆژهەلاتی ولاتدا قورس رابگرن، هاوپەیمانییان لەگەڵدا بەستبوون. بەمجۆرە ئەو ٢٢ ئەندامە بەفەرمی ئەندامی شۆسیال دیموکراتەکان بوون. لەسەر ئەو بنەمایە دەسەلاتی پێکهێنراو ئەو ئەندامە کوردانەی لەخۆگرتبوون.

لەراستیدا هەندێك لەو ئەندامانە کوردی رادیکالْ بوون. دۆزی کورد تا ئەو کاتەی بەدەگمەن لە راپۆرتە هەواڵییەکانی تورکیادا بەرديدە دەکەوت. ئەوە نەدەشا رايەوە کە تەواوی ئەجێندای سەربازیو سیاسیی ولات کۆنترۆڵکرابوو.

پرۆژە بڕیارەکانی پەرلەمانی پێشوو بۆ هەڵگرتنی رێوشوێنە سەربازیی سەختگیرییەکان، ئامازەیەك بوون کە شتەکان ناکرێت وەك رابردوو درێژە بەردوتی کاریان بدرێت. هەرچەند تا ئەوکات کۆتو بەندی سەر زمانی کوردیو بەکارهێنانی کوردیی هەر وا مابوويەوە. وەلێ یادەوەری جەنگی پەکەکەو پرسی خواستی ئاشتیی شتێك نەبوو هەروا لەپێشچاو نەگیرێت. هەربۆیە هەریەك لە پارتی رێگەی راستو سۆشیال دیموکراتەکان پرسی بەدامەزراوەکردنی ریفۆرمە دیموکراسییەکانیان بەهەـ وەرگرتبوو، کە لەنێو ئەو چوارچێوەیەدا پرسی چارەسەریی دۆزی کوردیش سەرەداوەکانی دەبینران. هەرچەند کە لە پرۆتۆکۆڵی میریدا هیچ ئامازەیەك بەنیوی کوردان نەکرابوو، وەلێ ئەوە خرابوويە روو کە خەڵکی نێو تورکیا مافی پێرەوییان هەیە لە فەرهەنگو کلتورە جیاوازەکانیان.

یەکێك لە رۆژنامە تورکییەکان ئەوەی نەشاردەوە کە هەوەڵ رامانی دەوڵەت لەسەر باشووری رۆژهەلاتی تورکیا دەبێت[177]. دیارە کە ئەمەیش ئەوەی لێدەخوێنرايەوە کە بەراستی گرفتێك لە گۆڕێدا هەیە.

---

[177] Milliyet, Nov. 18, 1991.

پاش راگەیاندنی حکومەت، هەریەك لەسەرۆك وەزیران سولەیمان دیمیریل‌و جێگرەکەی ئەردالْ ئینۆنۆ، بە گەشبینییەوە ئاراستەی کارنامەیان رووکردە باشووری رۆژهەلاتو لەو پێناوەدا شادومانی خۆیان بۆ خەلکی ئەویْ دەربڕی‌و وەك براکانیان ئاماژەیان پێدەدان[178]. ئەردالْ کە بەشێوەیەکی راستەوخۆ پەرژابوویە سەر دۆزی کوردان، ئەو سالێك پێشتر بەلێنی گۆڕانکاریی دابوو لە نێوچەکەدا. هەربۆیە بیْ پەردە بە خەلکەکەی رادەگەیاند: "نایەهویْ بترسن، هەرگرفتێکتان هەبوو، پێم رابگەیەنن"[179].

لەراستیدا گرفتەکانی نێوچەکە پەنهان‌و شاراوە نەبوون. ئەشکەنجەو ئازار بەربلاو بوو، بەتایبەتی هەموو ئەو خەلکانەی بەتۆمەتی تێوەگلان لە پەکەکە دەستبەسەرکرابوون لە رەنج‌و رەزالەتدا بوون. هێزەکانی ئاسایشی تورکیا بەربوونە گیانی هاولاتیان‌و هەڕەشەی سوتاندنی خانوو بەرەی ئەو کەسانەیان دەکرد کە ئامادە نین بێنە نێو ریزەکانی گوندپارێزەکانەوە. هەموو ئەو کوردانەی کە گەرەکیان بوو ناڕەزایی لەبارەی هەل‌و مەرجی ژیانەوە دەرببڕن، راستەو خۆ تۆمەتباردەکران بە کارکردن لەگەلْ نەیارانی دەولەتو پەکەکەو قەدەغەکارییەکانی دەولەت لەهەمبەر زبان‌و رۆشنبیری‌و پەخشی رادیۆو تەلەفزیۆنی کوردیی بەردەوام لەکارا بوو. بەردەوام یاسای دژە تێرۆر بەشێوەیەکی ئامانجدار بۆ دەردیی سەرو قۆلْبەستی هەموو نوسەرو رۆژنامەنوسان کەلکی لێوەردەگیرا، یاخود ئەوانەی وتەبێژی خەلکبوون‌و گەرەکیان بوو سەرنج بدەنە مێژووی کوردو گازاندەی بارودۆخەکەیان دەکرد دروست بەو یاسایە بەئامانج دەگیران.

لەراستیدا ٢٢ ئەندامە کوردەکەی نێو پەرلەمان(ئەندامانی کوردی تر لە پەرلەماندا هەبوون، وەلیْ ئەو ٢٢ ئەندامە سەر بە پارتی کاری خەلْك بوون کە پارتێکی فەرمی‌و سیاسیی کوردیی بوو) لیستێکیان ئامادەکردبوو لەبارەی ئەوەی پێویستە چی بۆ کورد بکرێت، ئەوە پێش رازیبوونیان بە بەشداریکردن لە پێکهێنانی هاوپەیمانییەتییەکە

---

[178] Milliyet, Dec. 9, 1991.
[179] Milliyet, Dec. 9, 1991.

واژۆیان کردبوو. ئەوان لەو داواکارییانەدا پێویستیی ناسینی کورد یان وەك کورد ئاماژە پێدابوو. هاوکات زمان‌و فەرهەنگ‌و بۆنە کوردییەکان پێویست بوو هیچ رێگرییەکی لەپێشدا نەبێت‌و ئازادی قسەکردن‌و نوسین بۆ هەمووان فراهەمبێت[180].

مەحمود کیلینچ دەیوت:"ئامانجمان ئەوە بوو تورکیا دان بەمافە دێموکراتییەکانی کوردا بنێت‌و گۆڕان لەیاساکاندا بکات‌و دەستبداتە چارەسەری دۆزی کوردان". لەرۆژی سوێندخواردنی ئەندامانی پەرلەماندا تێکڕای ئەندامانی کورد دەستماڵێکی رەنگین بە سەوزو سور و زەرد لە گیرفانەکانیان هەڵگرتبوو، ئەوەیش هێمایەك بوو بۆ شوناسی کورد لە نێوچەکەداو لەهەمانکاتدا دروست رەنگەکانی ئەو ئاڵایە بوو کە پەکەکە بە چیاکاندا هەڵیکردبوو.

حەتیب دیکل لەمیانی سوێندخواردنی ئەندامانی نوێدا گوڵمەزێکی سازاندو پێی وابوو دەبێت لەخوێندنەوەی سوێنەکەدا بڵێت "هاورێیان من لەژێر فشاری دەستوری بنچینەیی وڵاتدا ئەمە دەخوێنمەوە"[181]. ئیدی کاردانەوەی ئەم مینگە مینگە هات‌و هاوارە ناڕەزایی ئەندامانی کوردی لێکەوتەوە بۆ ئەو چاولێنانەی کە لەپرەنسیپەکانی ئەتاتورکدا ئاماژەی پێدەکرێت لەمەڕ شوناس‌و هەبوونی کوردان. لەیلا زانا کەتەنها ژنی نێو گروپە کوردییەکە بوو، ئەوخانمە شان‌و شەوکەتێکی بەکارو قژێکی رەشی درێژی هەبوو، ئەو رووسەرییەکی سەوزو زەرودو سوری دابوو بەسەریداو دووا بەدووای سوێنەکەی هەمان ناڕەزایی دەربڕی‌و هیوای خواست تورك‌و کورد بتوانن پێکەوە کاری هاوبەش ئەنجامبدەن. ئەو لە قسەکانیدا وتی: "من ناچارکرام‌و بەتۆپزی سوێندم خوارد، دەنا من شەڕدەکەم لەپێناو پێکەوەژیانێکی برایانەدا بۆ تورك‌و کورد لەچوارچێوەی زەمینەیەکی دێموکراسیدا"[182].

---

[180] For complete list, see Olmez, DEP, 161.
[181] Milliyet, Nov. 8, 1991.
[182] The controversy over Zana's statement is matched only by the myriad of versions available of what she said. I relied on her own recollection — per" haps the most radical version—that appeared in Zana, Writings From Prison, 2.

هەندێك لە نوێنەرانی تورك هاواریانکرد بەسەر لەیلا زاناداو وتیان رووسەرییەکەی لەسەری لادا. هەندێکیتریان وەك پیشاندانی ناڕەزایی دەیانکێشا بەسەر مێزەکانداو داواکرا دەمودەست لەیلا زاناو دیکل لە نێو سۆشیال دیموکراتەکان دەربکرێن.

چەند رۆژێك پاش ئەو رووداوە دادگای ئاسایشی دەوڵەت رایگەیاند گەر ئەو دوو ئەندامە تۆمەتی خیانەت بە وڵاتیان لەمەڕ ئەو کردەیەی کە لەپەرلەماندا نواندیان بەسەردا ساغبێتەوە، ئەوا سزای لەسێدارەدانیان بەسەردا دەسەپێت. بەمجۆرە نوێنەرانی کورد نەکەوتنە بەر لێبوردن. دیکلی دەیگوت: "گەر ئێمە لەسێدارە بدرێین، لەبەر ئەوەیە کە داوای برایەتیمان کردووە"[١٨٣]. ئەو پێش ئەوەی لەسیاسەتەوە بگلێت ئەندازیارێك بوو، هەروەها سەرۆکی رایەڵەی مافی مرۆڤیش بوو لە دیاربەکر. ناوبراو لەمیانەی بانگەشەکانی هەڵبژاردندا فرە رادیکاڵو توند هاتە نێو پارتەکەیەوە. هەروەها داوای لەئەنکەرە کرد دەرگای وتوێژ لەگەڵ پەکەکەدا بکاتەوە. بەڵام نەیتوانی ئەو بۆچوونانەی کە جیاوازبوون لە بۆچوونی دەنگدەرەکانی دەرببڕێت.

ئۆرهان دۆغان دەیوت: "ئێمە گەرەکمانە ببینە دەنگی کورد لە پەرلەماندا". ناوبراو پارێزەرێکی نەرمو نیان بوو، چەند هەفتەیەکی کەم پێش هەڵبژاردنەکان ئەو راستییەی بۆمان درکاند. ئێمە لە ژووری دانیشتنەکەیدا قسەمانکرد. لەویٚ نێزیکەی ١٢ پیاو پێوەندییان پێوەیکردبوو، ناوبراو ئاماژەی بۆ رێکەوتن کرد لەسەر لێدوانو راسپاردەکانی. هەروەها گوتی: "تا ئێستا پەرلەمان هیچی بەهیچ نەکردووە، لەئێستادا بۆشاییەکی خاڵی هەیە (گەر کورد توانی دەنگ بهێنێت) هیوامان وایە ئەو بۆشاییە پڕ بکرێتەوە"[١٨٤].

دیاربوو کاتێك دێمیریلو ئینۆنۆ سەردانی هەرێمی کوردانیان کرد تا قسە لەبارەی گرفتەکانیان بکەن، پێشبینییان نەکردبوو هێند بێ پەردەو رەوان رووبەڕووی کوردان

[183] Milliyet, Nov. 22, 1991.
[184] Aliza Marcus, "Kurd Separatists Grip Southeastern Turkey," Christian Science Monitor, Oct. 13, 1991.

ببنەوە، هەر بۆیە ئەوان بەتوندیی داوایانکرد پێویستە لەیلا زاناو دیکل لە نێوپارتەکەیان دەربکرێن. هاوکات سولەیمان دێمیریل هەردووکیانی تۆمەتبار کرد بە برەودان بە پروپاگەندە بەرەو یاخیبوونو ئاژاوەگێڕیی.

ئەندامە نوێیەکان ئەوەیان دایە دوواوە کە داوای لێبووردن بکەن سەبارەت بەو هەڵسوکەوتەی کە لەپەرلەماندا نواندبوویان. لەیلا زانا لەم بارەیەوە وتی: "من لەنەبەردیدام لەپێناو بوونمدا، بەڵام ئێستا رووبەرووی رەوشێك بوومەتەوە کە دان بەبوونمدا نانێت". ئەو سوربوو لەسەر ئەوەو وتی: "لەبیرتانبێت، ئەوانەی منیان هەڵبژاردن کوردەکان بوون"[185].

## گرفتی نێو رەوتەکان

گرفتی نێو پەرلەمان ئاوێنەی پشێویو نائارامی نێوان کوردو تورك بوو لەسەرانسەری وڵاتدا.

لە ٢٤ی مانگی دوازدەدا هێزەکانی ئاسایش لەشارۆچکەی لیزی باشوری رۆژهەڵات بەفیشەك بەربوونە وێزەی ئەو هەزاران هاوڵاتییەی کە لەشەقامەکاندا گردببوونەوەو ماتڵی رێگەدان بوون بە ناشتنی ئەو سێ چەکدارەی پەکەکە کە لەشاخەکانی دەوروبەری کوژرابوون.

هەر لەوێدا حەوت هاوڵاتی مەدەنی کوژران. رۆژێك دوواتر هەوادارانی پەکەکە لە فرۆشگایەکی ئەستەمبوڵدا تەقینەوەیەکیان ئەنجامدا، ئەوێ شوێنی یەکێ لەبراکانی پارێزگاری هەرێمێکی تورکی بوو، ئەوەیش لەکاردانەوەی ئەو یاسا عورفییەی کە لەباشووری رۆژهەڵاتدا سەپابوو. لەئاکامی تەقینەوەکەدا ١٢ کەس کوژران. لەهەمان قۆناغدا، بەهۆی هێرشێکی گەریلاکان بۆ وێستگەیەکی جەندرمەکان بۆ دێهاتێکی سەر بەپارێزگای شرناخ، لەئاکامدا حەوت سەربازو سێ ئەفسەری تورك کوژران.

---

[185] Milliyet, Nov. 9, 1991.

سەرۆکی ئەرکانی گشتی تورکیا لەکاتی قسەکردن لەرێوڕەسمی ناشتنی دوو لەسەربازەکاندا کە بەدەستی پەکەکە کوژرابوون. بەڵێنی تۆڵەیەکی خوێناوی دا بەگوێی نەیارەکانیاندا. نوێنەری کورد مەحمود ئەلیناك وەك سەرۆکی گروپی پەرلەمانتارانی سۆشیال دیموکراتەکان لەهەوڵی چارەسەرکردنی ئەو تەنگژەو بارگرژییەدا بوو کە کوردو تورکی تێکەوتبوو. ئەو پاڕایەوە بۆ مردوانی هەردوولا، چ یاخی بووانی کوردو چ سەربازانی تورك‌و رایگەیاند هاوپەیمانییەکەیان لەگەڵ پارتی رێگای راست لەسەر بنەمای برایەتییە. تەنانەت تورکوت ئۆزالی سەرۆك ئاماژەی دابوو بە چارەسەریی ناتوندوتیژ و دوور لەهێزو هەیەجانی جەنگ بۆ دۆزی نەتەوەی کورد. بەڵام پێویستە ئەوە لە نوێنەرانی کورد قبوڵنەکرێت کە رووی ناسۆنالیزمی کوردی نومایان بکەن.

ئەورۆ ئەلینەك لەسەر پلاتفرمەکەی ئۆزالدا شکایەتی ئەوەدەکات و دەیوت: "ئەوەتا پەکەکە ئێستا لەپەرلەمانی تورکیادایە"[١٨٦]. لەراستیدا دانەدوواوەو ملنەدان بۆ سنگفراوانی لەهەمبەر کوردان لەوەدا نەبوو کە تەنگ بە ئۆجەلان هەڵبچنن. ئۆجەلان پێشنیازی ئەوەی کردبوو کە دەکرێ پارتی کاری خەڵك لەچارەسەری دۆزی کوردا بەکەڵك بێت. بەڵام ئەو ئەوەی نەدەشاردەوە کە پەکەکە بەشێکە لەپرۆسەکەو لەرێگەی خەباتی چەکدارییەوە خواستەکانی دەسەپێنێت. ئەو ئەوەی نەدەشاردەوە کە هەستگەلێکی تێکەڵو پێکەڵی هەیە لەبارەی ئەوەی چەندە دەخوازێت ئەو حزبە خواستی پارتەکەی جێبەجێبکات.

لەماوەی بانگەشەکانی هەڵبژاردندا ئۆجەلان فەرمانی دابوو بە ئەندامو هەوادارانی پەکەکە کە تاچەند بۆیاندەکرێت کاربکەن بۆ سەرخستنی کاندیدەکانی پارتی سۆشیال دیموکراتەکان. بەمجۆرە شۆڕشگێران لەسەر بنەمای ئەو پەیامە هەوادارانیان لەشارەکان‌و دێهاتەکاندا کەوتنە گەنگەشە بۆ کاندیدانی حزب. بەڵام لەئێستادا ئەو

---

[186] Incidents taken from Turkey Human Rights Report (1991), 52, and Mil"
liyet and Cumhuriyet, December 1991.

خەڵکانەی کە کورسی گەلێکیان لەپەرلەماندا بردۆتەوە، وادێتە پێشچاو کە خودی ئۆجەلان بە بوونیان کەیفخۆش نییە.

لەراستیدا هۆکارەکان زۆرن. ئۆجەلان بەتەواوی باوەڕی بەپارتەکە نەبوو، سەرەڕای ئەوەیش کە ئەندامگەلێکی بەرفراوانی پەکەکە هەوادارو سەرخەری بوون، چوون بەردەوام کارو چالاکیو رامیاریی پارتەکە لەدەرەوەی کۆنترۆڵی ئۆجەلاندا بوو. هەروەها لەو ماوەیەشدا کە پەکەکە مژوڵی خەباتو رووبەڕوو بوونەوە بوو، نوێنەرانی کورد لەسەر پەڕەی هەوەڵی میدیای تورکیدا نمایشدەکران(تەنانەت گەر لەو بابەتانەشدا موجامەلەی دەسەلآتیان نەکردبێت، ئەوا بەجۆرێك لەجۆرەکان هاوسۆزیو پێوەندییان بەبەرەی نەیاری پەکەکەوە هەبووە)[187]. لەراستیدا بەشێکی کەم لەوانە پێداگرییان لەسەر پەکەکە بوونیان نەدەشاردەوەو بەشێکی کەمیشیان لەدوژمنایەتیدابوون لەگەڵ نەزمو نواڕینی پەکەکەدا بۆدۆزی کورد، وەلێ زۆربەیان وابیریان دەکردەوە کە پێویستە سەربەخۆیانەو دوور لەفشاری پەکەکە چالاکییو رامیاریی خۆیان بکەن.

هەربۆیە دەکرێت بۆ دوپاتکردنەوەی ئەو راستییانە بێت کە ئۆجەلان خۆی بەڕابەری جولآنەوەی نەتەوەیی کورد دەزانی، هەربۆیە قسەی لەبارەی پێکەوەنانی حکومەتی وەختی جەنگ دەکرد تا بەشێکی کوردستاُن لەباشووری رۆژهەلآتی تورکییەو باکوری ئێراق بگرێتەوە[188].

لەم سۆنگەیەوە لەسەر بنەمای ئەنجومەنی نەتەوەیی فەلەستینیی، ئەو ئەنجومەنێکی نەتەوەیی کوردیی پێکەوەناو ئامادەکاریکرد بۆ دامەزراندنی پەرلەمانی کوردان لەمەنفا. پەیامی ئەم کارانەی ئۆجەلان روونو رۆشن بوون. ئەوانیش پەیامێك بوون تا پیشانبدەن بەچاوپۆشی لەهەموو ئەو دەستکەوتانەی کە نوێنەرانی کورد توانیویانە لەپەرلەماندا بەدەستیبهێنن، ئەوە ئۆجەلان بوو دەیهەویست ببێتە رێبەری کوردان لە سەربەخۆیی رامیاریدا.

---

[187] Milliyet, Dec. 28, 1991.
[188] Imset, the PKK, 245–246.

تا ئەوکاتە دامەزراوەی تورکیی نەیدەتوانی ئەو راستییە ببینێت کە نوێنەرانی کورد کەمو زۆر نەیارو رکابەری دەسەلاتی ئۆجەلانن. کەمال پەرلك دەیگوت: "دەوڵەت رێگاکانی دیموکراسی بە بنبەست گەیاندبوو". ناوبراو چالاکوانێکی سەربەخۆبوو، ساڵی ١٩٩٣ دەستی دایە کاری سیاسیی لەگەڵ پارتی کوردیدا. سەبارەت بەو رەوشە دەیگوت:"ئەودەمانە فشارە یاسایی‌و نایاساییەکانی سەر پارتە کوردییەکە گەشتبوونە لوتکە. هەر ئەم رێو شوێنە توندەی میریش بوو لەسەر پارتە فەرمییە یاساییەکان، کە دوواجار کۆتاییان هێنا بە بەهێزبوونو بالآبوونی سەنگی پەکەکە لە تورکیادا".

## گـــەیشــتن

سیفتسی جەوانێکی درێژکۆلەبوو، ئەو دەستبەرداری خوێندنی زانکۆبوو تا پێوەندی بەریزەکانی پەکەکەوە بکاتو خەبات بکات بۆ گەیشتن بە دەوڵەتی کوردیی. ناوبراو لە مانگی حەوتی ١٩٩١ گەیشتەوە نێوچەی ئامەد. ئەو پێش ئەوەی کەمپی پەکەکە لە بیقاع جێبهێڵێت وەك فەرماندەی یەکەیەکی حەوت کەسیی دیاری کرابوو. ئەو یەکەیە بچوکترین یەکەبوو لەنێو گەریلاکاندا. سیفتسی پاش ٣ مانگ رۆیشتن بەپێیان لەنێو سنوورەکانی عێراق تورکیا دا، توانی خۆیو تیپەکەی بگەیەنێتە گەریلا پەنهانو یاخیبوەکانی باکوری شاری دیاربەکر. لەوێ پلەی بەرزکرابوویەوە تا ببێتە سەردەستەی یەکەی تاکیم کە پێکهاتبوون لە نێزیکەی ٣٠ گەریلا. بەرزبوونەوەی پێگەی ئەو بەو خێراییەو لەو کاتەدا رەنگە پەیوەندیدار بووبێت بە کەمی کەسانی بەئەزموون لەبواری جەنگو پارتیزانیدا. وەلێ بریارەکان بەتەوای لەجێگەی خۆیاندا بوون. سیفتسی پیاوێکی ئارامو لەسەرخۆبوو، باوەری بەخۆی هەبوو، لەدژوارترین رووبەرووو بوونەوەکاندا بەرگەی دەگرتو بەورە بوو، رێزی لە فەرماندەو گەریلاکانی دی دەگرت.

سیفتسی پێی وابوو لەرەوشێکی زۆر ناجێگیردان. ئەو لەنێوچەکەدا لەهاموشۆدابوو وەك گەرۆکێك، لەرۆژێکدا دەچووە لیزو چەند شارۆچکەیەكو پاشان دەچووەوە دیاربەکر. هەر لەبارەی رەوشی ناوچەکەوە ئەو پێی وابوو، کە دێهاتییەکان هێند

بەحەماس‌و حیرەت بوون، گەر بهاتایە سەربازێکی تورک بکوژرایە دەیانگوت ١٠ سەرباز کوژراون. هاوکات سەربازانی تورکیی نائاشنابوون بە جوگرافیای ناوچەکەو بەدروستی هەماهەنگییان نەبوو تا کێومالّی نێوچەکە بکەن. هەموو تەکنەلۆجیاکانی بواری سەربازیی‌و ئامێرە جەنگییەکانی وەك تانك‌و زرێپۆش‌و هەلیکۆپتەرەکانیش لەبەرامبەر شارەزایی‌و چاوکراوەیی گەریلاکان دادی نەدەدان. چوون گەریلاکان گەڕۆك بوون‌و بۆ ئەوان نیشانە نەدەکران. سیفتسی دەیوت: "سەربازەکان تا بناری چیاکان دەهاتن، وەلێ نەیاندەتوانی بێنە ناوەوەو هەلّزنن بە نێوچەکەدا". هێزەکانی ئاسایشی تورك هیچ کات نەیاندەتوانی بەدروستی ئامادەکاریی بکەن بۆ جەنگ لەشەواندا، چوون لەشەواندا بەتەواوی رەوشەکە لەژێر کۆنترۆڵی گەریلادا بوو.[١٨٩] چەند سالّێك پاش ئەوە یەکێك لەبەرپرسە سەربازییە گەورەکان رەخنەی لەمیری گرت بەوەی کە بەپێی پێویست سەربازی مەشقپێکراو و ئامێری جەنگیی لەنێوچەکەدا بوونی نەبوو. بۆنموونە دووربینی بەهێزوو هۆکارەکانی تری دۆزینەوەی یاخیبووان. هەربۆیە یەکێك لە جەنەڕاڵە خانەنشینەکان بەناوی حەسەن کەنداکی لەیادەوەرییەکانیدا دەیگوت:"تێرۆرستان شەویان وەك چەکێك بەکاردەهێناو سەربازەکانیش بەشەواندا مەفرەزەکانیان دەرنەدەچوون". سەربازە جێگیربووەکان لەناوچەکەدا شەوانە لەپێگەکانیان دەمانەوەو گەریلاکانیش بەئازادی هاموشۆو هاتوچۆی نێوچەکەیاندەکرد. هەربۆیە کەنداکسی بە داخەوە ئەو گۆتەیەی گەریلاکانیان پشتڕاست دەکردەوە کەدەیانگوت: "شەوان بۆ ئێمەیەو رۆژانیش بۆ سەربازەکان"[١٩٠]. گەریلاکان شەوان خالّی پشکنینیان لەسەر رێگە سەرەکییەکان دادەناو لەوێ داوای ناسنامەو پشکنینیان بۆ کەسانی ئامانجدار دەکرد.

لەوێ کوردان هۆشداری نەتەوەییان پێدەدراو فەرمانبەرانی میریی داوایان لێدەکرا واز لەپۆست‌و پلەو کاریان بهێنن. هاوکات خاوەنکارو کرێکارە تایبەتەکان داوایان لێدەکرا واز

---

[189] Kundakci, Guneydogu'da, 223; the memoirs offer an excellent over" view of the problems facing Turkish soldiers, see 195–242 especially.
[190] Kundakci, Guneydogu'da, 224.

له هۆکارەکانی گواستنەوەو ئامێرەکانی ڕێگەوبان بهێنن‌و زۆرجاریش ئاگریان بەردەدایە ئەو بارهەڵگرو ئامێرانەی لەژێر خواستی میریدا لەناوچەکەدا کاریاندەکرد. ئەوانەی کە بەکرێگیراوی میری بوون‌و هەڵسوڕاو بوون تا شکاری گەریلاکان بکەن بۆ میریی، بەتایبەت تاقمی حزب‌و ڵلآی سەر بەمیریی، کە ڕەوتێکی راستڕەوی توند بوون(هیچ پێوەندییان بە حزبو ڵلآی لوبنانەوە نەبوو)، بەهەمان شێوە پەکەکە ئەوانی بەئامانج دەگرت‌و دەیکوشتنەوە.

تێکڕای ئەوانەی جێ ئامانجی پەکەکە بوون، بریتیبوون لە پۆلیس‌و گوندپارێزو هەموو ئەوانەی کە نەیاری شۆرشگێڕان بوون. لەساڵی ١٩٩٢ دا گەریلاکان سەرزەنشتکران بە کوشتنی زیاد لە ٢١٠ هاولاتی بەتۆمەتی پشتیوانییان بۆ دەوڵەت. لەساڵی ١٩٩٣ دا پەکەکە ٣٠٠ کەسیی پشتیوانی دەوڵەتیی بەدەستڕێژی گوللە لەنێوبرد[191]. لەهەمانکاتدا پەکەکە هەڵی دەکوتایە سەر خاڵەکانی بەرگری سەربازیی تورك لەنێوەندی شارەکانداو بینایەی پۆلیس‌و دەزگاکانی دەوڵەتی دەدایە بەر دەستڕێژی گوللە.

هاوکات دەستڕێژی دەکرد بە نێو کاروانی ئەو سەربازە بەشمەینەتانەی لەرێگاکاندا دەبران‌و دەهێنران بەمەبەستی خوێندن‌و ڕاهێنان.

ڕەوشەکە لەنێوان ساڵانی ١٩٩٠ بۆ ١٩٩٢ تا دەهات سەخت‌و دژوار دەبوو. بەم پێیە هێزە سەربازییەکانی تورك پەیوەستەگییان ئێجگار لێکترازاو شڵەژا. کانداکسیی لەیادەوەرییەکانیدا گازاندەی بەم جۆرە دەردە دڵی خۆی دەردەبڕێت: "سەربازەکان یەك لەدووای یەك لە هەڵهاتندا بوون". هەروەها دەنوسێت: "لەگەڵ ئەوەشدا تێرۆریستەکان وەك خۆیان نەدەمانەوە، ڕۆژ لەدووای ڕۆژ هەنگاویان بەرەو پێشەوە دەنا"[192].

لەراستیدا سەرکەوتنەکانی پەکەکە هەروا ئاسان نەبوون، تەنها لەو ساڵەدا کە سیفتسی گەیشتە ئامەد، لەکۆی ئەو ٣٠٠ گەریلایەی کە لەو سنوورەدا بوون، نیوەی

---

[191] See Turkey Human Rights Report (1992), 63–73; and (1993), 82–89.
[192] Kundakci, Guneydogu'da, 202.

ڕێکیان لەپێکدادانەکاندا لەنێوبران. ئەو ڕێژەیە بێ لەوانە بوو کە دەپێکران یاخۆ هەڵدەهاتن.

سیفتسی دەیوت: "سەربازانی تورك تەواو بێ ئەزموون بوون، وەلێ ئێمە لەوان کۆڵەوار تربووین". هەروەها دەیگوت: "بۆخۆم تەنها ٢١ بۆ ٢٢ساڵ تەمەنم هەبوو. ئەوانی دیکە لە گروپەکەمدا جەوانتر بوون لەمن. هەر لە دومایی ١٩٩١ دا دەستماندایە گرتنی خەڵکێکی نوێ بۆ نێو ریزەکانمان، هیچ کام لەوانە تا ئەوکات تفەنگیان بەدەستەوە نەگرتبوو".

پەکەکە ئەوەی مایەی خۆشحاڵی‌و خەونی بوو بۆ ئامادەسازی گەریلاکانی‌و خۆی پێوە هەڵدەکێشا بریتی بوو لە کەمپەکانی ڕاهێنانی بیقاع، وەلێ زۆرێك لەوانەی کە مەشقەکانیان تەواو کردبوو، دووا بەدووای ئەوە گازاندەی ئەوەیان دەکرد کە لەکەمپەکاندا هیچ سودێکیان نەبینیوە. سیفتسی بەپێکەنینەوە باسی لەم نموونەیە کرد: "پیشانیان دەداین چۆن لە ئۆتۆمبێلی جێبدا خۆمان هەڵدەینە خوارێ، بەپێکەنینەوە دەمان وت کاتێ خۆمان هەڵدەدەین دەڵێین یاالله. ئەوە لەکاتێکدا بوو دەمانزانی لە کوردستاندا ئێمە جێبمان نەبوو".

لەگەڵ ئەوەیشدا هەموو گەریلاکان نەدەنێردران بۆ ڕاهێنان. چوون لێشاوی زۆری ئەندامە نوێیەکان ئەوەی سەختکردبوو کە هەمووان بتوانن لە زەمان‌و شوێنێکدا گرد بکرێنەوەو سودمەند بن. هەموو ئەوانەی کە ڕزگاریان ببوو ئەوەیان بینیبوو کە زەحمەتێکی فرەیان چەشتبوو تا خۆیان گەیاندبووە بنکەکانی پەکەکە لەباکووری ئێراق. حەسەن تۆپیدەر یەکێك لەفەرماندەکانی پەکەکە دەیوت: "وەختێ لەئاواییەکانەوە بە چەند گەریلایەکی نوێوە دەگەڕاینەوە، کە هەموویان خواستی پەیوەندییان هەبوو بەڕیزەکانمانەوە، هەندێك جار ئەوان دەکەوتنە مەتەرێزی دوژمنەنەو دەمردن، تەنانەت دەرفەتی ئەوەشیان نەدەدی کە جل‌و بەرگەکانیان بگۆڕن، چ جای ئەوەی ببنە گەریلایەکی تەواو".

پەکەکە هەمیشە ژمارەیەکی بەرچاو لە شۆرشگێڕەکانی خۆی لە جەنگەکاندا لەدەستدەدا. بەلاّم ئەزموونێکی ئێجگار گەورەی لەخەباتەکەیدا وەرگرت. تەنها بەوردبوونەوە لە ئەلبوومی شەهیدانیی تێدەگەیت چ یادەوەرییەکی ئەو مردووانە ئەزموونکراوە. بەتایبەتی لەنەوەدەکاندا پەکەکە قوربانییەکی ئێجگار گەورەی بەگیانی گەریلاکانی دا.

هۆکاری سەرەکی ئەوەبوو کە قوربانییەکانی پەکەکە زیاتر ئەوانەبوون کە لەشارەکانەوە هاتبوون‌و بەتایبەتی خوێنکارانی زانکۆ بوون یاخۆ ئەو هەرزەو نەوجەوانانەی ئاواییەکانی باشوورو رۆژهەلاّتی ولاّت بوون کە تەنها تەمەنیان لەنێوان ١٤ بۆ ١٥ ساڵیدا بوو. هەربۆیە گەنجیی‌و رادەی کاڵ ئەزموونی هەموو ئەوانە، بایی ئەوەندە نەبوو رووبەڕووی مەرگ ببنەوە لە جەنگەکاندا، بەڵکو زۆرتر هێندەیان بۆ دەکرا لەجەنگەکاندا هەڵبێن‌و قوتاربن‌و جەنگیان بۆ نەکرێت. بەچاوپۆشی لەوەی هەریەك لەوانەیش لە کوێ‌و چۆن گەورە بوون، لەشاخێدا ژیانێکی ئێجگار سەخت‌و ناهەمواریان هەبوو، تەنانەت ئاوی خواردنەوە بە ئاسانی دەستگیر نەدەبوو، خواردن ئێجگار سادەو کەم بوو، شوێنی خەوتن زۆر بێزارکەرو لەسەر تاشە بەردان بوو، ژیان پڕ لەئەسپێ‌و مەگەز بوو.

نەوال ناوی نهێنی خانمێك بوو، ساڵی ١٩٩٢ دەستبەردای خوێندنی زانکۆکەی بوو و پێوەندیی کرد بەشۆڕشگێڕانەوە. ناوبراو ئەوەی لەیاد بوو چۆن هەوەڵجار ئەو خواردنەی کە دەرخواردی دەدرا بێزی لێدەکردەوەو دایدایە دوواوە. تەنانەت ئەو خواردنەی بەشەکەی ئەو لەچاو ئەوانی تردا خواردنێکی ئێجگار باش بوو، کە ئەویش بۆ هەر تاکێك بەشەکەیان نانێکی فیساوەی ئاخێنرابوو بە تەماتەو رۆندا[١٩٣]. عوسمان ئۆجەلانی برای عەبدوڵا ئۆجەلان وەختێ خواردنەکەی دایە خانمەکە پێی دەوت : "خواردنێکی وا

---

[193] Buldan, PKK'de Kadin, 16.

دەرفەتێکە، رەنگە جارێکیتر دووبارە نەبێتەوە". ئەویش دەم ئەوان لە کەمپی هاکورت بوون لە باکووری ئێراقدا.

لە کۆتایی ۱۹۹۱ دا، یەکێکیتر لەشۆڕشگێڕەکان کە وازی لە خوێندنی پزیشکییەکەی هێنابوو، بە دکتۆر سلێمان ناسرابوو. ئەو راهێنانی سیاسیی لە ئەسینا بینیبوو، هاوکات لە کەمپی رێکخراوە فەلەستینییەکانیش چەندین کۆرسی بڕیبوو. ناوبراو لەئامەدەوە هاتبوو، هەر زوو کرابوویە بەرپرسی یەکەیەك لەبارەگایەکی نێوچە دارستانییەکانی دەوروبەری شارۆچکەی جلك. دکتۆر سلێمان پیاوێکی کورتەبنەی ماسولکە لاواز بوو. سەرەتا نێردرا تا هاوسۆزو هەوادارانی پەکەکە لە ئەدەنە دا رێکبخات. ئەویش شارێك بوو. وەختی خۆی خوێندنی زانکۆکەی هەر لەوێندەر دەستپێکردبوو. کەمتر لەهەفتەیەك پاش ئەوەی کە دکتۆر سولەیمان گەیشتە ئەوێ، ئەندامانی نوێ کە هاتبوونە نێو چالاکیو کارەوە هەموویان دەستگیرکران.

ئیدی دکتۆر سولەیمان کە ناوە راستەقینەکەی سەعید کورو کایا بوو، هیچ هەڵبژاردنێکی دیکەی جگە لە جێهێشتنی شارەکە بۆ نەمابوویەوە. ئەو لەوکاتەدا تەمەنی تەنها ۲۳ ساڵ بوو. کاتیخۆی بۆ هەوەڵجار لەلایەن پەکەکەوە فەرمانی پێکرابوو رووبکاتە شاخ، لەوکاتەوە هەستێکی ئێجگار وروژێنەر روویلێنابوو. بەمجۆرە دەستی دابوویە کاری گەریلاییو خۆی گەیاندبووە بارەگاکانی شاخ. بۆخۆی دەیوت: "هەموو ئەو شەوقو شورەی کە بەردەوام لەسەرمدا بوو، جەنگو رۆیشتن بوو بۆ کوردستان".

کوروك کایا دوواجار سەرکردایەتی یەکەیەکی ۳۰ کەسیی، لە شارۆچکەی جنکی باکووری شاری دیاربەکر پێسپێردرابوو. لەسەرەتاوە یەکەکەی فراوانو گەورە بوو، وەلێ پاش شەش مانگ لە رووبەڕوو بوونەوەو دژوارییە نەبڕدییەکان، نیوەی تەواوی ئەندامانی یەکەکەی یان لەنێوچوون یاخۆ هەڵهاتنو مەیدانیان چۆڵکرد. ئەودەمانەی کوروك کایە پۆستی جنکی بەدەستەوەگرت، وەرز وەرزی زستان بوو. هەر بۆیە هەریەك لە گەریلاکانو ئەرتەشی توورك بەهۆکاری سەختی کەشو هەواو هەلو مەرجی زستانەوە

ناچارکرابوون جەنگەکانیان هەڵپەسێرن. بەتایبەت لە جنك بەفرێکی ئێجگار زۆر وەشتببوو، بەجۆرێك کە ئەستەم بوو مرۆ بتوانێت هەڵسوڕێ‌و هاموشۆ بکات.

دکتۆر سلێمان دەیگوت: "ئێمە لەژێر خێمەیەکدا بووین، کە بەجۆرە زیخ‌و بەردێك دامان پۆشیبوو، لە دەرێشدا تەوالێتێکی گچکەمان هەبوو. لەبارەگاکەی ئێمەوە تەنها ئاواییەك هەبوو، کە فرە دوور نەبوو لێمانەوە، ئەوێ ١٢٠ ماڵێکی لەخۆ دەگرت. هەموو رۆژێك ماڵەکان بەجیا خواردنیان بۆمان دەهێنا".

رەوشەکە دژوارو دڕدۆنگاوی بوو، کاتێك لەکۆتایی زستانێ هاتنە دەرێ‌و دەرکەوتنەوە نیوەی تەواوی گەریلاکان، لەوانە سیان لە فەرماندەکانیان هەڵهاتبوون‌و بەرگەی هەلومەرجەکەیان نەگرتبوو. چەند رۆژێکی کەم پاش ئەوە ئەرتەشی تورکیا، دەستی دایە چالاکییەکی سەربازی دژ بەو ١٣ گەریلایەی کە لەوێندەر تا ئەوکات مابوونەوە. دکتۆر سولەیمان بە کەنینەوە دەیگوت: "ئەوە یەکەمین رووبەڕوو بوونەوەم بوو".

لە درێژەی باسەکەیدا وتی: "وەك فلمێك دەمڕوانییە رووبەڕوو بوونەوەکە، خۆم هاویشتە بنبەردێك، هەروەك لە فلمەکاندا دەمبینی خۆم دابوو بەزەویداو قەرەوڵمگرتبوو". پاشان ناوبراو سەرێکی راوەشاندو بەمجۆرە درێژەی دا بە گێڕانەوەکەی: "یەك رۆژی تەواو لە بەیانییەوە تا کاتی شەو لەجەنگدابووین، سەربازەکان تەنها ١٠٠ بۆ ٢٠٠ مەترێك لێمانەوە دور بوون، ئێمە لە نێوچەیەکی جەنگەڵاویدا بووین، ئەوان نەیاندەتوانی بێنە نێو ئێمەوە، هەرچەند فڕۆکەی هەلی کۆپتەرو ئێف شازدەشیان بەدەکارهێنا بۆ لێدانمان، لەگەڵ ئەوەشدا هیچیان بۆنەکرا. بەمجۆرە نەبەردییەکەمان درێژە پێدا تا دنیا تاریك داهات، ئیدی ئەوان پاشەکشەیانکردو رۆیشتن".

لەدەستدانی ئەندامگەلێکی زۆری پەکەکە لە جینك، توانای تەڤگەرەکەی لە بەدەستهێنانی هێزی مرۆیی نوێدا کەچ نەکرد. دیارە ئەندامە نوێیەکان یان بەدروستی

بەمەترسیی ئەو کارەیان نەدەزانی کە دەستیان بۆ دەبرد، یاخۆ بۆیان گرنگ نەبوو چی روودەدا.

دکتۆر سولەیمان کە ئێستەکانێ لەپەکەکە جودابووەتەوەو لە زانکۆیەکی ئەڵمانیاد نێوی خۆی تۆمارکردووە بۆ خوێندن، لەبارەی ئەو رووداوانەوە دەیگوت: "تۆ شتانێك لەمێشکتدا گەلاڵە ببوو، وەك رامبۆیەك دەتروانییە جەنگ، چونکە تۆدەتەویست چالاکی بکەیت. فشاری دەوڵەتیش بەردەوام پاڵنەرێك بوو تا بەئاراستەی پەکەکە خۆت ساغبکەیتەوە". هەروەها دەیگوت: "تۆ لەو راستییە تێگەیشتبوویت، کەبەهیچ جۆرێك مافی ژیانت لە تورکیادا نییە، بۆیە دەتەویست تۆڵەبکەیتەوە. هەموو ئەم پاڵنەرانە خۆراکێکی رۆحی بوون تا وا لەتۆ بکەن پشتیوانیی لە تەڤگەری پەکەکە بکەیت".

بۆنموونە لەبەهاری ئەو ساڵەدا ١٠٠ئەندامی نوێ تەنها لە جینك دا چەکی پەکەکەیان کردەشان. تاکۆتایی ساڵی ١٩٩٢ تەنها لەشارۆچکەی جینك دا ژمارەی شۆڕشگێڕەکان گەیشتە نێزیکەی ٥٠٠ گەریلا. ئەو زیادبوونە سەراسەر پارێزگای ئامەدی گرتەوە. بۆنموونە ژمارەی ئەندامانی گەریلا تا کۆتایی ساڵی ١٩٩٢ لە ٣٠٠ گەریلاوە گەیشتنە ١٢٠٠ گەریلا.

دکتۆر سلێمان دەیوت:"بەمجۆرە خەڵکێکی زۆر پێوەندیکرد بەریزەکانی پەکەکەوە. ئێمەش پەیتا پەیتا دەستمانکردبوو بەناردنی وان بۆ شوێنەکانی دی. بۆنموونە بۆ ماردین، سعرتو ناوچەکانی تر لە باشووری رۆژهەلاتی ولات". لە تەواوی نێوچەکەدا، لەلایەن فەرمەندەکانی پەکەکەوە واتێبینیدەکرا کە رێژەی ئەندامان ئێجگار زیادیکردووە.

ئەوە جگە لەو هاریکارییە مەعنەویو هاوسۆزییەی بۆ پەکەکە دەنوێنرا، تێکڕای گەریلاکان لەسەراسەری نێوچەکەدا وەك ئەوەی خەملێنرابوو، چمارەیان خۆی دەدا لە ١٠,٠٠٠ ئەندام. ئازمان یەکێك لە فەرماندەکانی پەکەکە لەکۆتایی ١٩٩٢ دا پاش مانەوەی شەش مانگی رەبەق لە دۆڵی بیقاع گەڕابوویەوە باشووری رۆژهەلاتی تورکیا، ئەو سەبارەت بە رەوشەکە دەیوت: "ئێمە ئاگرەکەمان هەڵگیرساندبوو، بەمۆڕاڵێکو بە

ڕۆحێکی مەعنەوی بەرزەوە دەستمان دابوویە خەباتی چەکداریی، ئەستەم بوو لەو بڕیارەی کە دابوومان پاشگەزبینەوە".

زۆرجار خەڵکی ئاواییەکان لێمان رادەمان، بەتایبەتی وەختێ ژنێکی چەك لەشانیان لەنێو گەریلاکاندا دەبینی و کاتێك بەشەواندا خلۆردەبوونەوە بۆ نێو ئاواییەکان تا پڕوپاگەندەی تەڤگەرەکە وەشانبکەن یاخۆ ئازوقەو کۆمەك لەئاواییەکاندا خڕبکەنەوە. ئیسیل کوروك کایا، ئەو ژنەی پاش ئەوەی لەزیندانێدا مەرەخەس ببوو، سەرلەنوێ ساڵی ١٩٨٦ پێوەندیکردبوویەوە بەڕیزەکانی پەکەکەوە. ئەو باسی لەوە دەکرد کە ژنانی ئاواییەکان هەرگیز عەقڵیان نەیدەبڕی کە ژنێك چەك بکاتە شانو روو لەچیا بکاتو لەپێناو خواستەکانیدا بجەنگێت.

کەرەتێکیان کیژۆڵەیەکی جەوانی ئاواییەکە هەڵیدایەو سوور بوو لەسەر ئەوەی دەستوەربداتە سنگی ئیسیل کوروك کایا تا بزانێت بەراستی کچە یان نا، وەختێك دەستەکانی بردە ژێر کراسی خانمەکە لە تاو سەرسوڕماندا خۆی بۆ رانەگیراو هاواری کرد.

تەنانەت پیاوانیش وەختێك لەو راستییە تێدەگەیشتن بەڵێ، ژنانێکیش هەن لەجەنگەکاندا، ئیدی ئەوانیش جۆرێك لەشەرم دایدەگرتنو بەئاسانی بۆیان هەزمنەدەکرا.

کوروك کایا کە ئێستا لە هامبورگ دا، لەتەك سەلیم کوروك کایا (فەرماندەی پێشووی پەکەکە)ی هاوسەریو کچەکەیان ژیان بەسەر دەبات، لە دیدارەکەمدا لەگەڵیدا پێی وتم: "ئەو پیاوانەی کە بەتەمەنتر بوون دەیانگوت: تەماشا کەن، ئێمە لەراپەڕینی دەرسیمەوە(١٩٣٨) تا ئێستا هیچمان بۆ نەکراوە، ئێستا چلۆن ئەم خانمگەلە گەرەکیانە شتێك بکەن".

تائەوکات عادەت وەها بوو ژنانی دێهاتەکان تەنێ خۆیان نەدەچوونە دەرێ، هەربۆیەش ئامادەیی ژن لەناو تەڤگەری پەکەکەدا هەروا ئاسان نەبوو، چوون سەیرییەتی دیاردەکە خاڵێکی بەرچاو بوو تا بەئاسانی نەتوانن پێوەندی بکەن بەڕیزەکانی پەکەکەوە. تەنانەت لەشارەکانیشدا بەدرێژایی هەشتاکان ئەندامانی ژن لەریزەکانی

پەکەکە لاواز بوون، چونکە گروپەکە لەو قۆناغەدا دارای کادێری ژن نەبوون ـ چالاکییەکانیان لەنێو پێری ژناندا پەرە پێبدەن.

وەلێ ئەم رەوشە لەپاش ساڵی ١٩٨٩ گۆڕانکاریی بەسەردا هات، بەتایبەتی پـ ـ ئەوەی پەکەکە توانی بخزێتە نێو نێوەندی شارە جەنجاڵەکانو دەستی راگەیشت ـ حەرەمی زانکۆکان. هاوکات هزرو هێزی پەکەکە خزایە نێو چاپەمەنی و سیاسەتەوە ئیدی ئەمە یارمەتی دا تا لە دەستپێکی نەوەدەکان بوونی ژن لەریزەکانیدا بکاتە ئەمری واقیع. هەرچەند تا ئەوکاتیش ژنان لەو راستییە زیاتر رادەمان، کە بۆ ئەوان ساناترە (لەلای خێزانەکانیان زیاتر پەسەندە) کە لە نوسینگەیەکدا کاربکەن تاوەکو وێڵ و سەرگەردانی ژیانێکی نامۆو نا ئاشنابن لە شاخێدا.

بەگشتی لەسالانی دوای کۆدەتای سەربازیی ولات، ژنانیش رووبەڕوو ببوونەوە لەتەـ گۆڕانکارییەکانی سەردەمدا. چوون دەستگیرکردنی دەیان هەزار لەپیاوانی کورد، ژنانی ناچارکرد ئەرکو ئیشی ماڵو خێزان بکەوێتە سەرشانیانو تێکەڵ بەکۆمەڵگەو کۆسپەکانی ژیان بن. ئەوان تەنێ قەلەقی بژێویو دەرامەتی خێزانەکانیان نەبوون، بەڵکو ئەوانیش لەلایەن پاسەوانو پۆلیسو دادگاکانی تورکیاوە گیرۆدەی سیستەمی بیۆقراتیانەی زیندانو حەپسو تێهەڵدانو دەستدرێژی ببوونەوە.

بۆنموونە لەیلا زانا تەنها ژنێکی کورد بوو، کە هەڵبژێرابوو بۆ ئەندامی پەرلەمانی تورکیاو لەناو پارتێکی سیاسیشدا پێگەیشتبوو. ئەو ساڵی ١٩٧٥ لەتەمەنی ١٥ ساڵیدا لەگەڵ ئامۆزایەکی فرە لەخۆی بەتەمەنتر هاوسەرگیریی کردبوو. لەیلا تا پێش هاوسەرگیریشی نەیدەزانی بەتورکی قسان بکات، چوون بابی بڕوای بەوە نەبوو کچان بنێردرێنە بەرخوێندن. شووەکەی فەرمانبەرێکی سادەی شارەوانی بوو[١٩٤]. لەیلایش پاش ئەوەی هاوسەرگیریی کرد، ئەنجا بۆی لووا بۆخۆی بڕیاربدات. لەیلا بۆخۆی دەیوت:"پاش پێنج ساڵ لە پرۆسەی هاوسەرگیرییەکەم، هەر لەسەر نەریتو نواڕینی

---

[194] Information about Zana’s life comes from author interview con" ducted in 1993 in New York City and Kutschera, “Leyla Zana."

پێشوو بوومو دارای ژیانی خۆم نەبوومو بەردەوام لەژێر ڕکێفی هاوسەرەکەم(مەهدی زانا) دا بووم".

هاوسەرەکەی پاش کۆدەتای سەربازیی ولآتەکەی دەستگیرکرا. ئەو دەم مەهدی زانا ببوویە سەرۆکی شارەوانی دیاربەکر. لەم پێودانگەوە لەیلا زاناو دوو منداڵەکەی ناچارکران لەتەك ئەو دا دەستبەسەربن. زانا یەکێك بوو لەوانەی بەشداریکردبوو لە نارەزایی نێو زیندانەکان.

لەیلا زانا دەیگوت: "من گۆڕانکاریم بەسەرداهات، هەستمکرد جیاوازمو دارای شوناسێکم، ئیدی لەخۆم دەپرسیی، من بۆیە لێرەم، کەواتە بوونم هەیە"[195]. پاشان لەیلا زانا ساڵی ١٩٨٨ دیسانەوە دەستگیرکرایەوە. ئەوە کاتێك بوو کە ئەو لەنێو ئەو خێزانانەی کە چاوەڕێی بینینی زیندانییەکان بوون، تێکڕا لەتەك پاسەوانەکانی زینداندا کردبوویانە غەوغاو هاتوهاوارو نارەزایی دەربڕین.

لەیلا زانا لەژیانی زیندانیدا دوچاری ئەشکەنجەو ئازارو سوکایەتی کردن بوویەوە. هەربۆیە ئەزموونی ژیانی زەمینەی بۆ رەخساند کە کەللە ئەستوور تربێت لەبەرامبەر نادادییەکاندا[196]. لەیلا دەیگوت: "ئەو بڕوایەم لادروست بوو ئیتر کاتی ئەوە هاتووە دەستبدەمە چالاکی سیاسیی، بەتایبەتی کاتێك کە بینینم لەنێو پەکەکەدا ژنانێك هەن چەکیان هەڵگرتووە بۆ ئەوەی بجەنگن".

هەروەها دەیگوت: "لێرەوە جیهانبینیم گۆڕاو ئیتر ئەو هەستەم لادروست بوو بەڵێ ژنانیش مرۆڤن".

چونکە کاتێك لەیلازانا ڕێگەی خۆدەشکرد بۆ بەشداریی چالاکیی سیاسیی، ئەودەمانە ژنان روویان لەشاخێ دەنا تابینە شۆڕشگێڕ. بەجۆرێك کە تا ساڵی ١٩٩٣، ژنانی هێزە چەکدارەکانی پەکەکە سێ یەکی گەریلاکانیان پێکدەهێنا.

---

195 Kutschera, "Leyla Zana."
196 Ibid.

لەراستیدا ئەوە بازدانێکی گەورەبوو لە ڕێژەو ڕێبازی بیرکردنەوەی ئافرەتاند ڕوویدابوو تا ببنە ئەندام لەریزی شۆڕشگێڕاندا. ئەم گۆڕانکارییە بەشدارییەکی کارای هەڵوێست و هاواری ژنانی کرد لەنێو تەڤگەرەکەی ئۆجەلاندا تا ئیدی ژنانیش بیانپەرژێنە سەر خواستو خولیای مافەکانیان[197].

لەراستیدا ئەم گۆڕانکارییانە مەعنەویاتێکی تری ڕۆحیی دایە نەزمی کۆمەڵایەتی ژنان. ئیتر ئەگەر روانگەی ئۆجەلانیش بۆ مافـو مێینەبوون ناڕۆشنبووبێت گرنگ نییە، چوون ئۆجەلان بەکارەکانی توانی هاوپەیمانییەتێکی مەزن بۆ ژنان دەستەبەربکاتو ببێتە پارێزەرو پەرژینی مافەکانیان. ئۆجەلان بەردەوام پێداگریی لەسەرئەوە دەکرد کە بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردیی بەرپرسی بنچینەییە لە ئازادکردنی ژندا. ئەو بەردەوام دوپاتیدەکردەوە کە بەڵێ ژنان لەکۆمەڵگەی کوردیدا وەك کۆیلە وانو تەواوی ژیانیان لەلایەن براو باوكو نێزیکەکانی دیکەیانەوە کۆنترۆڵکراوە.

هەرچەند دەکرێت ئەو ئەو بانگەشانەی ئۆجەلان بۆ پرسی ژن زێدەڕەوی و پیاهەڵدانێکی بەس قسە بێت، وەلێ لەبواری تەڤگەری ژناندا ڕۆڵی باشی هەبوو، چوون زۆرێك لەژنان تا ئەوکات هەستیان بە مافـو دەسەلاتیان نەکردبوو، یاخۆ پێیان وانەبوو دارای بەهایەکی بەرزن وەك مرۆڤ.

پێداگرییەکانی ئۆجەلانو دوپاتی ئەو راستییەی کردەوە کە زەمینەی شۆڕشگێڕیی بەبێ ئامادەبوونی ژن لەنێو ریزەکانی پەکەکەدا ئەستەمە. هەروەها ئەو بانگەشانە بواری دایە ئەو ژنانەی کە لەژێر تینو تاوی ژیانی نەریتدا تێکشکابوون، ئیتر ئەوان لەپڕدا ئەو هەستەیان بۆ دروست بوو کە دارای ژیانێکی شایستەو بەهادارترن. باتوفا ئەو خانمەی کە لە شارۆچکەی یوکسیکوفا وە هاتبوو، دەیوت: "ئایا ئێمە لەکوێین، ئەمە پرسێك بوو بۆ ژن ئەستەم بوو بەدووایدا بچێت". هەروەها دەیوت: "پێوەندیکردنمان بە گەریلاوە کاردانەوە بوو، کاردانەوەی فشارەکانی سەر ژن. ئەوە هەنگاوێك بوو بەرەو ئازادیی،

---

[197] Ibid.

چوون لە کتێبەکانی پەکەکەدا کەخوێندبوومەوە، بەتەسەلیی قسە لەسەر ئازادیی ژنان کرابوو"[198].

وەلێ زۆرێك لەژنان بەو قولییە رۆ نەچوو بوون، بەڵکو فرەبەسانایی پەکەکەیان بەسەندکردبوو، ئەوەیش هۆیەك بوو تا لەژیانی دووبارەی ژینگەکەیان قوتاربن. بەڵێ لە کۆمەڵگەیەکدا کە زۆرترینی کچەکانی قۆناغی سەرەتاییان لەخوێندن تەواو نەکردبوو، هەروەها پێش تەمەنی ١٥ساڵی بەشوو درابوون بە پیاو گەلێك، کە ئەوانیش مافی رەزامەندبوونیان لەسەروی خۆیانەوە بۆدرابوو نەك بۆخۆیان کیژۆڵەکان هەڵبژێرن. بەدڵنیاییەوە پێوەندیکردن بە پەکەکەوە لەنێو ئەو گرۆیەی ژناندا دیاردەیەکی فرە ئاسایی‌و چاوەڕێکراو بوو.

بەرپرسێك لە شاری باتمانی باشوری رۆژهەڵاتی تورکیا دەیگوت: "ئێمە دارای بونیادێکی کۆمەڵایەتیی داخراوین. لەبەرئەوە کاتێك کچان لەژێر فشارەکانی خێزانەکانیان دەتلێنەوە، ئیدی سانایە بۆ دەربڕینی ئازارو ئامانجەکانی رزگاربوونیان روو لەشاخێ بنێن"[199].

باوکێکی کورد دەکرا رێ لە کیژەکەی بگرێت کارنەکاتو بەتەنها سەردانی بازێڕو بازاڕ نەکاتو نەینێرێتە بەرخوێندن‌و تەنانەت قسەی لەسەر لەبەرکردنی جۆری پۆشاکەکەیشی هەبوو. وەلێ ئاسان نەبوو بۆ ئەو باوکە کە نکولی بکات لەبڕیاری کەنیشکەکەی بۆ ئەوەی بیەوێت شەڕبکات بۆ ئازادیی کوردستان. ئەم نەزمو نواڕینەی کچان بۆخەبات گەلێ پرس‌و جۆی لەمەڕ هاوسۆزی‌و دڵسۆزیی راستەقینەی خانەوادەکان جولاند، چوون لێرەوە زەمینەیەك بۆ نامۆبوون لەنێوان پەکەکەو خانەوادەکاندا بواری بۆ کرایەوە.

لەهەمانکاتدا ئەو دەرفەتانەی بۆ کچان کرابوویەوە لەنێو پەکەکەدا، جۆرێکی تر لە پرس‌و جۆی لەنێو تەڤگەرەکەدا دروستکرد. ئایا ئەوان بەدروستی دڵسۆزیی کچانن یان

---

[198] Quoted in Ozcan, PKK, 161.
[199] Halis, Batman'da, 94.

نا؟. چونکە ئەگەری مەترسیی سەر ژیانی کچان لەنێو پەکەکەدا بەجۆرێکی جیاواز لەو مەترسیانەی کە لەنێو خێزانەکانیان دوچاری دەبوون شتێکی چاوەڕێکراو بوو.

هەرچەند کە لەنێو پەکەکەدا دەوترا بەهەمان تامەزرۆییو تاوی خێزانەکانیان. پارێزگاریی لە پاکیزەییو خاوێنی کچان دەکەن، تەنانەت ئەوە هۆیەك بوو تا لەلایەن زۆرێك لە خێزانە نەریتییەکانی کوردیشەوە هاوسۆزیو هێمای هاریکاریی تەڤگەری پەکەکە ببێتە ئەمری واقیع تا بوار بۆ پرسی بەشداری ژنان بکەنەوە.

ژنێکی گەنج کە ساڵی ١٩٩٢ وازی لە زانکۆ هێنابوو، پێوەندیکردبوو بە پەکەکەوە. ئەو بە نێوی زیلان خۆی ناساند. ئەو خانمە پاش ٤ ساڵ توانی خێزانەکەی خۆی لە ئەوروپادا ببینێتەوە. زیلان لەلایەن پەکەکەوە نێردرا بوو بۆ ئەوروپا.

خزمو خوێشەکەی زیلان تەنها شتێك پێش هەموو شتەکان کە گەرەکیان بوو لەسەر زیلان بیزانن، ئەوەبوو ئایا ئەو تا ئێستایش بەپاکیزەیی ماوەتەوە یان نا، هەر بۆیە زیلانیش بەو پەڕی شانازیەوە تەواوی خزمەکانی خۆی لەو خەمەی کەهەیانبوو دڵنیاکردەوە کە بەڵێ بەپاکیزەیی ماوەتەوە.

## باسی دووەم:

## دنەدانی شەڕ ١٩٩٢-١٩٩٣

توانای پەکەکە بۆ بەڕێوەچوونی جەنگ بەشێوەیەکی سەرکەوتوو، بەهۆی پلانێکی وردو و وریاوەو بەهۆی ئازایەتیو نەبەردیی گەریلاکانەوە بوو، نە بەهۆی چانسو ئیقبالی وانەوە. حوسەین تۆپیگدەر، فەرماندەی هەرێمێکی کوردیی بوو بەنێوی گارزان. ئەوە جارێك بە کەندەلانێکی سەختی مینرێژکراوی هێزە سەربازییەکانی تورکدا نێزیك بە شاری سعرت توانیبووی تێپەڕێت. ئەوەیش چونکە خەڵکی ئاواییەکانی نێوچەکە یاریدەی پێرەکەی حوسەینیان دا بە هەڵگرتنی گەریلاکان لەڕێگەی پێنج بارهەڵگری گەورەوەو پاشان قوتارکردنی هەموویان بۆ شوێنێکی دوور لە خاڵو بنکەی پشکنینی پۆلیسو ئاسایش .

ئەوێ دەم درەنگانێکی هامنی ١٩٩٢ بوو. دێهاتییەکان دڵنیابوون لەوەی کە هێزە ئاسایشییەکان هەرگیز بەگیریان ناهێنن بۆ پشکنینی ماشێنەکانیان.

سەربازەکانیش دەیانزانی کە شۆڕشگێڕەکان رێگەگەلی جیاوازیان بەکار دەهێنا لە چالاکییەکانیاندا. حوسەین لەباسی چالاکییەکەدا بەدەم یادەوەرییەوە پێدەکەنیو دەیوت: "رۆژێك یەکێك لە خەڵکی ئاواییەکەم بانگکردوو پلانی ماشێنە بارهەڵگرەکانم بۆ روونکردەوە. لەراستیدا ئەوە پلانێکی سەرکەوتوو بوو". هەروەها دەیوت: "گەر وەزیری نێوخۆ بیزانیایە ٨٠ گەریلا لەڕێی بارهەڵگرەکانەوە توانیویانە بە وێستگەیەکی پۆلیسدا لەشاخەکانەوە بێنە خوارێ، ئەوا پێویست بوو دەموو دەس دەست لەکار بکێشێتەوە."

خەڵکی ئاواییەکان بۆ خۆشیان بەبێ ئەوەی داوایان لێبکرێت پشتیوانیو خۆشحاڵی خۆیان دوپاتدەکردەوە بۆ بەرەو پێشچوونی پلانە گەریلاییەکان. ئەم نەزمە لە دەستپێکی نەوەدەکانەوە بەقوڵیی لە کۆمەڵگەی کوردیی تورکیا دا دەستگرۆی تەقینەوەیەکی جەماوەری بەرفراوانی کرد بۆ پاڵپشتی لە رامیاریی جەنگیی پەکەکە.

شۆرشگێڕەکان بەبەردەوامی ئاگایان لە وەزن و وەرەی خۆیان بوو. چوون خەڵکیان بە بانگەشەو بانگکردنیان بۆ ڕێکخستنی مەراسیمی ناشتنی گەریلاکان بۆ تاقی بووبوەوە، بەتایبەت ئەو گەریلایانەی لە پێکدادانەکاندا دەکوژران. بەم پێیە ڕادەی پشتیوانیی جەماوەریی خۆیان باش دەزانی. هاوکات داوایان دەکرد خەڵکی دوکانەکانیان داخەن و نەچنە قوتابخانەو پرۆتستۆی ستەم و دەستدرێژییە سەربازییەکانیان دەکرد لە ناوچەکەدا. هەمیشەیش لەساڵوەگەڕی دەستپێکی جەنگی گەریلاییدا، کە مانگی هەشتی ١٩٨٤ هەڵگیرسابوو، خەڵکیی هەندەدران کە شەقامەکان و نێو بازێڕەکان کۆنترۆڵبکەن و نارەزایی لەبارەی نەزمی ژیانیانەوە نومایان بکەن.

بەڵێ بەمجۆرە ڕێورەسمی ناشتنی کوژراوەکان زەمینەیەك بوو بۆ جوڵانەوەکە تا سەرنجی هەزاران خەڵکی رەشپۆش و ماتەمگێڕی تورە بەرەو پەکەکە رابکێشێت.

دیاربەکری پێتەختی هەرێمەکە، لەوکاتەدا ژمارەی دانیشتوانی بە ٥٠٠,٠٠٠ نەفەر دەخەملێنرا. شۆڕشگێڕان بەچەند رۆژێك هۆشداریی پێشوەخت دەیانتوانی تەواوی شارەکە لەجموجوڵ بخەن و لەکار بیوەستێنن، ئەوان بۆ ئەو مەبەستە گەرەکیان بوو خەڵکی لەپلان و بەرنامەیان ئاگاداربکەنەوە.

بەتایبەت لەسەری ساڵی نوێی کوردیدا، بیانوویەکی باش و بابەتێکی لەبار دەرەخساو بۆماوەی هەفتەیەك دەیان هەزار لەخەڵکی دەرژانە بان شەقامەکان و خۆپیشاندانی نێزیك لەتوندوتیژی دەهاتە گۆڕێ، هەر لەوێیشدا دروشمی پەکەکەو دیبەیتی دژ بە دەوڵەت ساز دەکرا.

لەراستیدا هەڵسوڕان و ئاراستەکردنی خەڵکانێکی زۆر بەو شکڵە، تەحەدایەکی گەورە بوو بۆ سەر دەسەڵاتی میریی، هەر بۆیە هێزەکانی ئاسایش بەسەختی کاردانەوەی خۆیان لەوبارەیەوە دەنواندو جیاوازییەکی کەمیان لەنێوان شۆڕشگێڕان و خەڵکی سیڤیلی هاوسۆزی پەکەکەدا دەکرد.

بۆنموونە تەنها لەساڵی ١٩٩٢دا هێزەکانی ئاسایش لە ١٣ خۆپیشاندانی جیاجیاداو لەشارەکانی باشووری رۆژهەڵاتی ولاتدا زیاد لە ٢٠ کەسیان لەئاکامی تەقەکردن و

دەسترێژی گولله بۆ سەریان کوشت. هەندێك لەو خۆپیشاندانانە تەنها لەبەر ئەوە بوون کە پرۆتستۆی توندوتیژییەکانی میریی بکەن دژ بە هاولاتیانی سیڤیل‌و بێ چەك[200].

هەروەها کوشتنی ناهەق‌و نادیاری چالاکوانانی کورد وەك دیاردەیەك لەو ساڵەدا پەرەی سەند، ئەوان ناگەهان دەدرانە بەر گولله یاخۆ دەڕفێنران‌و دواتر بە کوژراوی لەسەر زبلگایەکدا لاشەکانیان توڕ دەدرا. تەنها لەو ساڵەدا ٢٥٠ حاڵەتی لەو شێوە هەبوون‌و ساڵی دواتر ئەو ڕێژەیە بەرزبوویەوە بۆ ٤٥٠ حاڵەت.

ئەو خەڵکانەی کە دەستنیشان دەکران بۆ ئەم شێوە کوشتنە بریتیبوون لە کەسانی پەیوەندیدار بە بزووتنەوەی مافەکانی مرۆڤ یاخۆ ئەندامانی پارتی کاری خەڵك‌و ئەوانەی بەڕواڵەت هاوسۆزی پەکەکە بوون. دواجار میری هێزگەلێکی پشتیوان‌و سێبەری خۆی، کە ئەجێندای دژە پەکەکە باری هانیبوون لەنێوچەکەدا کردە ملۆزمی ئازادیخوازان[201].

هەروەها کاردانەوەی هێزە ئاسایشییەکان دژ بە زەبرو زیانەکانی پەکەکە گەیشتە رادەیەك کەخەڵکی بەجۆرێك بترسێنن تا ئاڕاستەیان دژ بەشۆڕشگێڕان وەرگێڕن.

پاش ئەوەی ساڵی ١٩٩٢ هێزە چەکبەدەستەکانی پەکەکە هاوەنێکیان نا بە باڵەخانەیەکی دەوڵەتییەوە لەشارۆچکەی شەرناخ دا. لەکاردانەوەی ئەوەدا هێزەکانی ئاسایش بۆ ماوەی ٣ رۆژ وەك گێچەڵگێڕانێك بە خەڵکی بەردەوامبوون لە تەق‌و تۆقی

---

[200] Turkey Human Rights Report (1992), 37–47; hereafter THRR.

[201] Figures come from THRR (1992), 63 – 71; and THRR (1993), 143 – 158. For a credible account by a former PKK militant of how he later worked for the Turkish security forces assassinating Kurdish activists, see Sahan and Balik, Itirafci; Turkish state involvement in such killings long has been as" sumed because of who was targeted, because victims often were taken away by people who identified themselves as police or otherwise were last seen in police custody, and because very few people were arrested and with rare ex" ception, nobody prosecuted. The U.S. Embassy in Turkey, in its 1993 annual human rights report, referred to allegations by independent observers that the security forces were complicit; in 1997, by which time discussion turned more open, the State Department's human rights report referred to "credible reports

هەوانتەو هەوەسباز. لەگەڵ ئەوەیشدا لەشرناخدا ئەوێ دەم نێزیکەی ٢٥ هەزار هاوڵاتی کورد دەژیان، کەچی حکومەت هێڵەکانی تەلەفۆنو ئاوی پچڕانو قەدەغەی هاموشۆی هاوڵاتیانی سەپاند. لەئاکامدا ٢٢ هاوڵاتی شارۆچکەکە کوژرانو زیاد لە ٪٧٠ی ماڵو حاڵی شارۆچکەکە وێران کرا. هەر بۆیە لەماوەی چەند رۆژێکی کەمدا هەزاران هاوڵاتی ماڵ بەکۆڵ سەرگەردان بوونو هەڵهاتن، بەجۆرێك لاشەی ٥ زارۆ بەمردوویی‌و بێ نازیی لەدووی کۆچی وان بەجێما[٢٠٢].

هەریەك لە رۆژنامەنووسان فاروق بالیکسی‌و نامیق دورکان پێش ئەوەی گەمارۆی سەر رۆژنامەنووسان هەڵگیرێت، توانیبوویان دزە بکەنە نێو شارۆچکەی شرناخەودو راستی رووداوەکان رووماڵ بکەن. ئەوان دەگێڕنەوە کە چۆن منداڵێك ٤ ساڵە لەنێو تەرمی کوژراوەکاندا و لە راڕەوی نەخۆشخانەکاندا کەوتبوو.

ئەوان بەمجۆرە رووداوەکان باس دەکەن: "تەرمی کوڕێکی هەشت ساڵان لەوێ بوو. نیوەی شەویلگەی نەمابوو، هەروەها کونێك بەئەندازەی مستێك لە قورگیدا بوو، ئەو چاوەکانی بەکراوەیی مابوونەوە. هەروەها هەر بەتەنیشت ئەوەوە خوشکە تەمەن ١٢ ساڵانەکەی کەوتبوو، بەجۆرێك کە قژە رەشەکانی تەخشانکرابوون". فاروف بلیکی دەڵێ: "هەرچەنم دەکرد نەمدەتوانی تەماشای زوومی کامێراکەم بکەم، ئاخر چاوەکانم پڕیبوون لە فرمێسكو هەموو شتەکانم تەماوی دەبینی"[٢٠٣]. هەروەها دەگێڕنەوە: "کە لەلایەکیتری نەخۆشخانەکەدا باوکێك دەبینرا کە کیژۆڵە سێ ساڵانەکەی لەئامێزگرتبوو. کیژەکە بەسەختی بریندارببوو، بابی بەکوڵ دەپاڕایەوە لەخودا سابەڵکو زارۆکەی لێنەسێنێت. ئەوە لەکاتێکدا بوو کە دەستی خانمەکەیشی گرتبوو، ئەویش لەنێو خوێنی لاشەی بیماریدا دەتلایەوە".

---

[202] Three soldiers and one policeman were killed in the first night; sub"
sequently, another 60 civilians also were wounded. For figures and eyewit"
ness accounts, see THRR (1992), 27 – 35. See also Imset, the PKK, 286 – 298, who noted that Turkish tanks moved into the city's downtown

[203] Balikci and Durukan, Olumun Iki Yakasinda, 98.

لەبەشێکی تری گێڕانەوەکاندا دەیانگوت:"نێزیکەی کاتژمێرێك دوور لەنێوەندی شاری سعرت، لەوێ جەنجاڵییەك، کە پێك هاتبوو لە ئاوارەکانی شیرناخ دەبینرا، ئەو شوێنەی کە ماڵگەلێکی لەبلۆك دروستکراوی تێدابوو. گەنجێکی کورد لەنێو خەڵکەکەدا بەئاشکرا مشتومڕی لەو بارەیەوە دەکردو هانی خەڵکەکەی دەدا کە تێکڕا یاخی بنو رووبکەنە چیا". ئەو دوپاتیدەکردەوەو دەیگوت: لەوانەیە لەوێ ببینە شۆڕشگێڕ".

هەروەها گەنجێکی رووتەڵەی دڕاو کە لەسەر عەردێکی تەختدا کەوتبووە سەرچۆك، ئەو لەخانوێکی چەپەکی نێزیك سعرت دەژیا، یەکێك بوو لەو گەنجە دڵگەرمانەی کە ئیتر گەیشتبووە بینیو دەیگوت: "ئیتر لەوانەیە بچینە چیاو ببینە شۆڕشگێڕ". بەم وتانە برایەکی کە هەر لەو دەوروبەرابوو، سەری ئەرێنیو هاوهەڵوێستی بۆ لەقاند، چوون براکەی دەیگوت: "لەوێ هەموو شتێك بەباشی دەڕوا، لەشاخێدا هەموومان دەجەنگین، ئاخر ئەمەی کەبەسەرماندا هاتووە، کەتنی بەسەزمانیو بێ چەکیمانە"[٢٠٤].

لەشوێنانیی تر رووداوی هاوشێوە، وەلێ لەئاستێکی بەرتەسکتر رووداوگەلێکی دی روویاندا. لەوێندەر دژە هێرشەکانی ئەرتەشی تورکیا بەردەوامبوون. بۆنموونە لەسنووری شاری بوکورجا دا پاش پارتیزانییەکی پەکەکە ئیدی هێزەکانی ئاسایش پاش ٤ کاتژمێر لەو هەڵکوتانەی پەکەکە بەربوونە گیانی شارو چەندین دوکانو ماڵی باژێڕەکەیان زیانپێگەیاندو هاوکات گەنجێکی چواردە ساڵانیش بوویە قوربانی رووداوەکە[٢٠٥].

هەروەها لەرووبەڕووبوونەوەیەکی شەوێکی پێشووی نێوان گەریلاو ئەرتەش، لە ئاواییەکی نێوچەی ئاگریدا، ٢٠ گەریلاو ٥ نیزامیی کوژرابوون. هەربۆیە هێزەکانی ئاسایش بەربوونە بۆردومانی شەلم کوێرمی نێوچەکەو لەئاکامدا ٢ زارۆ کوژرانو سیانی تریش بریندارببوون. هەروەها لەشارۆچکەی کولب کە بەهاوسۆزیی بۆ پەکەکە ناسرابوون. هێزەکانی ئاسایش لەکاردانەوەی ئەوەدا کە بارهەڵگرێکی سەربازیی لەنێوەندیی

---

[204] Adapted from Aliza Marcus, "The Other Kurdish Revolt," Common" weal, Nov. 20, 1992.
[205] THRR (1992), 35–37.

شارەکەدا تەقەی لێکراوە،ئیدی دەستەچەورەکەی بەسەر هاولاتیانی ئەوێدا ساویی. هاولاتییەکی ئەو دەڤەرە دەیگوت: "حکومەت خانووەکانی ئێمەی گڕ تێبەردەد. لەکاتێکدا کە پەکەکە هەلێکوتابوویە سەریان"[٢٠٦].

دامەزراوەی مافی مرۆڤی تورکیی سەربەخۆ، کە پێوەندییەکی لەتەك پەکەکەد نەبوو، هۆشداریی ئەوەی دا کە توندوتیژییەکان وەختە متمانەی خەلکیی بە دەولەت لەقدەکات. ئەودامەزراوەیە رایگەیاند: "خەلکێك کە لە نوسەیبین‌و شرناخ‌و سعرت دەژین. پێیان وایە دەولەت هیچ حسابێك بۆ وان ناکات‌و دەیانچەوسێنێتەوە. هەربۆیە ئەو هاولاتییانە هیچ چاوەڕوانییەکیان لە دەولەتەکەی خۆیان نییە"[٢٠٧].

ئەمە ئەو شتەبوو کە بەتەواوی پەکەکە دەیهەویست. ئەوان لەو ناوچانەی کە بەهێزتر بوون تەنگیان بە رژێمی بەڕێوەبردنی ئەویَ هەلچنی بوو، تەنها باجیان لە خەلکی نەدەسەند بەلکوو ئامادەییەکی کاریگەرییان لەتەواوی لایەنەکانی ژیانی رۆژانەی خەلکید هەبوو.

لەشاری نەسیبین دا پەکەکە ئاگری بەردایە ساخت‌و سازی گەنجینەی نێوچەکەو شەقامەکانی بەتەواوی کلۆمدا، ئەوەیش لەپێناو پلانی نارەزایی دەربڕینی تەڤگەرەکەد بوو، کار گەیشتە ئەوەی کە سەرۆکی شارەوانی ئەویَ پێشنیازی دانوستان بکات لەگەل فەرماندەی هەرێمیی پەکەکەدا، وەلیَ نەیتوانی سەرانی پەکەکە رازیبکات بە دەستبەرداربوون لە شارەکە، ئیدی هەلگرتنی گەمارۆی سەر هاموشۆی نێوچەکە هەرو مایەوە.

فەرماندەی پەکەکە بەمشێوەیە باسی لە دانەدوواوەی پێشنیازی دانوستان دەکرد: "پێمان وتن بهێلن شەقامەکان هەروا شەخەلاوی‌و شار وێرانە بێت، چوون ئاو

[٢٠٦] A Kulp resident quoted in THRR (1992), 36.
[٢٠٧] THRR (1992), 26.

تانکەکان ناتوانن بێنە نێوشارەکەوە، ئێوە بەگوێتان نەکردین، بۆیە ئێمەیش ئاگرمان بەردایە بازێڕەکەو شەقامەکانمان بن بەستکردن"[208].

لەسیعرت، شارە تەپوتۆزاوییەکەی لێواری چیاکانی جودی. لەوێ گەریلاکان دادگای تایبەتیان دانابوو بۆ ئەو کەسانەی کە تۆمەتباردەکران بە هاموشۆی سەربازەکانو گواستنەوەی شتو مەکو خواردەمەنی بۆیان، هاوکات بە فرۆشتنی جۆرەکانی خواردنەوەی وەك ویسکیو جن، ئازاری رۆحیو مۆراڵی خەڵکەکەیان دەدا[209].

هەر لەو دادگایانەدا گرفتو گرێو گۆڵی هاولاتیانیان چارەدەکرد، وەك گرفتەکانی زەویو زارو بگرەو بەردەی قەرزو قۆڵەو ئەم دیاردانە. لەبەرامبەریشدا هۆشدارییان دابوویە خەڵکی ناوچەکە نەکا بۆچارەسەریی گرفتەکانیان روو لە دادگا لۆکاڵییەکانی سەر بە میریی بنێن، چوون ئەوە مانای ناسینی دەسەلاتی تورکیا بوو لە نێوچەکەدا. لە ئیدیلی هەڵکەوتوو لەباکوری خۆرئاوای سیعرت، دیسان رەوشەکە بەهەمان شێوە دەگوزەرا. بەرپرسی نێوچەکە بە رۆژنامەنوسێکی تورك بەنێوی عسمەت ئیمسەت وتبووی: "لەشەش مانگی رابردووەوە تا ئێستا تەنها داوایەکی هاولاتیانمان پێنەگەیشتووە کە دادی خۆی لەدادگا نێوچەییەکان نابێت. چوون خەڵکی زێدەتر دادگا جەماوەرییەکانی پەکەکە پەسەند دەکەنو گازاندەو گلەکانیان بۆ ئەوێ دەبەن"[210].

لەدیاریەکریش داواکاری گشتی بەلای ئازمانی فەرماندەی شۆرشگێڕەکانەوە، کە پێشتر هاوڕێو هاوپیشەبوو لەپارێزەییدا، گازاندەی ئەوەی دەکرد کە بەشێوەیەکی دراماتیکی تەواوی دۆسییەکانی میریی لەنێوچەکەدا لەکارکەوتوون.

---

[208] Quoted in "Abdullah Ocalan'in," Serbesti, Mart"Nisan 2005, 34.

[209] In 1993, after my car broke down on a remote road outside Cizre, I flagged down a passing taxi. It turned out to be a PKK"affiliated taxi that was taking a Kurdish shopkeeper to a rebel"convened trial for having ignored warnings not to sell food to a local army base. The man said he expected to be fined.

[210] Imset, the PKK, 270.

ئازمان دەیگوت: "خەڵکی ئیتر مل بۆدادگاکانو دەسەڵاتی میریی نادات، ئەوان و ـ ئێمە دەڕوانن کە زێدەتر دادوەرییو یەکسانییان بۆ فەراهەمدەهێنینو پێیان وایە ـ هێزو پێزی ئێمە کاریگەرو کاراترە لەنێوچەکەدا".

پەکەکە زیاد لە هەیمەنەی دەسەڵاتی میریی شوێنی هێزوو بازووی خۆی لە نێوچەکـ کردبوویەوە. ئەوان کوردانیان بەکاردەهێنا لە بواری پێداچوونەوە بە گرفتەکاندا؛ لەو ـ پەنایان دەبردە بەر سەرۆك هۆزو کەسەدیارەکانو خاوەن زەمینە زەنگینەکان ـ هاریکاریانبن لەچارەی گرفتەکانی پەیوەست بەخەڵو بڕیاردان لەسەر ناکۆکییەباوەکـ دیکەی کۆمەڵگەی کوردەواریی. هەربۆیە لەو نێوچانەدا کە پەکەکە تێیاندا باڵادەستبوو هاوڵاتیان بەتەواوی پشتقایم بوون بە شۆڕشگێڕەکانو هیچ ئاتاجێکیان بە میریی نەبوو دیارە کە ئەوەیش پێداگریکردنە لەسەر راستییەکە کە جەنگی چەکداریی چ گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی لەنێوچەکەدا هێنابوویە گۆڕێ. ئەمەیش فرەبەسانایی دەتوانین بڵێین هۆکاری ئەوەبوو کە پەکەکە لەڕێگەی هێزەوە خۆی سەلماندبوو لەنێوچەکەدا، هۆکارێکی دیکە ئەوە بوو کە شۆڕشگێڕەکان وا تەماشادەکران کە نوێنەری راستەقینەی بەرژەوەندییە باڵاکانی خەڵکن لە نێوچەکەدا.

سەرانی پەکەکەو گەریلاکان ئێجگار شوێن متمانەو رێزگیراو بوون، تەنانەت زیاتر لەو رەمزە دیارو تەقلیدیو سوننەتیانەی نێوچەکەیش رێزیان لێدەگیرا کە هیچ پێوەندییەکیشیان بە میرییەوە نەبوو، چوون ئەوان تا ئەوکات نومایانی ناشۆڕشگێڕیو دوور لە هەستی نەتەوەیی بوونو داخی شکستی راپەڕینو رابوونە نەتەوەییەکە لەئەستۆیاندا بوو.

ئەزمان دەیگوت: "کەڕەتێکیان کیژە لازێك کە شوی بە کوڕە کوردێ کردبوون شکایەتی ئەوەی کردبوو کە بەدەست تێهەڵدانی هاوسەرەکەیەوە وڕو یاس بووە. کیژەکە لە نامەیەکد ئێمەی لە رەوشی ژیانی ئاگادارکردەوە، هەربۆیە ئێمەیش کەسێکی خۆمان نارد بۆ گیانی کابراو تێر سەرکۆنەی کردو هەڕەشەی ئێمەی پێگەیاند". ئەزمان لەدرێژەی وتەکانیدا

شانەکانی هەڵتەکاندو گوتی: "پاش ماوەیەك نامەی سوپاسگوزاری کیژەکەمان پێگەیشتو گتبووی کە گرفتەکەی چارەسەرکراوەو شووەکەی بووە بەماسی مەییو".

ئاستی دەسەلأتو دەستڕۆیشتوویی پەکەکە لەنێوچەکەدا بەڕادەیەك بەهێزبوو کە هەندێك لە چەکدارو فەرماندەکان پێشنیازی ئەوەیان دەکرد کە ئیتر کاتی ئەوە هاتووە راپەڕینێکی سەرتاسەری دەستپێبکەن.

فەرماندەی پەکەکە سەعید کوروك کایا دەیگوت:"رەوشەکە دەوڵەتی لە دەسەلأتی خۆی دابڕاندبوو، ئیدی دەوڵەت نەیدەتوانی بۆ هەتایە بەم نەزمە ئیدارەبکات". ناوبراو باشتر بە دکتۆر سولەیمان ناسرابوو، ئەو کەمێك لە تیۆرەکانی ماوی تێکەڵ بە دیدو قوڵبوونەوەی خۆی کردبوو

لەم بارەیەوە دەیگوت: "یان پاشەکشەدەکەین لەم رەوشە، یاخۆ هەنگاوی داهاتوومان دەبێت ستراتیژی هێرش‌و هێز بێت".

## دووان دەربارەی راپەڕین

راپەڕینی هەمەلایەنەی خەڵکی کوردستانی ئێراق، جۆش‌و خرۆشی کاریگەرییەکانیی، فەرماندەکانی پەکەکە گەرمکردبوو. لەدەستپێکی ۱۹۹۱ دا پاش ئەوەی هێزە هاوپەیمانەکان بەرێبەرایەتی ئەمریکا توانیان ئەرتەشی ئێراق لە کووەیت دا پاشەکشە پێبکەن، ئیدی کوردانی ئێراقیش توانیان راپەڕینی سەراسەریی دەستپێبکەن. کوردەکان لەو باوەڕەدا بوون کە دەتوانن پشتیوانی ئەمەریکا لە زەمینە سازیی بۆ دەستکەوتەکانیان بەدەستبهێنن. ئەوە پاش ئەوە هات کە جۆرج بۆشی باوك داوای لەگەلی ئێراق کردبوو کە خۆیان لە دیکتاتۆرییەت قوتار بکەن. وەلێ ئەمەریکا فرە نیگەران‌و قەڵس بوو لەبەرامبەر هاوپەیمانەکانی بەتایبەت تورکیا. چوون تورکیا لەتەنینەوەی ئاگری جودایی ئەترسا بۆنێو کوردەکانی خۆیشی. هاوکات دەوڵەتانی دیکەی هەرێمەکە بە جدیی نیگەرانی هەلومەرجێك بوون گەر بێت‌و ئێراق دابەشبێت بۆ چەند دەوڵەتۆچکەیەکی لێك دابڕاو.

لەئاکامی ئەم نیگەرانییەدا هەریەك لە ئەمەریکاو هێزەکانی هاوپەیمانان لێگەڕان تا هێزەکانی ئێراق بەکامی دڵیان‌و بە دڕندانەترین شێوە دژە هێرشەکانیان بۆ سەر کوردان دەست پێبکەن، لەئاکامدا نێزیکەی دوو ملیۆن هاوڵاتی کورد لە زێدی خۆیان هەڵهاتن‌و بوونە پەنابەر لە ئێران‌و تورکیادا. لەراستیدا وێنە شەلاڵ‌و شەکەتەکانی خەڵکی ئاوارەو دەربەدەر، لەوان زارۆگەلی ساواو برسیی‌و خەڵکی پەشۆکاو بەدامێنی چیاکاندا، شیمانەی ئەوەی دەکرد بۆ هەوەڵجار بایەخێکی نێونەتەوەیی لەمەڕ دۆزی کورد بهێنێتە دەنگ. وەلێ بەداخ‌و کەسەرێکی فرەوە ئەم رەوشە بۆ نێو کوردانی تورکیاو تەنگ‌و چەڵەمەکانیان درێژنەبوویەوە.

هەرچەند ئەنکەرە هیچ دڵخۆش نەبوو بە لێشاوی ئاوارەکانی کورد بۆ نێو خاکەکەی. بەهەمان ئەندازەیش لەو سەرنج‌و بایەخە نێونەتەوەییە لە سەر کوردانی ئێراق توڕەو نیگەران بوو. هەربۆیە ئەنکەرە بەزوویی پشتیوانی لە چێکردنی سنورێکی دابڕاو و پەنایەکی سەلامەت بۆ کوردان کرد تا بگەڕێنەوە نێو ولاتی خۆیان‌و لەسەر ئێشەیان بەدوور بێت[٢١١]. تورکیا وا وێنای رەوشەکەی دەکرد کە نێوچەیەکی کاتی لەسنوورەکانی باکوری ئێراق بێت‌و فرە درێژە نەکێشێت، وەلێ بۆ کوردانی ئێراق نێوچەکە بوویە بنەوانێکی باش‌و زیاد لەوەیان چنگ کەوت کە ئەنکەرە شیمانەی کردبوو.

ناوچە پارێزراوەکە زۆرترینی هەرێمی کوردستانی دەگرتەوە، لەو هەرێمەدا هێزەکانی ئێراق بۆیان نەبوو جارێکی تر بێنە ناوەوە، ئەمەیش خۆی لەخۆیدا جۆرێك لە خۆبەڕێوەبەری بۆ کوردەکانی ئەوێ کردە ئەمرێکی واقعیی. هەربۆیە بەزوویی کوردانی ئێراق کەوتوونە ئامادەباشی بۆ هەڵبژاردنێکی نێوخۆیی لە مانگی ٥ی ١٩٩٢ دا.

لێرەوە بەشێك لە فەرماندەکانی یەکەکە وای بۆدەچوون گەر لە راپەڕینێکی هەمەلایەنەشدا شکست بهێنن، ئەوا دەکرێت هەر دەرفەتێك بێت بۆ سەرکەوتن، ئەگەر

---

[211] For details see Kirisci and Winrow, Kurdish Question, 157–161.

بێتو وەك كوردانی ئێراق ناوچەیەكی ئارامیان بە بڕیارێكی نێونەتەوەیی بۆ فەراهەم بكرێت.

لەم بارەیەوە دكتۆر سولەیمان دەیوت: "یان دەسەلأت لەنێودەستماندا نامێنێت، یاخۆ كێشەكەمان دەكەینە دۆزێكی نێونەتەوەیی مەزن ".

پەكەكە لەو قۆناغەدا دارای ١٠,٠٠٠ هێزی چەكداربوونو بانگەشەی ئەوەشیان دەكرد كە نزیكەی ٦٠,٠٠٠ هێزی مەدەنییان لەشارەكاندا هەیە، ئەمەیش خۆی لەخۆیدا ٣/٢ی تەواوی هێزەكانی تورك دەبوون(بێجگە لە پۆلیس، هێزە تایبەتەكان، گوندپارێزەكان) كە لە نێوچەكەدا جێگیر ببوون[٢١٢].

گەرچی رەنگە زێدەڕۆییەك لە ژمارەو سەنگی چەكدارەكاندا كرابێت، وەلێ شۆڕشگێڕەكان لەسەر ئەوە كۆك بوون كە زیاتر لەنێوەی خەڵكیی هاوسۆزیان بوونو زۆرینەی ئەوانەیش چەكدارو چەك بەدەستبوون. هەربۆیە گریمانەی ئەوە دەكرا هەر راپەڕینێكی بەردەوام لە سەرنجو سەنای ئەوخەڵكەدا بەباشی پشتیوانی دەكرا، گەرچی ئامادەكارییەكانی هێزە ئاسایشییەكانی توركیش باشتربوونایە، ئەوا دەتوانرا خاڵی ئامانج جەختی لەبارەوە بكرێتەوە.

لەمانگی دووی ١٩٩٢ شۆرشگێڕانی پەكەكە لە شارۆچكەی كوڵیی دەرێی پارێزگەی ئامەد گردبوونەوە بۆ سازدانی كۆبوونەوەیەك لەبارەگای سەركردایەتی حزبەكەیان. شەمدین (زەكی) سكیك، كە فەرماندەی پەكەكە بوو بۆ ئەو پارێزگایە، سەرپەرستی كۆبوونەوەكەی خرایە ئەستۆ. وەك هەموو ئەوانی تر سكیكیش وادیاربوو وابڕدەكاتەوە كە ئیتر كاتی ئەوەهاتووە دەستگرۆیی خەڵك بكەنو هانیاندەن بۆ راپەڕینێكی بەردەوامو سەرتاسەریی لەتەواوی نێوچەكەدا.

---

[212] The usual number of Turkish troops was about 90,000. By June 1994 the number rose to 160,000. Figures come from Kirisci and Winrow, Kurdish Question, 130.

بەدڵنیاییەوە ئۆجەلان هێند قسەی کردبوو کە باوەڕی تەواو لەی هەمووان گەلاڵە بکات، کە بەڵێ ڕاپەڕین ئامانجە روون و رەوانەکەی گەریلاکانە.

وەلێ مشتومڕەکانی بارەگای سەرکردایەتی کولپ، هێند بۆی دانەچوو. ئیدی بەشداربووان هەرزوو لەو راستییە گەیشتن کە ئۆجەلان پێشوەخت بڕیاری خۆی لەمەڕ جەنگە گەریلاییەکەی قۆناغی داهاتوو دابوو(ئەو بێ پێچ و پەنا دیدگای خۆی لەمەڕ پرسەکە بۆ فەرماندە سەربازییەکان خستبووە ڕوو). هەربۆیە لەجیاتی هاندان و پشتیوانی لە راپەڕینی سەراسەریی، کە بەسروشتی حاڵ تەواوی رەوشەکە لەژێر کۆنترۆڵی پەکەکەدا نەبوو. هەربۆیە ئۆجەلان خواستی ئەوەی لەمەڕگدا بوو کە خۆیەکلایی بکەنەوە بۆ گێردانی خەڵك تاپەیوەندیی بکەن بەپەکەکەوە یاخۆ راستەوخۆ پشتیوانی لە خەباتی گەریلایی پەکەکە بکەن نەك راپەڕین.

سیفتسی کە لە گردبوونەوەکەدا ئامادەیی هەبوو، پێمانی گوت:"واتە بەگوێرەی ئۆجەلان گرنگترین شتێك کە لەو ساتەدا بیکەن راپەڕین نەبوو، بەڵکوو، بونیادی سوپایەکی چەکداری تۆکمەبوو، تا لە چیاکانەوە جەنگ لەگەڵ سوپای تورکیا دەستپێبکەن".

هەمان مشتومڕو دیبەیت لە چوار لە پارێزگاکانی تر لەمەڕ ئەو بابەتە هاتبووە ئاراوە.

دکتۆر سولەیمان دەیگوت: "پەکەکە پێ و پایەی لەرووی ئاسایشییەوە فرە ئارام بوو. تەنها کەمێك ماتڵبوون بۆ رەخسانی زەمینەیەکی باشتر، گرفتێکی بۆیان نەتاشیبوو. هەربۆیە هەمووماں ئەو مافەمان بەبڕیارێکی وەها دەدا".

وەلێ وا بەردیدە دەکەوت کە خەڵکیی بۆخۆیان گەلاڵەی راپەڕین و سەوداسەری ئازادی ببوون، هەر بۆیە ئەو سەری ساڵی کوردییەو بۆنەی نەورۆز، بەبەراورد بەوانەی لەرابردوودا ئەزموونکرابوون، بە توندوتیژترین بۆنەی ساڵ دەهاتە ئەژماردن. سەرەتا لە شاروشارۆچکە کوردییەکاندا بۆنەکان برانە نێوشەقامەکان و بەتەواوی رەوشی یادەوەری و ئاهەنگەکان بوونە خۆپیشاندانێکی نەتەوەیی. زارۆو جەوان، ژن و پیاگی دەڤەرەکە بەتانەو تەشەرەوە رووبەڕووی هێزە ئاسایشییەکان بوونەوەو دیمەنی تورەیی لەچاوی

هەوادارانی پەکەکە دەخوێنرایەوەو دروشمەکانی وانیان بەرزکردبوویەوە. لەهەندێك لە شوێنەکاندا هاولاَتیانی چەك بەدەستی پشتیوانو هاوسۆزی پەکەکە تەقەیان لە هێزە ئاسایشییەکانو پۆلیس دەکرد. توندوتیژییەکانو پێکدادان بۆ چەند رۆژێك درێژەی هەبوو. نێزیکەی ٩٠ هاولاَتی کە بەشێوەیەکی سەرەکی هاولاَتی مەدەنی بوون، لەو بگرەو بەردانەدا کوژران[٢١٣].

وەلێ ئۆجەلان بەهیچ کلۆجێك رێگەی نەدا خۆپیشاندانەکان سەربکێشن بۆ راپەرینێکی سەرتاسەریی هاوشێوەی راپەرینی فەلەستینییەکانی کۆتایی هەشتاکان. هەر بۆیە وردەوردە جۆشو خرۆشو کەفوکوڵی خەڵکی نیشتەوە، تا دوواجار بەتەواوی رەوشەکە خامۆشکرا.

دکتۆر سولەیمان دەیگوت: "پرۆگرامێکی رۆشنمان لە نەورۆزدا پێنەبوو. راستە گەرەکمان بوو خەڵکی بەشداریی لە بۆنەی نەورۆز بکەن، وەلێ نە رەوشەکە بگەیەننە راپەرینی سەرتاسەریی. چوون گەر ئەوەمان گەرەکبووایە، ئەوا هەر لەسەرەتاوە هۆشداریمان پێدەدان کە تەواوی چەکەکانیان بهێننە گۆڕێو مەیدانەکە بشلەقێنن".

دوواتر هەندێك لەبەرپرسانی بالاَی پەکەکە ئەو پرسیارەیان لا گەلاَڵەببوو، هۆی چی بوو ئۆجەلان لەنیوەی هەوەڵی نەوەدەکاندا ملی نەدەدا بۆ راپەرینێکی جەماوەری لەهەرێمەکەدا. هەندێك ببوویە مەراقیان، ئایا ئۆجەلان لەوەدەترسا سوریا لەدەستبداتو ئاوارەبوونی ملیۆنان کورد بۆ نێوسنوورەکانی سوریا تەحەمولنەکات؟، ئەوە خاڵی سەرەکیی مەنگیی ئۆجەلان بوو، بێ گومان پێشهاتێکی وەها سوریای لە کۆنترۆڵی چاودێریی سنورەکانی دەترازاندو بۆچونێکی نێونەتەوەیی نوێو ئاماژەیەکی جدی بۆ دۆزی کورد دەستەبەردەکرا. یاخۆ هەندێك واگومانیان دەبرد کە ئۆجەلان لەو راستییە ئاگادارکرابێتەوە گەر بێتو راپەرینێکی جەماوەری فراوان روویدات، ئەوا دوور نییە جەنگە گەریلاییەکە لەژێر کۆنترۆڵی راستەوخۆی ئەو دەربچێت. هەربۆیە راپەرینی

213 THRR (1992), 20–27.

جەماوەریی بەردەوام، ئیتر توندوتیژبووایە یان شلگیر، ئەوا دەکرا ببێتە هۆی دەرکەوتنی رەگەزو رەنگی نوێ لە گۆڕەپانی شۆرشگێڕیداو ئەمەیش بەجۆرێك لە جۆرەکان تاکرەویی پەکەکەی پەکدەخستو رەنگو بۆی فرەو جیاوازو فرە ساحێب سەریهەڵدەدا.

سەرچاوە فەرمییەکانی ئەرتەشی پەکەکە جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە پێویستە جەنگی گەریلاییو راپەرین تەنها لەپەکەکەوە ئاڕاستە بکرێتو لەنێو دەستانی ئۆجەلاندا رەوشەکە هێزی وەبەربدرێت. ئەزمان دەیگوت: "پەکەکە دژ بە هەر جموجوڵێك بوو کە لەدەرێی دەسەڵاتیدا بێت. بەڵام گرفتی راستەقینە ئەوەبوو، پرۆگرامیان چی بوو؟ ئەدی ئامانج؟ چوون بەبێ ستراتیژێکی رۆشن، تاکتیکەکان نەدەکرا سەر ڕاستو دەقیق بن".

ئۆجەلان هەمیشە دارای باوەڕێکی پتەو بوو بە پلانو بەرنامەکانی، ئەو بەردەوام وادەردەکەوت باوەڕی بە پڕوپاگەندەو پێشنیازەکانی خۆی هەیە. هەربۆیە ئەو قایلکرابوو بە توانای هێزو بازووی گەریلاکانو پێی وابوو، دەتوانن بەرەو سەرکەوتن پلانەکانیان ئاڕاستە بکەن. لەمسۆنگەیەوە هیچ هۆیەکی بۆ راپەڕینێکی جەماوەریی نەدەبینییەوە. ئەو لەلایەکەوە باوەڕی وابوو کە هێند هێزی سەربازیی لەژێر رکێفیدایە کە چۆك بە ئەرتەشی تورکیا دابدات، لەلایەکی تریشەوە دارای متمانەیەك بوو بە هێزەکانی کە دەتوانن ئەرتەشو حکومەت والێبکەن، واز لە توندوتیژی بهێننو پەنابەرنە بەر دانوستانو ئاگربەست. لەراستیدا شیکردنەوەکانی ئۆجەلانیش بۆ رەوشەکە وەختێکی فرەی بەهەدەردا، واگریمان دەکرا رەوشەکە هێمن بێت، بەڵام نە ئەرتەشی تورك کەڵکی لەهەڵەکانی وەرگرت، وە نەیش ئۆجەلان هیچی پێکرا.

## سپۆنسەری جەنگ

جەنگی گەریلایی لە ئاواییە دوورە دەستەکانی باشوری رۆژهەلاتو هەموو ئەو کارە رێکخراوەییانەی نێو شارە مەزنەکانی تورکیا وا پێشبینیدەکران کە بۆخۆیان سەرچاوەی دارایی بدۆزنەوە. چالاکییەکانی پەکەکە لەشارەکاندا لەلایەن چالاکوانانەوە بەجۆرێك

مەیسەر دەبوون کە بۆ خۆیان دارای ئیش گەلێك بوون کە یاریدەی جولانەوەکەی دەدا، وەلێ گەریلاکان لەچیا پێویستییان بە پارەو شتو مەك هەبوو، کە راستەو خۆ کەسەکان یاخۆ بزنسمانەکان بۆیان کۆدەکردنەوە. ئامانج تەنها هێنانی پارە نەبوو لەو کەسانەوە، تاوەکو پێداویستی چەكو چۆلو پۆشاكو خۆراك دابین بکەن. بەلکو دیوێکی تری رامیاریی دارایی پەکەکە بریتی بوو لە نیشاندانی تواناو هێز.

ئەیهان سیفتسی دەیوت: "ئامانجمان ئەوەبوو، دەولەت بتوانێت چی بکات، ئێمەیش دەتوانین. ئەوان لە رۆژدا بوونی خۆیان دەسەپاند، ئێمەیش لەشەواندا، بەم نەزمە دەبوو بەشداربین لە دەسەلاتداریێتی ناوچەکەدا". ناوبراو ناسرابوو بە کوچوك زەکی. ئەو جەنگاوەرێکی ئێجگار وردو وریابوو، لەدەستپێکی ١٩٩٤ دا بوویە فەرماندەی پارێزگای ئەرزرۆم، ئەوەیش بەرزترین پلەبوو گەر یەکێك ویستبێتی پێی بگات لەناو تەڤگەرەکەدا. ناوبراو لە درێژەی دیدارەکەمدا پێمی وت: " گەر میریی باجی بسەندایە، پێویستبوو ئێمەیش باج بسێنین".

بیرۆکەی سەندنی باج لەخەلکی نوێ نەبوو. پلانی ستاندنی باج لە کۆنگرەی سێهەمی سالی ١٩٨٦ وە راگەیەنرابوو. بەلام لەوکاتەدا تەڤگەرەکە هێند بەهێز نەبوو تا برێکی وا پولو پارە بسێنێت کە لەئاستی پێویستدا بێت. وەلێ رەوشەکەی ئەوکات گۆرانکاری بەسەردا هات. لە ئێستادا تۆری پشتیوانی لەپەکەکە ئێجگار بەرینو فراوانەو داواکارییەکانیان لە ساندنی باجو کۆمەك ئێجگار کەم دەدرێتە دوواوەو فرە بەرێکخراوەیی کاریی تەمویلی پەکەکە لەسەر بنەمای رامیارییەکی سەرکەوتوو بەرێوە دەچێت.

هاوکات بەشێك لەو خەلکەی کە دەیانەویست ببەخشن، واهەستیان دەکرد کە بەتۆپزی لێیان دەسەنرێت، بەشێکی تر پێیان وابوو بەخشین لەپێناو شۆرشگێراندا هەستێکە بۆ سەرکەوتنو دەستەبەری مافەکانی کورد، پێویستە بەوان بدرێت نەك بەدەولەت، دەولەتێك کە مافەنەتەوەییەکانی بندەستکردووە. یەکێك لەخاوەن زەوییە زەنگینەکانی دیاربەکرو سەردارەکانی ئەوێ بۆمانی باسکرد: "جارێکیان شۆرشگێرەکان

هاتن داوای ئاردیان دەکرد. لەهەمان کاتدا میریی داوای جەوانی کوردیان دەکرد تا ببنە چەکدارو جەنگی پەکەکەیانی پێبکەن. دیارە کە لەم هاوکێشەیەدا شۆرشگێڕەکا هاوسۆزتربوون".

لە شارۆچکە گچکەکاندا بەتایبەت لەو شارۆچکانەی کە پەکەکە دەستی دەشک بەسەر کۆنترۆلکردنیاندا، بارەگای نیمچە جێگیریان هەبوو، لەوێدا هەولیاندەدا پارەو پو لە زەنگینو دەسەلاتدارانی شارەوانیو کۆمپانیاکان بسێنن. یەکێك لە فەرماندەکانی پەکەکە باسی لەوە دەکرد کە رێژەی ٪١٠ی باجی بەسەر شارۆچکەی کولپی باکوری دیاربەکر سەپاندبوو.

هاوکات گەریلاکانیش مانگی جارێك یاخۆ جەند جارێك لەمانگێکدا دەهاتنە نێوچەکەو پارەو پولەکەیان بەرەو چیاکان بەشێوەی کاش دەبرد. دکتۆر سولەیمان بەکەمێك لە شانازیی بەخۆکردنەوە گوتی: "بەدەر لە فەرماندەی بارەگا سەربازییەکان، ئیدی هەموو کەسێك لە ئاستی بەرپرسیارانی خواریٚ دەبوو باج بداتە حزبەکەی". وەلیٚ کاتێك کە هەست دەکرا زەنگینە کوردەکان پارەو پولٚ وەك باج دەدەنە پەکەکەو بەنەزمێکی رێكو پێك گرفتێك نایەتە پێش، ئیدی کاریگەرو پالەو هەژارەکانی کورد ناچار نەدەکران پارەو باج بدەن.

یەکێك لە شۆرشگێڕەکان دەیگوت: "رامیارییەکی ئەوتۆ نەبوو تا پارە لە تاکەکانی کۆمەلگە بسێنین، وەلیٚ گەر یەکێك دارای دوکانو کانتینێك بووایە ئەوە رەوشەکە جیاوازتر بوو بۆی".

پێوەیستە ئەوە روونو رەوان بێت کە پەکەکە هێند هێزی هەبوو کە بەکامی دلی خۆی بتوانێت پارەو باج لە هەموو کەسێك بسێنێت، وەلیٚ ئەو رامیارییەی بەو بەرینییە بە پێویست نەدەزانی. چوون ئەوان هێند پارەی پێویستیان لە دەستاندا بوو کە بۆ چالاکیو بەرێوەچوونیان ئاتاجیان بە زێدەتر لەوە نەبوو. سەعید کوچوك زەکی دەیگوت: "هەرگیز ئەوە بەمێشکماندا نەدەهات". ئەمەیش لەسەر بنەمای ئەو راستییە سەرچاوەی گرتبوو کە خواستی پەکەکە بۆ ستاندنی داهات لە تاکەکانی کۆمەلگەو بازرگانە

بچووکەکان پێویستە سنورداربێت، چوون پەکەکە لەو راستییە گەیشتبوو کە خەڵکی نەدارو برسین‌و تەنانەت بازرگانە بچووکەکانی کۆمەڵگەکەشیان مانگانەیان زیاتر لە چەند سەد دۆلارێك نییە.

بۆنموونە پارێزگایەکی وەك ئامەند کە فراوانترین‌و زەنگینترین نێوچە بوو کە پەکەکە دەستی بۆ بەرێت، ساڵانە نێزیکەی یەك ملیۆن دۆلاری وەك باج لێهەڵئەکراند. لە راستیدا ئەوە برێکی باش بوو، وەلێ هێند مەزن‌و زەبەلاح نەبوو. کوجوك زەکی بە شۆخییەکەوە دەیگوت: "ئێمە حسابی میریشمان کردبوو، نەدەبوو باج لەهەموو کەسێك بسێنین، ئاخر رەوشەکە بۆ پرۆسەی سەندنی باج لەلایەن میرییەوە دژوار دەبوو"[214].

زۆرینەی زۆری باج‌و پارەکان لەلایەن کۆمپانیاکانی کەرتی تایبەتەوە گرد دەکرایەوە، ئەو کۆمپانیایانەی کە میریی بەکرێی گرتبوون بۆ خاسکردنەوەی رێگەو بانەکان‌و کێشانی بۆریی‌و تۆڕەکانی کارەباو بونیادیی باڵەخانەکان. هاوکات کۆمپانیاکانی سەر بەمیریش کە تایبەت بوون بە کاروبارەکانی سیانە، ئەوانیش پارەیان لێوەردەگیرا. ئیدی ئەو پارەو پوڵەی کە وەردەگیرا دەبوویە دەفعی بەلاو لەبەرانبەردا رێگەیان پێدەدرا کارکەن‌و هێرشیان نەدەکرایە سەر یاخۆ ئامێرەکانیان نەدەتەقێنرانەوە. یەکێك لە خاوەنکارە سەرکەوتووەکان لەئەنکەرە دەیگوت: "کاتێك ویستم قوتابخانەیەك لە ئاواییەکەمان لە باشووری رۆژئاوا بونیاد بنێم، سەرکاری کارەکە داوای پوڵێکی فرەتری دەکرد. چوون حسابی ئەو برەی دەکرد کە پێویست بوو بیداتە گەریلاکان، ئەگەر نا تەواوی ئامێرەکان یاخۆ خودی بیناکەیان دەتەقاندەوە".

لەتەواوی ئەو نێوچانەی کە شۆڕشگێڕەکان تێیدا بەهێزبوون، کۆمپانیا نێوخۆییەکان بۆ هەر پرۆژەیەك، پێشتر لەگەڵ گەریلاکان‌و فەرماندەکانی پەکەکەدا هاتنە رێککەوتن، ئەوجا میرییان لەسەر دەستپێکردنی پرۆژەکەیان ئاگاداردەکردەوە.

---

214 In addition to interviews with former PKK militants and Kurdish civilians who gave money or goods, published sources include Barkey and Fuller, Turkey's Kurdish, 29–34; Ozcan, PKK, 188–189; THRR (1993), 68–71; and Imset, the PKK, 201–210.

هەندێك جار شۆڕشگێڕەکان، پەیمانکارەکانیان لەهەر پرۆژەیەکی نەخو...
ئاگاداردەکردەوە، بۆنموونە گەر بیانویستایە، بنکەیەکی پۆلیس یاخۆ ڕێگەیەك ...
بکەن کە ئەرتەشی تورك نیازی پێی هەبێت. یاخود زۆرجار لەگرێبەستەکاندا ٪٠...
کرێو تێچوونەکانی موزایەدەکە بۆ گەریلاکان تەرخاندەکرا. هاوکات هەمیشەیش ...
پەیمانکارانە لە موزایەدەکاندا گرەویاندەبردەوە کە پێشوەخت بەڵێیان لەلایە...
گەریلاکانەوە بۆ کرابوو.

یەکێك لەفەرماندەکانی پەکەکە دەیگوت: "هەندێکجار کارێکی وەها هەروا ...
نەبوو". وەلێ یەکێکی دییان دەیگوت: "ئێمە دارای چەك بووینو بەتۆپزی ئەوە...
بمانویستایە دەمانکرد".

یەکێکیتر لە هەرە قازانجە گرنگەکانی سەرچاوەی دارایی پەکەکە بریتی بوو لە کاری
قاچاخچێتی لەنێوان سنوورەکانی هەریەك لە ئێران، ئێراق، تورکیاو لەتەك گەلێ لەگروپە
کوردییەکانی تر لەنێوچەکەدا، بۆنموونە کوردانی ئێراق. ئەو بارهەڵگرانەی کە دەهاتنە
سنوورەکانی تورکیا، لە شوێنی تێپەڕبوونیاندا بە خاڵی پشکنینی گەریلاکان، کە بۆ
ستاندنی گومرك دانرابوون، بەشێکی بەرچاو لەداهاتی پەکەکەیان پێهەڵدەسوڕاند.

ساری باران دەیگوت:"ئێمە پارەمان لەو قاچاخچییانە وەردەگرت کە شمەکەکانیان
لەناوچەکانی ژێر دەسەلاتی ئێمەوە ئاودیو دەکرد". ناوبراو لە نەوەدەکاندا وەك
فەرماندەیەك لەنێوچەی هەکاریی هەڵسوڕاوێکی زرنگی پەکەکە بوو. ئەو لەوبارەیەوە
زیاتر روونکردنەوەی دەداو دەیگوت: "سەبارەت بەوانەی کە قاچاخچی ئاژەڵ بوون، بۆ
هەر مێگەلێك ٪٣ی ئاژەڵەکانمان وەك باج جیادەکردەوە. هەندێکجار دەمانخواردن یاخۆ
زۆرجار دەمانفرۆشتنەوە پێیان".

یەکێك لە بەرپرسەباڵاکانی پێشووی نێوچە سنووریەکە دەیگوت:"نهێنییەکی کراوە لە
گۆڕێدا بوو، ئەویش ئەوەبوو کە بەشێك لە کوردانی تورکیە گلابوون لە قاچاخچێتی مادە
هۆشبەرەکان بەتایبەتی هیرۆیین، ئەم مادانە لە ئێرانەوە ئاودیوی تورکییە دەکرانو
لەوێشەوە دەبرانە ئەوروپا. دیاردەکە لە هەشتاکاندا تەواو رەونەقی سەندبوو".

ئەوکات بازرگانی مادە هۆشبەرەکان ببویە دیاردە، کوردەکان لە سۆنگەی باوەڕبوونیان بە پەکەکەوە زەمینەیان بۆ رەخسابوو، یاخۆ پێیان وابوو ئەوە سەرچاوەیەکی ئێجگار باشی بەدەستهێنانی پارەو پوڵەو پەکەکەیان لەداهاتی قازانج بێبەش نەدەکرد.

هاوکات بەشێك لەهەوادارانی پەکەکە لە ئەورووپادا پێگەو شوێنی خۆیان بەکاردەهێنا بۆ بازرگانیکردن بە دەرمانەوە، ئەمانە بەشێك لە قازانجەکانیان دەدایە گەریلاکان‌و گەریلاکانیش هیچ کات ڕاڕا نەبوون لە نێزیکبوونەوە لەو کەسانەی کە مژوڵی مەوادو مادەی هۆشبەر بوون. هەرچەند کە ئەوە نەدەنوێنرا کە پەکەکە وەك ڕێکخراوێك قەسدی بێت یاخۆ ڕاستەوخۆ بازرگانی بەمەوادو بەرهەمەکانییەوە بکات[215]. کوجوك زەکی پێداگری لەسەر ئەوەدەکردو دەیگوت: "پەکەکە ڕاستەوخۆ نەگلابوو لە بازرگانی مەوادەوە. وەڵێ وەك ئەوەی ئەندامانی خوارێ لەمەڕ پەکەکە دەیانوت، فلاَن پارەیەکی فرەی دەبەخشییە تەڤگەرەکە تا ڕۆژنامەکەمان دەربچێت، هاوکات فلاَن پارەی دەدا بۆ هەر شتێك کە پەکەکە ئاتاجی پێی هەبوو، لەکاتێکدا باشیش دەیانزانی ئەو پوڵو دراوە لە کوێوە بەدەست هاتووە".

لەراستیدا زۆرترینی گەریلاکان، ئەو نەزمی بەدەستهێنانی داهاتەیان وەك پێداویستییەك‌و وەك ڕێگەیەکی تر لە برەودان بەخەباتەکەیان دەبینی.

پارەشتێك بوو لەرێیەوە دەتتوانی شتانێك بەدەستبهێنی کە لەجەنگە گەریلاییەکەدا پێویستت پێی هەبوو. نەوال دەیگوت: "پارە لەژیانی تایبەتماندا بایەخی نەبوو، بایەخێکی ئەوتۆشمان بۆ پارە دا نەدەنا، تەنها وەك وەسیلەیەك بۆ بەردەوامیی جەنگەکەمان دەستمان بۆ دەبرد، ئەوە تەنها شتێك بوو بۆ بازرگانیو پێویستیمان دەمانخواست، ئەوە ماڵێکی دروست نەبوو لەدەستماندا".

[215] A European intelligence official concurred with this view.

بەدەستەبەرکردنی پێویستییەکان بازدانێکی خێرا لە لێشاوی ئەوانەی پەیوەستدەبوون بە ریزەکانی پەکەکەوە، هەر لەدەستپێکی نەوەدەکانەوە کێشەگەلێکی لۆجستیکی چاوەڕواننەکراوی هێنایە پێشەوە.

گەریلاکان تا ئەوکات بەزۆریی لەدابینکردنی خواردەمەنیدا، وەك نان، شەکر، چا، برنجو پاقلەمەنیو مەعکەرۆنیو رۆن پشتیان بە ئاوابییەکان قایمبوو. وەلێ لێرە بەدووە هەروا ئاسان نەبوو. چوون فراوانبوونی یەکەکان بۆ ٣٠ تا ٤٠ یەکەی سەربازیی، تەنانەت ١٠٠ کەس لەشوێنێکدا نەدەلوا بەپێوەندیی لەتەك نزیکترین ئاوایدا ژیانیان بەردەوام بۆ رامبکرێت. ئەوەیش خۆی لەچەند هۆیەك دەدیەوە: یەکەم، هەموو ئاوابییەکان دۆست و دەستگرۆکەری گەریلاکان نەبوون. دووەم، ئامانجە سەرەکییەکە پشتیوانی بوو نە خەڵکەکە نەك ئیفلاسپێکردنی خەڵکی هەوادارو دۆست. زۆربەی دێهاتییەکان نەدارو گەدا بوون، ئەو پشكو پوڵەی کەهەیان بوو تەنها بەشی خانەوادەکەی خۆیانی دەکرد. هاوکات لەو شوێنانەی کە ئاوەدانی لێبوو بازاڕو دوکانی لێنەبوو، هەربۆیە ئاسان نەبوو ماڵەو ماڵ پێداویستییەکان گردبکەنەوە. بۆیە پێویستبوو گەریلاکان لەرۆژانەگەڕان بەدووی خواردندا قوتاربنو دەبوو ئازادبن بۆ کاروباری تر.جگە لەوەیش کۆگای خۆراکییان پێویستبوو تا لەزستاناندا دەستی بۆبەرن.

لەبەرئەوە پێویستیی بە خەزێنەو خۆراکی هەمیشەیی دەبوو کاری بۆبکرێت. ئەمەیش لە ئاوابییەکانەوە دەستەبەر نەدەبوو. چونکە پێویستییەکانی یەکەکانی پەکەکە لەسەرووی توانای ئاوابییەکانەوە بوو، چوون ئەوان پێویستییان بە داو و دەرمان هەبوو بۆ چارەسەریی نەخۆشەکانیانو هاوکات پێویستییان بە باتریی هەبوو بۆ ئامێرە لاسلکییەکانیان، ئەم ئامێرەیان لە دەورووبەری ساڵی ١٩٩١ بەکاردەهێنا. هاوکات خێمەو خێوەتی ئەستوورو پەتوو بۆ رووبەڕوو بوونەوەی شەوانی ساردی زستان، لەسەرووی هەموو ئەوانەوە پێڵاو، گرنگییەکی ئەو تۆی هەبوو، چونکە ئەوان بەهۆی سەختیو تیژی بەردو کەندەلانەکانەوە زوو زوو پێڵاوەکانیان دەدڕا. سەرەڕای ئەوەیش پێویستیی بە چەكو چۆڵو جبەخانەی زیاتر ببوویە ئەمری واقیعو دەبوو رێگەی چارەسەریی ئەم

پێویستییانە بدۆزنەوە. فەرماندەکانی پەکەکە کاریاندەکرد تا ڕێگەچارەی پێویستییە لۆجیستیکییەکانیان بدۆزنەوە. دکتۆر سولەیمان وەك هەمیشە مژوڵی ڕێکخستن‌و کارکردنبوو لەسەر ئامادەسازی‌و ڕێکخستنی کۆگای دەرمان بۆ گەریلاکانی شاخ. وەلێ هەندێك کات کۆگایەکی وەها چارەسەریی نەخۆشییەکانی نەدەکرد. بۆنموونە لاوێك نەخۆش کەوت، ئەو بوورانەوەی لەگەڵدابوو، ئیتر مانەوەی لە چیادا ئەستەم بوو. لەبەرئەوە فەرمانی پێکرا خۆی بگەیەنێتە ئەستەمبوڵ، بۆیە بەنهێنی توانی قوتاربێت‌و پێوەندیکات بە هەوادارانی پەکەکەوە لەو شارەدا. ئەو لاوە لەڕێگەی یەکێك لە بارهەڵگرە گەورەکانەوە قوتاربوو. لەڕێگەدا لتەك کابرای شۆفێر ئاشنا بوون‌و ئەوە بووە هۆی ئەوەی کە بڕوا بەیەکتر بکەن، چوون بارهەڵگرەکە یەکێك بوو لەبازرگانە زەنگینەکانی هێرۆیین. ئیتر لەو ڕێگەیەوە توانیان متمانە لای یەکتر دروستبکەن‌و بەڵێنی هاوکاری‌و هەماهەنگییان لەیەکتر وەرگرت.

دکتۆر سولەیمان دەیوت: "لەساڵی ١٩٩٢ دا بوو، لەکاتێکدا ئێمە بەدەست کەمیی کۆگاکانمانەوە دەمانناڵاند. هەمان ساڵبوو کە ژمارەیەکی ئێجگار زۆر ئەندامی نوێ هاتبوونە ڕیزەکانمانەوە. بۆیە داوامان لەو و شۆفێری بارهەڵگرە کرد کە دوو بارهەڵگر ئازوقەو شمەکمان بۆ بێنێت. یەکێك لەو پێویستیانەی کەداوامان کردبوو، خواستی ٥٠٠ فانیلەمان لێکردبوو. کابرایش بەپیر داواکەمانەوە هات‌و دوو باری تەواو شمەکی لە ئەستەبوڵەوە بۆ ڕەوانەکرین. ئیتر ئەوە یاریدەیەکی ئێجگار باشی داین. وەلێ گەر ئەو کەسە زەنگینە لە چیاکان لەتەك ئێمە وەمایەو دوورنەکەوتایەتەوە، ئەوا ئێمە دوچاری گرفتێکی زۆر زۆر دەبووینەوە". بەمجۆرە لەزۆرترین کاتەکاندا گەریلاکان پشتبەستووبوون بەو تۆڕە بەرفراوانەی هەوادارانیان لە شارو شارۆچکەکانی باشووری ڕۆژهەلاًت‌و شارەکانی تری تورکیا.

هاوکات تەڤگەرەکە لەو شوێنانەی کە تێیدا بەهێزبوون، هەڵدەستان بە سازدان‌و پێکەوەنانی لیژنەگەلی نێوچەیی بۆ گردکردنەوەی پارەو نێونووسی ئەندامە نوێیەکان‌و شتانێك کە پەکەکە پێویستی بووبێت لەپێویستییەکانی شاخ بۆ ئەوەی بیانکڕن .

هەربۆیە بەپشتبەستن بەو پارەیەی کە شۆڕشگێڕەکان لە باشوری رۆژهەلات کۆیانکردبوویەوە، تەڤگەرەکە دەیتوانی پێویستییەکانی خۆی لە کڕینی شمەكو خو... دابین بکەن، ئەوان جارێك لە ساڵێکدا دەیانتوانی هێند خۆراك لە ئاواییە هەژارنشینەکا... گردکەنەوە کە بەشی کۆگاکانیان بکات. وەلێ بۆ بوارەکانی ترو پێویستییەکانی تر... بەدەر لە خواردەمەنی پەنایان دەبردە بەر شارە گەورەکان. دیارە کە کۆکردنەوەی... بەدەستهێنانی پێداویستییەکان لە نێوچەکانی دوور لە سنووری ئێراق دژوارو دەرنە... بوو. بەتایبەت کاتێك ئەرتەشی تورکیا سەرحاڵو چالاك بووایە، ئەوا دەکرا ئەو کۆگ... شمەکانە لە گەریلاکان دابڕێت یاخۆ ئەرتەشی تورك دەست بەسەر مۆڵگەخۆراکی... شمەکییەکاندا بگرێت.

هاوکات دەردناكو دژوار بوو بۆ هاولاتیانی نێوچە دوورە دەستەکانی سنوور ... ئەوەی شمەکەکان بگوازنەوەو رادەستی گەریلاکانی بکەن. بەلأم لەو نێوچانەی کە نێزیـ... خاڵە سنوورییەکانی ئێراق بوون رەوشەکە ئەهوەنتر دەهات بەدەستەوە. چوون لەو... سنوورانەدا کوردانی ئێراق یاریدەدەر بوون تا هەموو ئەو شتومەکانە وەگوێزن بۆ کەمپەکانی پەکەکە لەسەر سنووردا.

هەندێکجار کۆگاکانی پەکەکە لەلایەن هێرشە هەواییەکانی ئەرتەشی تورکەوە تێك... پێکدەدرانو لەنێودەبران، وەلێ بەگشتی ئەو کۆگایانە لەشوێنانێك هەڵدەگیرانو دەپارێزران کە ئەستەم بوو لەرێی سەربازییەوە بتوانرێت دەستیان بەسەردا بگیرێت.

بەشێوەیەکی بنچینەیی گردبوونەوەی پێویستییەکانو پوڵو پارەو جلو بەرگ شتانێك نەبوون کە پەکەکە تەنها پشت بەوانە ببەستێت، چوون ئەوانە بەسانایی بەدەست دەهاتن. لە گردبوونەوەی شتەکان گرنگتر، ئەوەبوو کە پەکەکە کاری دەکرد بۆ پاراستنی ئەو شتانەو میکانیزمی بۆ گواستنەوەیانی دادەنا.

وردەوردە ئەرتەشی تورکیا تێگەیشت کە تەواوی ئەو ئاواییانەی پانتایی باشوری رۆژهەلأت دەگرنەوە، سەرچاوەیەکی هێورو ئارامبەخشن بۆ زیندوویەتی پەکەکە. ئیتر

هەڵوێستو ئاراستەی خۆی لەبەرامبەریان گۆڕیو دەستی دایە میکانیزمی لێکترازانو هەڵوەشانەوەی تورکانی پێوەندی ئەوانو گەریلاکان.

کوچوک زەکی لەم بارەیەوە دەیوت: "وەختێك میریی دەستی وەردایە نێوئاواییەکانو گوندەکانی سوتاندو خەڵکەکەی کوشتو بڕکرد، ئیدی وردە وردە گلۆڵەکە بۆ ئێمەیش کەوتە لێژیی".

## بەدەستهێنانی چەكو چۆڵ

هەمیشە شۆڕشگێڕان لەوەدا پێداگرییان دەکرد کە دەستدانە جەنگ هیچ دژوار نییە. بەگشتی ئەو چەکانەی کە گەریلاکان بەکاریان دەهێنا بریتی بوون لە دۆشکە، رەشاش، کلاشینکۆف، هاوەنو نارنجۆكو بی کەی سی. ئەمانە بەئاسانی پەیدا دەبوونو گەریلاکان دەیانتوانی بەکاریانبهێنن. وەختێك کە هێزە هاوپەیمانەکان بە رێبەرایەتی ئەمریکا نێوچەیەکی دژە فڕینو ئارامیان لە باکوری ئێراق چێکرد، ئیدی ئەو نێوچەیە بوویە شوێنی ساغکردنەوەی چەكو چۆڵەکانی سوپای ئێراقو سەرچاوەیەکی باش بوو تا بڕی پێویست چەكو چۆڵ بەر گەریلاکان بکەوێت[216].

لەم بارەیەوە رۆژنامەنوسێکی کوردی تورکیا، کە لە ئازاری ١٩٩١ دا وەك پەیامنێر هاتبووە باکوری ئێراق نوسیبووی: "هەموو ئەو ناوچانەی باکوری ئێراق کە سوپای ئێراق تێیدا پاشەکشەی کردبوو، بەتەواوی پڕچەكو جبەی سەربازیی دەستلێنەدراو بوو". حوسەین تۆپیدەر، کە لەوکاتەدا لەچیاکانی نێزیك باکوری ئێراقو هاوسنووری زاخۆدا، فەرماندەیەکی پەکەکە بوو، ئەو بەسەرسوڕمانەوە باسی لە فەرهودی ئەو هەموو چەكو چۆڵەدەکرد کە پەکەکە توانی لەو ساتانەدا بەدەستیان بهێنێت[217].

---

[216] A good description of the variety of weapons used by PKK rebels is found in Gursel, Dagdakiler, 75 – 76. Gursel, a Turkish journalist, was kid" napped by the PKK and held for nearly a month.
[217] Quoted in Ozcan, PKK, 266fn238.

بەگشتی نێوچەکە هەمیشە زەنگین بووە بە چەکو چۆڵو دەڵاڵەکانی بەدەستهێنـ ـ
چەك. زۆرینەی ئەو چەکانە دروستکراوی رووسیابوونو ئەو وڵاتە لەماوەکانی جەنگـ
ساردا فرۆشتبوونی بە وڵاتانی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست. بەتایبەت ئەو وڵاتانەی ـ
کێبرکێکانی جەنگی ساردا هاوپەیمانی رووس بوون یاخۆ ئەو گروپانەی هاوسۆزو هـ
هزری شورەوی بوون. کوردانی ئێراقیش هیچکات سڵیان لەوە نەکردووەتەوە کە کـ
ئەوانەی چەکو چۆڵیان پێدەدەن. هاوکات پەکەکەیش بەهەمان نەزم بۆی گرنگ نەبووە
ئامادە بووە بەهەرنرخێك بووە تەڤگەرەکە پڕچەك بکات. لەکاتە جیاوازەکانیشدا پەکەکە
لەهەریەك لەتارانو بەغداد چەکو چۆڵی بەدەست گەیشتووە، ئەوە جگە لەو یارمەتییانەی
بەشێوەیەکی رێکخراوەیی لەسوریادا بەدەستی هانیبوون. هاوکات بازرگانیکردن بەچەکو
چۆڵیشەوە یەکێك بوو لەو موجازەفانەی کە رێی تێدەچێت پەکەکە لەگەڵ هەریەك لەو
وڵاتانە یاخۆ گروپەکانی یەکێك لەو وڵاتانە کردبێتی.

تۆپیقدەر بە دەنگێکی کز و گازانداوییەوە دەیوت: "بە هێزترینی پێوەندییەکانمـ ـ
لەگەڵ ئێراق لە ساڵی ١٩٩١ دا بوو. هەموو ئەو یارمەتییەیش کە ئەوان بڕیاربوو
بماندەنێ، لەسەر رووی کاغەز هەروا مانەوە".

لەراستیدا ئێراق ئەوکات لەژێر گەمارۆی نەتەوەیەکگرتووەکاندا بوو، هەربۆیە رێگەی
بەدەستهێنانی چەکو چۆڵی نوێ سنوردار بوو. لەبەر ئەوە هەر جۆرێك لەو چەکانەی
پەکەکە لەبەغداوە بەدەستی گەشتبوون؛ جیاواز نەبوون لەوانەی کە لەبازاڕی رەشـ
دەستیکەوتبوون، یاخود دەکرێت بەنرخێکی هەرزان بەدەستی هانیبن. چونکە لەپاش
جەنگی کەنداو رێژەیەکی بەرفراوان چەك هاتبوونە نێو بازاڕی رەشەوە. ئایزمان، کە
پارێزەرێکی کورد بوو، ئەو هەر لەو دەمەدا ببووە گەریلا، ناوبراو لەمبارەیەوە دەیوت:
"هێند چەکو چۆڵ لە بازاڕەکاندا فرەبوو، نرخی کلاشینکۆفێك کەمتر لە نرخی گلۆرێك
ماریلبۆرۆ بوو". وەلێ هەموو ئەو جۆرانەی چەك کە پەکەکە لەو قۆناغەدا بەدەستی
گەیشتن، تێکڕا چەکو چۆڵی سوك بوون، وەك کلاشنکۆفو نارنجۆكو ئەو بابەتانە.
چوون ئەوان ئاسان نەبوو بۆیان چەکی قورس بگوازنەوە نێو بارەگا گەڕۆكو

ناجێگیرەکانیان لەباکوری ئێراق یاخۆ ئەو نێوچە سەختو هەورازانەی بۆتان کە بارەگاکانیان تێدا قوتکردبوونەوە دابوو. بەگشتی ئەو ئەندامانەی پەکەکە کە عەزمیان جەزمکردبوو ببنە گەریلا پێش هەموو شتێك دەبوو پشت بەتواناو هەوڵی خۆیان ببەستن بۆ خۆ پڕچەككردن. چوون ئەو ئەندامانەی لە دۆڵی بیقاعەوە راهێنرابوون. کاتێك نێردرانە نێو شاخ تەنها مەخزەنو کلاشینکۆفو نارنجۆکێك کە پێیان درابوو ئیتر هەر ئەوە بوو، ئەوان پێویست بوو خۆیان بتوانن شوێنی مەخزەنە خاڵییەکانیان جارێکی تر بڕبکەنەوە. بەمجۆرە پەکەکە بارەگا گەلێکی نیمچە جێگیریی لە نێوچە سنوورییەکانی باکوری ئێراقدا پڕکرد لە کۆگای چەكو تەقەمەنی. بەمشێوەیە پەکەکە توانی تێشووی خۆی لەخۆراكو پێداویستیو تەقەمەنی لە نێوچە سنورییەکانی ئێراقدا بخات. هاوکات وەك حوسەین تۆپقیدەر دەیوت، ئەوان هەشتا یەکەی پارێزراوی خۆراكو تەقەمەنییان ئامادەکردبوو، تەواوی ئەوانە لەناوچە پارێزراوەکانی موش، سعرت، باتمان..هتد بوون. ئەگەریش پێویستی بکردایە زیاتر بەدەستبهێنن، ئەوا لەرێگەی دەلاڵەکانی چەكو چۆڵەوە دەیانتوانی فەراغەکانی دی پڕبکەنەوە".

لەراستیدا کڕینی جۆرەکانی چەكو چۆڵ لە باشوری رۆژهەلاتی تورکیە هێند کارێکی ئەستەم نەبوو، چوون بازرگانەکانی چەكو چۆڵ ئەوانەی لەسنوورەکاندا مژوڵی ئەوکارەبوون بەسانایی لەباکووری ئێراقو ولاتانی یەکێتی سۆڤییەتی پێشوو یاخۆ لەخودی تورکیا کڕینو فرۆشتنیان بەو چەکانە دەکرد. هەربۆیە پەکەکەش لەرێگەی پارەوە دەیتوانی هەر جۆرەچەکێك کە ئاتاجی پێیەتی بەدەستی بهێنێت. پەکەکە ئەو پارانەی لەهەموو ئەو کەسانە گردکردبوویەوە کە بە تۆپزی لێی دەستاندن یاخۆ وەریدەگرت لە بزنسمانە نێوخۆییەکان لەنێو نێوچە کوردییەکاندا.

کوچوك زەکی لەم بارەیەوە دەیگوت: "گەورە بازرگانێکی چەكو چۆڵمان شك دەبرد، هەر بۆیە هەرچییەکمان گەرەك بووایە لەرێگەی قاچاخچییەکانییانەوە بەدەستمان دەگەیشت". هەموو ئەو چەکانەی کە پەکەکە دەیخواستن، زیاتر پشتیان دەبەست بەوەی چ جۆرە چەکێك دەتوانن بەدەست بهێنن یاخۆ لەبازاڕەکاندا هەیە، یاخۆ ئەو

چەکانەیان دەویست کە دەیانتوانی بیانگوێزنەوەو بەکۆڵ هەڵیانبگرن. ئەوان وەک گەریلایەکی سازو ئامادە زیاتر چەکە عەمەلییەکانیان لا مەبەست بوو، هەربۆیە نیازیان نەبوو جبەخانەی چەکی قورس بۆکاتی درێژمەودا هەڵبگرن. هەربۆیە بەجۆرێك یەکە خەزنکراوەکانی چەکیان بلاوە پێکردبوو تا لەپاش پاشەکشەکردن لەهێرشەکان بتوانن بەسانایی پەنایان بۆ بەرنەوە. ئەم نەزمە لەنیوەی هەوەڵی نەوەدەکاندا کاری لەسەردەکرا. بەلام تورکیا بەپشت بەستن بە هەلیکۆپتەری کوبرای ئەمەریکی لەرێگەی بۆردومانی هەواییەوە باشتر دەیتوانی ئامانجەکانی پەکەکە لەچیادا تەنگ پێهەڵبچنێت. هەربۆیە بە گۆڕانی تاکتیکی سەربازیی تورکیا، نەزمی کارکردنو رەوتی سەربازیی پەکەکە ئێجگار زیاندمەند بوو.

تۆپیقدەر دەیگوت: "شتێك کە ئێمە پێویستمان بوو، بریتی بوو لە موشەکی دژە فرۆکەو هەلی کۆپتەر کە تا ئەو کات هیچ کام لە هەوادارو پشتیوانانی پەکەکە پێویستییەکی لەو جۆرەی بۆ فەراهەم نەهێنابووین". لاوازی پەکەکە لە نەبوونی ساروخی دژە فرۆکەدا بەتەواوی گەریلاکانی پەشێو کردبوو، ئەم گرفتەیش بەپارە چارەسەر نەدەکرا، ئەگەرنا پەکەکە سالانە دارای دەیان ملیۆن دۆلار بوو کە لە خاوەن کارەکانی کوردو کەسە تایبەتەکانی خۆی لەئەوروپا بۆی کۆدەکرایەوە. ئەو بەو پارەیە دەیتوانی لەو چەکە رووسیانەی کە لەناوچەکە بلاو بوو دەستی خۆی بوەشێنێت. وەلێ هەمیشە پەکەکە گرفتی لەگەڵ بەدەستهێنانی ئەم جۆرە چەکانەدا هەبوو.

ئەندامی پێشووی پەکەکە سەلیم جوروك کایا لەم بارەیەوە تەئکیدی دەکردەوە: "سوریا نەیدەویست ئێمە ببینە خاوەنی چەکی قورس". دەکرێت سەلیم لە بۆچوونەکەیدا پێکابێتی، چوون هەمیشە پشتیوانە بیانییەکانی پەکەکە بەپلەی یەکەم سوریاو پاشان ئێران، مەبەستیان بوو پەکەکە لەتمە لەتوکیا بدات، لەهەمان کاتدا خۆشحاڵ نەدەبوون بە سەرکەوتنی پەکەکە لە رووبەڕوو بوونەوەکاندا.

چونکە ئەوان باش دەیانزانی کە رەنگە سەرکەوتنەکانی پەکەکە دژ بە هێزی ئاسمانی تورکیا، ئەو ولاتە رق ئەستووربکات بەرامبەر بەو ولاتانەو تۆڵەی خۆی لەهەمبەر هەموو

ئەوانە بکاتەوە کە باش دەیزانی پشتیوانی لە جموجوڵەکانی پەکەکە دەکەن لە ناوچەکەدا. ئەمریکایش لەو بارەیەوە ئەزموونی دەستپێکی هەشتاکانی هەبوو، دەیزانی کاتێك شەڕکەرانی موجاهیدینی لە ئەڤغانستان پڕچەك کرد بەو جۆرە موشەکانە، دواتر بوونە گێچەڵ بۆی‌و بەهیچ کلۆجێك نەیدەتوانی ئەو موشەکانەیان لێبسێنێتەوە، کە کەوتبوونە دەست گروپە چەکدارەکانەوە. هەرچەند لە نێوەندی نەوەدەکاندا پەکەکە جۆرێك موشەکی (ئێس ئەی"7") رووسی بەدەستهانی بوو. زیاد لەوەیش رووسییەکان‌و پسپۆڕەکانی وڵاتانی سەر بەسۆڤییەت بەئاشکرا گەریلاکانیان راهێنابوو لەسەر بەکارهێنانی ئەو ساروخانە. وەلێ یەکێك لە گەریلاکان ئەوەی نەشاردەوە کە توانای ئەوان کەمتر بوو لە بەکارهێنانی ئەو جۆرە چەکانە.

گەریلایەکی دی کە نەیدەویست بناسرێت دەیگوت: "گرفتمان لە ئەندازەو بڕی ئەو ساروخانەدا نەبوو، وەلێ بەئەندازەی پێویست راهێنانمان لەسەر بەکارهێنانیان نەبوو".

لەگەڵ ئەوەشدا پەکەکە هەرگیز ئاودیوی ئەم جۆرە موشەکانەی بۆ نێوتورکیا نەدەکرد، هۆکارەکەیش هێند روون نەبوو بۆچی. وەلێ هەندێ لە فەرماندەکان دەیانگوت کە سوریا هۆشداری داوەتە ئۆجەلان کە نابێت لەسنوورەکانەوە ئەو جۆرە موشەکانە ئاودیوی تورکیا بکەن.

بەمجۆرە گرفت لەبەدەستهێنانی چەکی پێویست‌و ئازادیی هاموشۆی نێوسنوورەکان، سەلمێنەری ئەو راستییەن کە پرسیار لەسەر سەربەخۆیی پەکەکە دروستدەکەن لەمەڕ هاوپەیمانە بیانییەکانی. ئەوانە شتانێك بوون کە پەسەندی ئۆجەلان بوون‌و لەهەمان کاتدا فرە بایەخی بەدەرهاویشتەکانی نەدەدا. ئۆجەلان لە دەستپێکی هەشتاکانەوە کە بڕیاری بونیادنانی پێوەندیی تۆکمەی لەگەڵ سوریا دا، ئەو راستییەی بە ئاشنا چەپەکانی تورکیا وت، کە راگرتنی تەرازووەکە هەروا کارێکی سانا نییە، وەلێ هیچ دەرفەتێك‌و هەڵبژاردەیەکی تر بۆ رێبەری کوردانی تورکییە لەتەواوی رۆژهەڵاتی ناویندا شکنەدەبرا.

هەربۆیە سوریا بەراستی نێوچەچەیەکی ئارامی بۆ وان دابینکردو سەلمانـی پەکەکەیش تەواو جێ پێی خۆی گرتو لەناوچەکە و لە ئەوروپایشدا بەهێز ببوو، کەوتە گرفتێکی وەك بەدەستهێنانی ساروخو چەکی پێویست لە گرنگیو کاریگەریی بڕیاردەکەی ئۆجەلانی کەم نەدەکردەوە.

## برا گەورەکانی سیاسەت

هەمیشە ئۆجەلان لەنێو چالاکوانە کوردەکاندا کەسێکی پەسەند نەبوو، بەتایبەت دەنێو ئەو چالاکانەی کە مەبەستیان بلاوکردنەوەو وەشانی تیۆرەکانی شۆرشگێڕیی بوو لەبری ئەوەی دەستبدەنە شۆڕشو شۆڕش بکەن. وەلێ پاش ئەوەی جەنگی پەکەکە وەختبوو رێگەی خۆی بگرێت. ئیتر هەم بۆ ئۆجەلانو هەمیش بۆ پشتیوانو شوێنکەوتوانیی شتەکان بەجۆرێکی جیاوازتر بەر دیدە دەکەوتن.

هاوکات ئەندامانی پەکەکە، بەتایبەت ئەوانەی لەنێو رۆژنامەگەریی نێوخۆیی حزبەکە مژوڵی نوسین بوون لە ئەوروپا دا، هەر زوو لێنەوین تا وێنەو ویقاری پەکەکەو رەوایەتی دۆزی پەکەکە زیاتر برەو پێبدەنو هەڵمەتی پروپاگەندە بۆ حزبەکەیان دەستپێبکەن. ئۆجەلانیش بۆخۆی بایەخداربوو بە کۆنگرەیەك لە پێناو وتوێژو لێکنزیکبوونەوەی سیاسیی پارتەکان لەنێو دامەزراوەی تورکیا دا.

لەم پێناوەدا پەکەکە گۆڤارێکی تایبەت بەخۆی وەشاندەکرد. وەلێ ئەم گۆڤارە لەنێو تورکیادا قاچاخو نایاسایی بوو، هاوکات دابەشکردنیشی ئێجگار مەترسی دارو گێچەلاوی بوو. لەگەڵ ئەوەشدا تەرکیزی سەر وتارو کۆڵینەوەکانی ئۆجەلان بۆ ئەوانەی کە بایەخداربوون پێی یان ئەوانەی باوەڕیان بەدۆزی پەکەکە هەبوو، لەنێوخۆی تورکیادا ئێجگار سنوردار بوو.

سەلاحەدین چیلیك دەیوت: "ئیتر کاتی ئەوە هاتبوو پەکەکە رۆژنامەیەکی بەهێزی هەبێت". ئەوەبوو کارکرا تا پەکەکە لە ئەورپادا رۆژنامەکەی وەشانبکات. هەربۆیە لە ئۆکتۆبەری ۱۹۹۰ رۆژنامەی وڵاتی نوێ کە نێوەندی سەرەکی لە ئەستەمبوڵبوو،

کەوتەکار. ئەندامانی پێشووی پەکەکەو رۆژنامەنوسە سەربەخۆکانی کورد دەیانگوت: "پەکەکە هەڵمەتی تەمویلی رۆژنامەکەیان دەستپێکردبوو". [218] چالاکوانانی کورد ئەوانەی لەدەسالّی رابردوودا فرەترینی تەمەنیان لەزیندانەکاندا بەسەربردبوو، هەرچەند کە هیچ پێوەندییەکیشیان لەتەك پەکەکەدا نەمابوو، فرە بەتامەزرۆییەوە پشتیوانو سەرخەری ئەو پرۆژە نوێیەی پەکەکە بوون. هەموو ئەوانە دارای ئەزموونێکی زەنگین بوون لە کاری نوسینی نهێنی نێو زیندانەکان، ئەوان پاش دەیانزانی چلۆن دەسنوسەکانیان بەنهێنی گرمۆڵەکەنو بەنێو خانەی زیندانەکاندا وەشانیان بکەن. هەربۆیە لە گرنگی دۆزینەوەی کەناڵێکی پەیوەندیی ئێجگار بەهرەمەندبوون. رەمەزان ئەلیك دەیگوت: "بۆچوونەکە ئەوە بوو کە رۆژنامەیەك دەتوانێت دەنگی کورد بگەیەنێتە نێوخۆی تورکیاو جیهان، وەلێ بەرێگەیەکی یاسایی". ناوبراو بەتۆمەتی ئەندامێتی پەکەکە سالآنێك لەزینداندا بوو. ئەو بەشداربوو لە رۆژنامەکەدا، ئەوە پاش ئەوەی لەزیندانێدا ئازادکرابوو.

رۆژنامەکە لەگەڵ بوونی ستونگەلێکی تایبەت بە مشتومڕو ململانێی هزری پەیوەست بە زیندیانیانی پەکەکەو ژنانو پیاوانێکی شۆڕشگێڕیی پەیوەست بەپەکەکەوە، لەگەڵ ئەوەشدا لینکێکی ئێجگار گچکەی لەگەڵ پەکەکەدا هێشتبوویەوە، ئەوەیش بۆئەوەبوو تا رۆژنامەکە لەلایەن زۆرترین چینو توێژەکانی خوێنەر ئاشنا بێت. رۆژنامەکە سنورێکی جەماوەریی دیاریکراوی هەبوو کە دەوترێت دەگەیشتە ٥٠,٠٠٠ کەس، بەزوویی کارکرا تا وەك رۆژنامەیەکی رۆژانە کاریگەربێت. خودی پەکەکەیش گەرەکی بوو لەوکەناڵەوە هەم تەمویلی مالی هەمیش پێوەندیی لەگەڵ سەرمایەدارانی کورد فراوانتر بکات. پلانی رۆژانە بوونی رۆژنامەکە هەنگاوێك بوو بۆسودگەیاندن بەهەردوو تامەزرۆیانی نەتەوایەتیو دۆزی کورد لەگەڵ ئەو رۆژنامەنوسە تورکە چەپانەی کە رادیکالآنە گوزارشتیان لە

---

[218] This section on media sympathetic to the PKK drew especially on in" terviews with PKK militants with close information about the newspaper, and former journalists and editors at the newspaper. Published sources included Ersoz, Gurbet'in Guncesi, and reminiscences by former Gundem editor Gulmus that appeared on his website, www.nasname.com.

بۆچونەکانیان دەکرد لە رۆژنامەکەدا. چونکە تورکە چەپەکان لەنێو ماس میدیای تورکیادا بۆشاییەکی کەم هەبوو تا گوزارشت لە بۆچونەکانیان . دواتر پاش زەمەنێك لەو راستیە گەیشتن‌و تارادەیەك بەرکەناربوون لەو رقە ئایدیۆلۆژیەی لەهەمبەر ناسیۆنالیزمی پەکەکە هەیانبوو، بەتایبەت هیوایەکیان هەبوو بەو هەیەجانەی ئۆجەلان تێیکەوتبوو لەهەمبەر خەباتەکەیدا. پشتیوانانی پەکەکە لەوە دڵنیابوون کەرۆژنامەکە پشت‌و پێناوی کوردانە، رۆژنامەنوسان لەوەدا بواریان بۆ رەخسابوو کە لەهەمبەر دۆزو دوریانی جەنگی پەکەکەدا باشترین بنوسن‌و زیندوترین راپۆرت بکەن.

هاوکات زۆرێك لە رۆژنامەنوسانی چەپی کوردو تورك بواریان بۆکرایەوە تا لە Ozgur Gundem دا کاربکەن، ئەو دەزگایەش لە مانگی پێنجی ١٩٩٢ دا دامەزرا. سی، کە داوای کردبوو نێوی نەبرێت رۆژنامەنوسێکی تورك بوو، ئەو دەیوت: "پەکەکە رێکخراوێکی بەهێز بوو، دارای سەرچاوەگەلێکی ئێجگار فرە بوو، ئەو پارتە پێویستی بەوەهەبوو رۆژنامەیەکی هەبێت، ئێمەیش تامەزرۆی کارکردن بووین لەرۆژنامەیەکی ئۆپۆزسیۆندا، دیارە ئەوەیش پێویستییەکی گونجاو بوو بۆ هەردوولامان".

دوواجار پشتیوانی پەکەکە بۆ رۆژنامەیەکی هەمەلایەنی سەر ڕاست هەرزوو بەیەکدادانی کرد لەگەڵ تواناکانی پەکەکە بۆ قبوڵکردنی ئەندامی سەربەخۆو بۆچوونە رەخنەییەکانیان. هەمان رۆژنامەنوسی تورك دەیوت: "لەسەرەتاوە فرە کەیفخۆشبووین بە رەوشێکی لەوجۆرە، وەلێ بەرەبەرە سەبرمان لێوڕێژبوو، کاتێك کە زانیمان ئەوان بە روانگەیەکی نێگەتیڤەوە دەڕواننە هەموو ئەو بابەتانەی کە ئاماژەنین بۆ کوردو ئۆجەلان".

هەوەڵ سەرنووسەری رۆژنامەکە وازی هێنا، تەنانەت پێش ئەوەی رۆژنامەکە بناسرێت. پاشان دووەم سەرنوسەر تا ١٠ هەفتە درێژەی بەکارەکەی داو دواتر ئەویش دەستی لەکار کێشایەوە. پاش ویش سێهەم سەرنوسەری رۆژنامەکە تاچەند مانگێك بەردەوام بوو، ئیتر ئەویش لەلایەن ئەندامێکی دێرینی پەکەکەوە بەناوی شوکور کوڵمەز شوێنی گیرایەوە. ناوبراو لەهەمان کاتدا مامۆستایش بوو، ئەو ١٠ ساڵی رەبەقی

لەزینداندا بەهۆی تێوەگلانی پێوەندیی لەگەڵ پەکەکەدا بەسەر بردبوو. گوڵمەز بەماوەیەکی کەم پاش ئازادکردنی لە زیندان، لەساڵی ١٩٩٠ دا دەستی دایە کارکردن لە ڕۆژنامەی ولاتی نوێدا. دووا بەدووای ئەوە ئۆجەلان بانگهێشتی نێوبراوی کرد تا لە دۆڵی بیقاعدا لە نێزیکەوە وتوێژی لەگەڵدا بکات. لەو وتوێژەدا گوڵمەز رایگەیاند کە ئۆجەلان ئەوی راسپاردووە تا بەرپرس بێت لەنێوەندی بڵاوکراوەکان‌و چالاکییە رۆشنبیرییەکانی پەیوەست بە تەڤگەرەکە لەنێوخۆی تورکیادا. ناوبراو هەم لەرووی تەمەن‌و هەمیش لەرووی ئەزموونەوە لەهەموو ئەوانە شارەزاتر بوو کە تا ئەوکات سەرنوسەری ڕۆژنامەی Ozgur Gundem بوون. هاوکات باشیش ئاگاداری راگرتنی بالآنسی پێویستییەکانی تەڤگەرەکەو خواستی ئۆجەلان بوو لەگەڵ وەشانکردنی ڕۆژنامەکەدا.

ساڵێك پاشتر گوڵمەز بە خەندەوە شرۆڤەی رەوشەکەی دەکردو دەیگوت: "کاتێك گرفتێك بۆ ڕۆژنامەکە دەهاتە پێش، راهاتبووم لەسەر ئەوەی نوکتەیەك بڵێم، ئەویش ئەوەبوو کە خودا گەورەیەو لەسەرووی هەموانەوەیە، پاشان حافز ئەسەدیش لەسوریایە، پاش ئەسەدیش ئاپۆ دێت، پاش ئاپۆیش، ئەوە من هام لێرە"[٢١٩].

ئەوە هیچ سەخت نەبوو بۆ سەرنوسەرانی ڕۆژنامەکە بۆ ئەوەی دڵنیابن لە ئاراستەو ئامانجی ڕۆژنامەکە. چوون هەر کۆڵینەوەو بەدواداچوونێك‌و هەر قورس دابەزینێك لەسەر هەواڵەکانی پەیوەست بەپێکدادانی گەریلاکان یاخۆ خراپ مامەڵەکردن لەبەرامبەر مافەکانی مرۆڤ لەلایەن سەربازانەوە لەسەراسەری نێوچەکەدا تێکڕای ئەوانە بەرژەوەندی سیاسیی پەکەکەی لێدەکەوتەوە. هەرتایبەتمەندی‌و وردبوونەوەیەك لەسەر گرفتە مێژوویی‌و فەرهەنگی‌و ساخڵەمییەکانی نێوچە کوردییەکان بەتایبەت هاوتابوو لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی شوناسی پەکەکە دا. تەنانەت نوسینەکانی ئۆجەلان کە لەژێر ناوی خوازراوی عەلی فیرات لەرووپەڕی ڕۆژنامەکەو بەستونێك بڵاوی دەکردنەوە،

---

219 The quote comes from an interview, carried out by Gursel Capanoglu, that appeared on www.lekolin.com.

کۆڵینەوەیەکی فەلسەفی بوون لەبواری پێشکەوتنەکانو ئاراستە سیاسییە نێونەتەوەییەکان دا.

بەلام ئایا ئەم رۆژنامەیە بوویە زمان حالی پەکەکە؟ بێگومان نەخێر. رۆژنامەکە بۆ هەوەڵجار دەرویەکی تەندروست بوو تا راستەوخۆ ئەو هەواڵانەی پەیوەستن بەکوردەکانەوە بخرێنەروو. چونکە لەنێو میدیای تورکیا دا دۆزێك بەنێوی دۆزی کوردەوە چاو لەئاستیدا نوقابوو. ئەو جەنگەی لە باشووری رۆژهەلاتدا تاوی سەندبوو، وەك گرفتێکی تێرۆریستی دەبینراو هیچ واتایەکی شوناسیو نەتەوەیی پێنەدەدرا.

خەڵکانێك کە داوایەکی رەوایان هەبوو، روویەکی گێرەشێوێنو گێچەلاویان پێدرابوو. هۆکارەکانی راگەیاندنی تورکیا تەنیٚ چەند ستونێکی ئێجگار لاواز نەبێت ئیدی باسێك لە رەخنەو گازاندەی کێشەی کوردان نەبوو، هاوکات ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکان لەباشووری رۆژهەلاتدا هیچ گرنگییەکیان پێنەدەدرا[220]. بەلام بەپێچەوانەوە رۆژنامەکە بەوردیو وریاییەوە لەبواری دۆزی کورداندا تایبەتمەندی دابوویە هەواڵو رێپۆرتاژەکانی تایبەت بە خراپی رەوشی مافی مرۆڤو رەهەندی فەرهەنگیو جەنگو پێکدادانەکان. سەخت بوو بوترێت هەواڵەکانی یاساییو دروست نین. یەشار قایا، خاوەنی فەرمی پێشوو تری Gundem دەیگوت:"جەنگێکی گەورە لەگۆرێدا بوو، میدیای تورکی تەغتیەی هیچی نەدەکرد". ناوبراو لە ئاپارتمانەکەی خۆیدا لە کۆلن، کە تەمەنێکی فرەی لەنێو کتێبو دیداری رۆژنامەوانیو سیاسەتو بلاوکردنەوەدا بەسەر بردبوو، پێمی وت: "ئێمە تێروانینێکمان هەبوو، بەراستی ئەوەی بلاوماندەکردەوە راستیو دروستی جەنگەکە بوو. لەتەواوی مێژووی کوردا رۆژنامەیەکی هێند سەرکەوتوو هەرگیز نەبوو، هەربۆیە دارای کێشەگەلێکی ئێجگار فرە بووین لەلایەن میرییەوە".

هەرگیز دەوڵەتی تورکیە جیاوازیی لەنێوان هێزی چەکدارو رەخنەگری بێچەکدا نەدەکرد، هەمیشە رۆژنامەنوسانی رۆژنامەکانو سەرنوسەرانی رووبەرووی گولـەزی یاسا نەگۆڕەکانی

---

[220] See Barkey and Fuller, Turkey's Kurdish, 121–126, for a fuller overview of the Turkish media and the Kurdish issue.

دەکردەوە. چەندەها یاسای جۆراو جۆر هەبوون تەنها لەپێناو سنوردارکردنی ئازادی رادەربڕینو رۆژنامەگەریدا. بۆنموونە مادەی ٨ی یاسای دژە تیرۆری ساڵی ١٩٩١ دژی هەر وتەو نوسراوێك بوو کە بانگەشەبکاتو زیان بە یەکێتی خاکی وڵات بگەیەنێت. یاساکە لەبەر ئەوە زۆر روون نەبوو، کەواتە هەر مشتومڕێك لەبارەی مافی نەتەوەییو یەکەکەو خراپ بەکارهێنانەکانی مافی هاوڵاتیان لەلایەن میرییەوە دەبوو تاوان بێت.

هالوك جیرگر کە روناکبیرێکی تەمەن مامنێوەند بوو، توانیبووی لە زانکۆی ۆنز هۆبکنز زمانی ئینگلیزی بخوێنێت، پێمی گوت: "لەتورکیادا چەمکی فەلسەفی من بیردەکەمەوە کەواتە من هەم، ببوییە من بیردەکەمەوە کەواتە من تێرۆریستم". ناوبراو بەگوێرەی یاسای دژە تێرۆر بە پازدە مانگ زیندانیی سزا درابوو. ئەو بەهۆی بەشداریکردنی لەرۆژنامەکەدا بەنوسین دەستگیرکرابوو، چوون لەیەکێك لە نوسینەکانیدا باسی لە نکولیکردنی تورکیا کردبوو بۆ بوونی نەتەوەی کوردو ئەوەی خستبووە روو کە جەنگی یەکەکە دەرهاویشتەی سیاسەتەکانی تورکیا یە. ئەو دەیووت: "تەنها هەوڵمدەدا تێبگەم جەنگی یەکەکە بۆ؟، تەنانەت هەوڵدان بۆ ئەوەی تێبگەیت ببوویە تاوانێکی تێرۆریستیی"[٢٢١].

بەدڵنیاییەوە دەوڵەت هاوڕابوو، فشاری فەرمیو نافەرمی لەسەر Ozgur Gundem ببوویە ئەمری واقیع[٢٢٢]. ئیتر هەردوو ئۆفیسەکانی رۆژنامەکە لەرۆژهەڵاتو رۆژئاوای وڵاتدا هەڵکوترایە سەریان. هەموو نوسەرانو پەیامنێران دەستبەسەرکرانو دوچاری هەڕەشەو توانجو ئەشکەنجە بوونەوە، هاوکات هەواڵنێرو دابەشکەرانی رۆژنامەکەیش بەهەمان شێوە رووبەڕووی ئەو جۆرە فشارانە بوونەوە.

---

[221] Aliza Marcus, "Turkish writers form 'closed university' behind bars," Reuters, March 6, 1995.

[222] Information on the pressures, including the killing of journalists, was drawn mainly from published sources, including Kocoglu, Kursunla Sansur; THRR (1993, 1994); and the Turkiye Gazeteciler Cemiyeti website.

له مانگی نۆی ١٩٩٤ پاش ئەوەی پۆلیس دووان لەو کەسانەی لە مێرسین دەستبەسەرکردبوون، پێی رادەگەیاندن ئێوە کۆیلەی پەکەکەن، ئەرکی پۆلیسە کوشتنی تێرۆریستانە، کەواتە ئێوە دەبێت بکوژرێن"[223].

ئەوە تەنها هەڕەشەیەکی بێ مەلامەت نەبوو. بەڵکو نۆ رۆژنامەنووس لە Ozgur Gundem و رۆژنامەی ولاتی نویێ بەزەبری گوللەی هێزە ئاسایشییەکان لەساڵی ١٩٩٢دا لەباشوری رۆژهەلاتدا کوژران و یەکێکیش بەتەواوی دوچاری ئیفلیج بوون هات. لەساڵی ١٩٩٣ یشدا دووان لەرۆژنامەنوسانی ئەو رۆژنامانە لەباشوری رۆژهەلاتدا کوژران[224] لەساڵی ١٩٩٤ رۆژنامەنسێك لە رۆژنامەی Ozgur Gundem بێسەروشوێن کراو دواتر رایانگەیاند کە مردووە. هەروەها لەساڵی ١٩٩٥ رۆژنامەنوسێکی رۆژنامەی Yeni Politika کە پاش وان دەهاتە دەرچواندن پاش ئەوەی لەلایەن پۆلیسەوە دەستبەسەرکرا، لە رەوشێکی نادیاردا تەرمەکەیان بەکوژراوی دایەوە خانەوادەکەی کۆڵینەوەی پۆلیس لەسەر کوشتنە بەئەنقەستەکان درێژەی کێشا. بەرپرسەکانی مافی مرۆڤ لەنێوخۆی تورکیاو هاورێیانی کوژراوەکان، گومانیان لێدەکرا کە تاوانبارین. یاخود لەلایەن دەزگا ئاسایشییەکانەوە هاندراون ئەو کارانە بکەن یاخۆ بۆخۆیان دەستیان هەبووە. بەرپرسە گەورەکانی تورکیە کوشتنەکانیان بەبایەخەوە تەماشا نەدەکردو بکوژەکانیان واز لێدەهێنا. لە مانگی هەشتی ١٩٩٢ پاش چەند رۆژێکی کەم لە کوژرانی پێنجەم رۆژنامەنووس لە رووداوێکی دژوارو نادیاردا، سەرۆك وەزیران سولەیمان دێمیرێل رایگەیاند: "ئەوانەی کە کوژراون، رۆژنامەنوسی دروستو حیسابی نەبوون، ئەوانە چەکدار بوون، لەنێو پێستی رۆژنامەنووسدا"[225].

---

[223] THRR (1994), 263.

[224] The PKK also exerted its own pressure. In 1992, the PKK admitted to killing Mecit Akgun, a Yeni Ulke journalist accused of informing on the group. The same year, Yasar Aktay, a freelance Kurdish journalist for the Turkish me" dia, apparently was killed by the PKK for reasons still unclear.

[225] Amnesty International, Turkey: No Security, 30.

تا ئێستا هیچ بەڵگەیەك بۆ پشتیوانی لە بانگەشەیەکی لەو جۆرە پشتڕاس نەکراوەتەوە. ئیدی ئەندامانی پەکەکە لەنێو ڕۆژنامەکاندا هەرزوو تێگەیشتن کە ئیتر کاتی ئەوە هاتووە نهێنیی و لەنێو شوقە داخراوەکاندا چالاکییەکانیان برەو پێبدەن، چوون ڕەوشەکە زیاتر بەرەو ئالۆزیی و ئاستەنگ ڕۆیشتووە[٢٢٦]. هاوکات تەواوی ڕۆژنامەنوسەکانی دی لەگەڵ پەیامنێران و بەشدارانی دابەشکردنی ڕۆژنامەکان کەوتبوونە ڕەوشێکی تەواو مەترسیدارو هەمیشە لەمەتەرێزی غافڵکوشتندا بوون. یەشارە قایا کە خاوەنی دەزگایەکی فەرمی بوو، فرە بە لەسەرخۆیی دەیگێڕایەوە: "من بۆخۆم ئامادەی ناشتنی تەرمی ٢٦ ڕۆژنامەنوس بووم، هەموو ئەو کوشتنانە ترس و بیمی لەلای ئێمە گەلاڵە دەکرد، وەلێ هەرگیز کاری لەسەر ئەوە نەکرد کە لە ئەرکەکەماندا بوەستین".

دواتر لە مانگی چواری ١٩٩٤دا، زیندان و دادگایکردن، غەرامەی زۆرو زەبەندو ڕاگرتنی کاتی ڕۆژنامەکان هەموو ئەم کێشە یاساییانە بوونە هۆی داخستنی ڕۆژنامەکە. بەڵام دوای دوو هەفتە پاش ئەوە لەژێر نێوی ڕۆژنامەی Ozgur Ulke جارێکی تر دەرچوێنرایەوە.

چالاکییەکانی بەربەستی ئەم ڕەوشە دژوارە لەنێو چەند بڵاوکراوەیەکی دیاریکراودا لەوانە Ozgur Ulke لەنامەیەکی نهێنیدا لە ڕێککەوتی ١٩٩٤/١١/٣٠ هۆشدارییان دایە سەرۆك وەزیران تانسۆ چیلەر، لەنامەکەدا هاتبوو: "هێرشی و ئیهانەی ئاشکرا بووەتە بەهای ڕۆحیی و هەمیشەیی میریی، دیارە ئەوەیش بەپاساوی دوژمنایەتی هەڕەشەیەکی جددی دەکرێت، ئێمە دەپرسین لە وەزیری داد بۆچی ئەو ڕێکخراو و ئۆرگانانە دیاری ناکات کە ئەو بڵاوکراوانەیان هەیەو ئاماژەن بۆ هەڕەشەو گوڕەشە"[٢٢٧].

---

[226] It would have been unusual for someone to be a reporter and an ac" tive PKK member. First, PKK members usually were assigned to positions in the editorial staff, where they had control over the newspaper 's direction. Sec" ond, a reporter who decided to join the PKK would have done so to take part in armed combat, not to stay in the same job

[227] Amnesty International, Turkey: No Security, 30.

تەنها ۳ ڕۆژ پاش ئەوە لەبارەگای فەرمی ڕۆژنامەی Ozgur Ulke لە ئەستەمبوڵ بۆمبێك تەقییەوە. لەئاکامدا کەسێك کوژراو نێزیکەی ۲۰ کەسی تریش بریندار بوو. لەوبارەیەوە نوسینگەی سەرۆك وەزیران ڕاگەیەنراوێکی بلاّوکردەوەو تیایدا دەستێوەردانی میریی لەو بارەیەوە دایە دوواوە، هاوکات ئاماژەیشی بۆ مەترسیداریی بابەتەکانی ڕۆژنامەکە کردو بەپێویستی زانی کۆلّینەوەیەکی داوەرانە لەوبارەیەوە ئەنجامبدرێت. تا ئەو کاتەیش ڕۆژنامەکە هەر بەردەوام بوو لە وەشانکردنی ئاسایی خۆی. گوڵمەز پێمی گوت: "ڕۆژنامەنوسەکانمان خەڵکانێك بوون، کە دەستەکانیان دەبڕن بە گەرووی ماردا تا هەواڵێك ڕاکێشنە دەرێ". هەروەها وتی: "ئەوە سەختو سەهەنە بوو، وەلێ ئەوان ئازا بوون. کاتێك کوشتو بڕی ڕۆژنامەنوسان سەریهەڵدا، تەواوی چەپەکانو تورکەکان وازیان لەکاری ڕۆژنامەنوسیی هێنا. وەلێ ئێمە دارای سەدان کەس بووین، کە بێباکانە برەویان بەکاری ڕۆژنامەنوسیی دەدا لەتەك ئێمەدا".

لەڕاستیدا دەستپێکی کارکردنی پەکەکە لە سەرەتای نەوەدەکانەوە بوویە پشتیوانێکی مەعنەوی گەورەو فرسەتگەلێکی مەزنی لەبەردەم دەستبەکاربوونی بلاّوکراوەو دەزگای کوردیی فەرمیو یاسایی لەنێو تورکیادا ڕەخساند. بەمجۆرە یەك نەوەی تەواو لە ڕۆژنامەنوسان لەسەر دەستو دەنگی بەئاگاهێنانەوەی ڕۆژنامەی Ozgur Gundem پێگەیشتنو بوونە ڕۆژنامەنووس.

لێرەوە بۆ هەوەڵجار کوردەکان توانییان هەواڵی پەیوەست بەنێوچەکەیان ببینن‌و بخوێننەوە. ئیتر لێرەوە شانۆکارانو ڕۆشنبیرانو هونەرمەندان پشتیوانییان بۆ نێوەندە ڕووناکبیریی‌و فەرهەنگییەکانی پەیوەست بەکاریگەرییەکانی ئەو نێوەندی بلاّوکردنەوەیە دەربڕی. هاوکات ئامادەیی پەکەکە بۆ پشتیوانیی کردن لە پارتە کوردییەکە HEP، بوارگەلێکی تەواوی لەبەردەم ئەو پارتەدا کردەوە تا ببێتە پارتێکی گشتگیریی سیاسی‌و لێرەوە پرۆسەی خەملّینی هزرو هۆشیاریی کوردان فرسەتێکی تەواوی لەڕووی سیاسییەوە پێدرا. ئەو دەمانە کوردەکانی ئەورووپا کە سەرخەرو هەواداری پەکەکە بوون، لەدەروازەی ساڵی ۱۹۹۵ دا سەرنجی تەواوی کوردانیان بە پەخشی کەناڵێکی ئاسمانی

کوردی راکێشا، کە بۆ یەکەمجار دەنگو رەنگی کورد بۆ کوردستانو بۆ تەواوی دونیا نومایان دەبوو.

یەکەکە هەمیشە هەوڵە سەرکەوتووانەکانی دادەبڕی لەهەوڵی تاکەکەسیو بڕیاری تاك لایەنەی بەهەند وەرنەدەگرتو تەواوی سەروەرییەکانی دەبەستەوە بە خودی یەکەکە خۆیەوە. سیاسییەکانی کورد هەستیان دەکرد کە فشارێك هەیە بۆ قایلکردنیان بە بەرژەوەندییە سیاسییەکانی یەکەکە. هەموو ئەو سیاسییانە یان نوسەرو چالاکوانانە دەیانزانی بەدەر لە پشتیوانی لەیەکەکە هەموو ئاسۆکانی پشتیوانیو دەرکەوتنیان لەبەردەمدا دەگیرێت، هەر بۆیە یەکەکە بەوردی بەدواداچوونی دەکرد بۆ هەموو ئەو گۆرانیبێژو ئەکتەرو نوسەرانەو دەبوو بەتەواوی سەرنج لە پشتیوانی جەنگی گەریلایی و سەرخەری پرۆژەی نەتەوەیی کورد بن. یەشار قایا بە گلەییەوە دەیوت: "یەکەکە بەجۆرێك دەجولایەوەو کارەکانی دەکرد، بۆ نموونە گەر یەکەکە بۆخۆی کەسێکی نەناردایە بۆ رۆژنامەکە، ئەوا ئەو کەسە جێگەی نەدەبوویەو کەسێکی نەخوازراو بوو ".

بۆنموونە کاتێك گوڵمەز سەرنوسەری رۆژنامەی غوندم Gundem بوو، ئەو لەوەدا راڕا بوو کە دیدارێکی تێروتەسەلی ئۆجەلان بلاْوبکرێتەوە کە باسدەکرا ١٠٠ تا ٥٠٠ پەڕە دەبوو. ئەوە بوو خودی رێبەری یەکەکە بڕیاری داخستنی رۆژنامەکەی دا بۆ ماوەیەکی کاتی. دوواتر پاش ٣ مانگ لە ئەپریلی ١٩٩٣ دا رۆژنامەکە سەرلەنوێ دەستی پێکردەوە. هەندێك پێیان وایە رەنگە ئەو گێڕانەوەیە وا نەبێت، لەوانە کایا پێی وایە کە گوڵمەز بۆخۆی لەبەر چەند هۆیەکی دیکە بۆ ماوەیەکی کاتی رۆژنامەکەی داخست لەوانە جەریمە یاساییە گەورەکان. لەراستیدا ئەوە مانای ئەوە نییە کە ئۆجەلان تایبەتمەندیی لەو جۆرەی تێدا نییە، چوون هەم گوڵمەزو هەم هەڵسوڕاوانی یەکەکەیش لەرۆژنامەکەدا دواتر تێگەیشتن کە هەمووان بۆچی لەرۆژنامەکە دەرکران.

یەکێك لە نوسەرانی تورك هاتە لای منو پێی گوتم: "پێم وابوو لەیەکەکە تێگەیشتووم، وەلێ دووای ئەمە ئیتر نازانم". لەتەك گوڵمەزدا پێکەوە لەقاوەخانەی

ئیسین دانشتبووین‌و ئەو قاوەی دەخواردەوەو چاوەڕێی وەستانی بارانەکە بوو، پێم وت "من پانزە ساڵە لەنێو پەکەکەدا بوومە، وەلێ هەنووکە هیچ تێنەگەیشتووم".

## خۆشەویستی و جەنگ

حوسەین تۆپیقدەر وەختێ کەوتە نێو گێژاوی خۆشەویستییەوە تەمەنی نێزیکەی ٠: ساڵێك دەبوو. ژنە شۆڕشگێڕێکی فرە گەنجتر بەنێوی هێڤیدار. لاوێکی تازە پێوەست بوو کە نێردرابوویە نێو چیاکانی گارزان. لەوێ حوسەین فرەماندەی یەکەیەك بوو. کە نێزیکەی ١٠٠ گەریلایەك دەبوون. حوسەین لە یاداشتە بڵاونەکراوەکانیدا نوسیبووی "ئەو ڕۆژەم لەیادە کە ئەو خانمە گەیشتە لامان". حوسەین زانیارییەکانی پاش چەند مانگێك لە پێکگەیشتنمان دایە من. ئەو لەوێدا نوسیبووی: "ئەو خانمە لەرەوشێکی شەرمنی‌و دڕدۆنگیدا بوو"[228].

هێڤیدار نێزیکەی ١٨ ساڵێك دەبوو، ئەو دووەم کەس بوو لە خێزانەکەی کەپێوەندیکردبوو بە پەکەکەوە. خوشکەکەی پێش وی هاتبووە نێو گەریلاکانەوە، وەلێ لەو کاتەوەی کە هاتبووە شاخ هیچ یەکێ هەواڵێکی لەبارەیەوە نەبیستبوو، وادیاربوو کە لەیەکێ لە پێکدادانەکاندا لەنێو چووبێت.

لە ڕاستیدا ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێت کە هێڤیدار هیچی لەبارەی پلانەکەیەوە بە داك‌و بابی نەوتبێت. ئەو دواتر بە حوسەینی وت کە یەکێك لەو هۆکارانەی کە وایکرد پێوەندیبکات‌و لەداك‌و بابی هەڵبێت ئەوەبوو کە ئەو بەردەوام لەتەك دایك‌و بابیدا دەرگیربوو، ئەو مشتومڕی دەکردو دەکۆڵییەوە. وەلێ ئێستەکانێ کە ئەو لەنێو گروپە شۆڕشگێڕەکەدایە، ئیدی بیرکردنەوەی دووەمی هەڵبژاردووە. ئەو خانمە لە شاردا پێگەیبوو، لەنێوەندی تورکیا دا، هەربۆیە لەوە تێگەیشتبوو. کە چەند دژوارە لەو ژینگەیەوە بێیتە فەزایەکی کراوەی وەك شاخ‌و یەکلابکرێیتەوە. ئەو ئیدی فرسەتێکی

[228] Unless otherwise indicated, all of Topgider 's quotes are drawn from the unpublished memoir he gave to me.

لەبەردەمدا نەبوو بۆ ئەوەی درێژە بە رێبازەکەی بدات، چوون هەموو ئەو تایبەتمەندییەی خۆی لەدەست دابوو، تایبەتمەندیی ئەو لە هەلومەرجێکدا خۆی دەبینییەوەبوو کە هەموو رۆژێك لەنێو بەرگێکدا بوو.

رۆژێك ئەو خانمە دێتە نێو خێوەتەکەی حوسەینو پێی دەڵێ: "ئیدی ناتوانم بەردەوامبم، ناتوانم لەبەردەم ئەم رەوشەدا بوەستمەوە". ئەو دەگریاو لەتەنیشت ئاگردانە داگیرساوەکەی نێوخێوەتەکە دانیشتبوو، ئاگردانی ئەو سۆپایەی کە خێوەتەکەی حوسەینی گەرمدەکردەوە. خانمەکە دەیوت: "ئەم ژیانە ئێجگار دژوارە بۆمن". ئەوە یەکەمجار نەبوو کە حوسەین وەك هەڵسوراوێکی دێرینی پەکەکە رووبەرووی کێشەیەکی وەها بێتەوە. هەمیشە تازە ئەندامەکان ئەوانەی روویان دەکردە چیا، لە دەستپێکی زستاندا کە ئیتر تەقو تۆق کەمتر دەبوویەوەو هەلو مەرجی ژیان ناهەمواردەبوو، ئیتر زۆرێك لەوانە دڵتەنگو بێزاردەبوونو خواستی وازهێنانیان لەلا گەلاڵە دەبوو. حوسەین نوسیبووی: "خەڵکی ژیانی گەریلاکان رۆمانسیانە لە کتێبو فلمەکاندا دەخوێنێتەوەو دەبینێت، لەراستیدا هەمووی وانییە، ژیان لێرە سەختو دژوارە".

هەموو فەرماندەکان مژوڵی ئەوە بوون کە چی بکرێت تا شۆڕشگێڕەکان واز لە تەڤگەرەکە نەهێنن. وەڵامێکی ساناو چارەسەرێکی بێ گرێو گۆڵ بوونی نەبوو. چوون ئەوانەی کەوازیان دەهێناو دەگەڕانەوە ماڵێ، رەنگ بوو لەلایەن پۆلیسەوە دەستگیر بکرێنو زانیارییان لە زاربێتەدەر، کە بنکە سەربازییەکانیان لە کوێنو چ گوندێك هاوکاری تەڤگەرەکە دەداتن. یاخۆ دەبوو ئەوان بۆ خۆیان بچن زانیارییەکان بدەن تا لە لێپێچینەوەو دادگاو زیندان قوتاربن.

لەمبارەیەوە حسێن تۆپیقدەر بە گلەییەوە دەیگوت: "هەموو کات کە یەکێکمان لێ هەڵدەهات، گەنجینەو جبەخانەکانمان لەلایەن سەربازەکانەوە ئاشکرادەبوونو دەدۆزرانەوە یاخۆ ئەو دێهاتییانەی کە یاریدەی ئێمەیان دابوو دەستگیردەکرانو دوچاری مشکلێ دەبوونەوە".

لەبەر ئەو هۆکارانەو هاوکات لەبەر هۆکاریی ئایدیۆلۆژیی پەکەکە کە ڕێگەی ب
وازهێنان لەخەبات نەدابوو فرە بەکەمی گەریلاکان ڕێگەیان پێدەدرا واز لە چیا بهێنن و
گەڕێنەوە ماڵێ.

هەربۆیە حوسەین دەیەویست ئەو خانمە لاوەی کە گەرەکی بوو خۆی یەکلابکاتەوە
قایلبکات بەمانەوە لەشاخ. خانمەکە وادیاربوو فرە دڵتەنگە. حوسەین بەڵێنی پێدا لەگەڵ
هاتنی بەهاردا بینێرێت بۆ نێو شار تا لەوێ کار بۆ تەڤگەرەکە بکات. ئیتر خانمەکە بە
بیستنی ئەم هەواڵە فرە کەیف خۆشبوو و بزە گەڕایەوە سەر لێوەکانی. حوسەین لە
یاداشتەکانیدا فرە بە کەیفەوە نوسیویەتی: "ئێمە قسەگەلێکی فرەمان دەکرد".

گەریلاکان لەماوەی زستاندا کرابوونە ٤ یەکەی بچوکترەوە. ئەوان لەدەوروبەری
دارستانێکی چڕو زەبەندا بوون کە بەتەنیشت بارەگایەکی سەربازیی ئەرتەشی تورکیەوە
بوو. لە ڕاستیدا ترسێکی وەك ئەوەی کەلە گۆڕێدا هەبوو بوونی نەبوو. ریزە درەختە
چڕەکانو بەفری سەنگینی نێوچەکە پەرژینێکی سروشتییان بۆ گەریلاکان دروستکردبوو.
زنجیرەی خێوەتەکانی گەریلاکانی حوسەین بەجۆرێك ڕێکخرابوو کە ٢ لەوان بۆ پیاوانو
دانەیەکیان ئافرەتی تێدابوو. خێوەتەکان بە ڕاخەری ئەستوورو ڕاگر بە تەختەی باریكو
پتەو ڕاگیر کرابوونو لەنێو هەریەکەیاندا سۆپای دارینی تایبەت هەبوو بۆ
گەرمکردنەوەیان. ڕۆژانە ئەو بەفرەی کە باریبوویە سەر خێمەکان پاکیان دەکردەوەو
ڕایان دەماڵیو هاوکات دارو چیلکەیان گرد دەکردەوەو ئاوی پاکیان دەهێناو سیمیناری
سیاسییان دەبەستو نانەوای تایبەتیان هەبوو بۆ دروستکردنی نانو نانیان دەکرد.
شەوانەشیان بەکاری شانۆو گۆرانیو تەرفیهیاتو چیرۆکەوە بەڕێدەکرد.

لەوەختی بارینی بەفرداو لە زستاناندا بەتەواوی ڕێگەکانی سەر بە چیای گارزان
دادەخرانو هاموشۆ ئەستەم دەبوو، ئیدی کەسێك گەر لەوێندەر بووایە هەستی دەکرد
کە جیهان هەر بریتییە لەو نێوچەیەو لەدنیای دەرێی خۆی بەتەمامی دادەبڕا.

حوسەین نوسیبووی:"لەو شیوە تەنگەبەرەدا جیهان بریتی بوو لە ٣٠ کەس‌و چوار خێوەتگەو بەس". هەروەها ئاماژەی دابوو کە هەندێکجار ئێمە دوژمنەکانمان لەیاد دەچوو، ئەوانیش ئێمەیان لەخەیاڵدا نەبوو".

بەگشتی لەزۆربەی کاتەکانی ساڵدا جەنگاوەرانی نێوخۆی تورکیا فرەبەکەمی هەستی ئارامش‌و بواری پێوەندیی‌و مامەڵەی بەهێزیان هەبوو لەتەك دەوروبەردا.چوون خەباتی بەردەوام بۆ دابینکردنی کۆگاو گەنجینەکانی شاخ‌و ئارامشی بنکە کاتییەکانی گەریلا، هاوکات پلانی هێرش‌و بەرگریی دژ بە پەلاماری ئەرتەش بوارێکی کەمی بۆ وزەو تاقەی گەریلاکان هێشتبوویەوە تا بیانپەرژێتە سەر لایەنەکانی تری ژیان. لەگەڵ ئەوەیشدا جەنگاوەرەکان بەبەردەوامی هامو شۆیان دەکردو دەکرانە گروپی گچکە گچکە بۆ ئەنجامدانی چالاکی‌و دەستڕاگەیشتن بە ئامانجەکان. هاوکات دەنێردران بۆ نێوچەکانی ترو دەبوونە تەتەرو گەیەنەری پەیام‌و هۆشدارییەکانی تەڤگەرەکە. هەروەها لە شوێنانێك دەمانەوە تا گردکردنەوەو رێکخستنی ئازوقەو پۆشاکی گەریلاکان بۆ شاخێ تەرتیب بدەن. بەمجۆرە ئەوان بۆیان هەبوو جارجار لە رووداوەکانداو لە پێکدادانە چاوەڕواننەکراوەکاندا لەتەك ئەرتەش بکوژرێن‌و بکەونە مەتەرێزی دوژمنەوە.

بەڵام لەزستاناندا وەختێك کە بەتەواوی ژیان کش‌و مات دەبوو، ئیتر جەنگەکان خامۆشدەبوون. لەو ماوەیەدا جەنگاوەران دوچاری وڕسبوونێکی رۆتین دەبوونەوە، ئیتر زەمینەی لێکنزیکبوونەوەو دروستکردنی پێوەندی هاوڕێیەتی‌و سەرووی هاوڕێیەتی چێدەبوو.

حوسەین تۆپیقدەر لەو ماوەیەدا سەرنجی لەسەر هێڤیدار چڕکردەوە، واپێدەچوو ویش کەوتبێتە سەرنجدان بۆ حوسەین. لەیاداشتەکەیدا نوسیبووی: "جارجار لە وانە سیاسییەکاندا تەماشای یەکتریمان دەکرد. وەختێکیش لەناکاو پێك دەگەیشتین، ئیدی دەوەستاین‌و پێکەوە قسانمان دەکرد".

هێڤیدار خۆی یەکلاکردبوویەوە بۆ ژیانی گەریلایی، ئەو ئیتر وزەو ورەی هەبوو، ئارەزووی بۆ کارەکەی لا چێ ببوو. ئەو بەتامەزرۆییەوە تێکەڵ بەو پیادە ڕەویانە ببوو

كە بەسەر تولە ڕێگە بەبەفرداپۆشراوەکاندا دەیانبڕی بەرەو ئاواییەکانو لەوێ فرە بەسانایی بەشداریی لە گردکردنەوەی پێویستییەکانو کۆگاکانی شاخ دەکرد. هاوکات شورو شەوقی هێڤیدار بەتەواوی حوسەین تۆپیقداریشی گرتبوویەوە. هێڤیدار شەوانە پاسەوانی دەگرت. ئەرکی پاسەوانەکان بە شێوەیەکی سەرەکی بۆ ئەوە بوو دڵنیابن لەوەی سۆپاکان دەگڕێن، ئەگەر نا سەرماو سۆڵە هەرزوو خێوەتەکانی دەکرد بەیەخ. ئەو زۆرجار سەرپەرشتی ئاگری سۆپای خێوەتەکەی حوسەینیشی دەکرد. گەر لەوکاتانەدا حوسەین بەخەبەر بوایە ئیتر چەکەکەی دادەناو پێکەوەو بەتەنیشت یەکەوە رازو نیازی دڵی خۆیانیان دەکرد. گەریش حوسەین نوستبووایە، ئەوا بەبیانووی چاخکردنی سۆپا دارینەکەو هەڵخزانی دارو چیلکەکان زرومو هۆڕی دەکرد تا بەئاگای بهێنێت.

لەراستیدا وتوێژەکانیان فرە نەدەچوو بەلای سیاسەتو بگرەو بەردەی جەنگدا، حوسەین لەوە دڵنیابوو کە ئەو گەرەکیەتی شتێکی تر بڵێت.

حوسەین لەم بارەیەوە رونیکردووەتەوە: "وەك چۆن قسەکانمانو چۆن روانینەکانمان بۆیەکتری جیاواز بوون، لەوانەبوو لەنێوانماندا پێوەندییەکی سۆزداریی دروستبوو بێت. بەڵێ جۆرێك لە هەستی تێکەڵ لەناخمدا هەبوو، من نازانم ئەوە چۆنە، وەلێ لە ناخمدا شتێك هەبوو لەنێوان خۆشەویستیو بەزەییدا".

خۆشەویستی لەنێو پەکەکەدا نەناسرابوو، وەلێ وەك شتێکی یاساغو مەترسیدار لێی دەڕوانرا[٢٢٩]. جەنگاوەر پێویستبوو هەمیشە بەئاگابێتو خۆشەویستی بخاتە لاوە.

حوسەین نوسیبووی: "هەستو سۆزەکان میانەڕەو و نەرممان دەکەن، ئەوان راماندەکێشنە شوێنێك کە دوورکەوینەوە لە واقیعی ئازاراوی ژیانمان. چونکە دوژمن هەستو سۆزی نییە، ئێمە پێویست بوو هەمیشە ئاگاداری ئەوە بین".

لەراستیدا خۆشەویستی نەدەتوانرا سنووری بۆ دابنرێت. وەلێ پێوەندیی سێکسی لەتەك ڕەگەزی بەرانبەردا گوماناویو هەستیار بوو. تەنانەت دووبارەکردنەوەی

---

229 Apart from firsthand interviews with former militants, this section in" corporates information from Buldan, PKK'de Kadin.

سلاویش لەتەك رەگەزی بەرابەر دەبوویە مایەی سەرئێشەو لێپێچینەوە. بەم پێیە پێوەندی سێکسیی پەتاتەن رێگەی پێنەدرابوو.

دیارە لەویێ هەمیشە واتەوات و قسەکردن لەوبارەوە لەگۆڕێدابوو. دەوترا کە فەرماندەگەلێکی دیاریکراوی پەکەکە لەتەك جەنگاوەرە ئافرەتەکاندا دارای پێوەندیی سێکسین، هەروەك ئەو دەنگۆیەی کە خرابوویە پاڵ خودی ئۆجەلانیش. زۆرجاریش ئەم دەنگۆیانە تەنها فرت و فێڵ بوون، بۆنموونە دەنگۆیەکی وەها بۆ فەرماندەیەك رەنگبوو کاربکاتە سەر کەسایەتی و نێوبانگی و لەوەدا لەکەداری بکات کە ئەندامێکی پابەندە بەپەکەکەوە.

نەوال وەك فەرماندەیەکی مێیینە لەم بارەیەوە دەیگوت: "هەندێك کات ئەو شتانەی کە گوێت لێیان دەبوو ئەوەبوو کە کەسێك پێوەندی لەتەك کچێکی دیاریکراو هەبووە، بەو هۆیەوە هەم کارەکەی و هەم نێو و نێوبانگی لەدەستداوە".

رێزو شکۆ تەنها شتێك نەبوو کە لەپێوەندیی لەتەك کچاندا لەدەستبدرێت، بەڵکو پێوەندیەکە هۆیەك بوو تا ئەو کەسە قۆڵبەستبکرێت و بخرێتە نێو زیندانەوە. هەندێك جار سزادانی ئەو کەسانە سەریدەکێشا بۆ کوشتن و لەنێوبردنیان.

دیارە کە لەو بارەیەوە چیرۆك گەلێك دەگێڕنەوە کە بەهۆی خۆشەویستییەوە هەندێك کەس دەستگیرکراون و هەندێکیش کوژراون.

لەسێدارەدان رێگەیەکی توند بوو بۆ سزادانی ئەو کەسانەی کە گلابوون لە خۆشەویستی و سێکسەوە. وەلێ ئەوە ئێجگار پێویست بوو تا جۆرە سنورێك لەنێوان مەردانی گەنج و کچانی نێو پەکەکەدا پارێزراو بێت. شۆڕشگێڕکان پێش ئەوەی ببنە گەریلا زۆریان ئەزموونی ژیانی سێکسییان کردبوو. کچان و کوران تا خزم و خوێشی یەکتر نەبوونایە بۆیان نەبوو تێکەڵبن. هاوکات کچان خۆیان بە پاکیزەیی دەهێشتەوە تا بتوانن هاوسەری ژیانیان هەڵبژێرن. وەلێ ئێستا لەژیانی گەریلاییدا کچان و کوران شان بەشانی یەك لەچالاکی و خەباتدان. تەنانەت بۆ خەوتنیش لە کەمپە کاتییەکانی جیادا هێند لێکدوورنەدەکەوتنەوە. هەربۆیە دەبوو جۆرێك لە لێپێچینەوەو چاودێری مۆڕاڵی

هەبووایە. ئەگەر نا، نەك هەر بێسەرو بەرەیی دروست دەبوو، بەڵکو خێزانە کوردەکانیش چیدی ڕێگەیان نەدەدا زارۆکانیان پێوەندیی بکەن بەڕیزەکانی پەکەکەوە. باتوفا کچێک بوو، لەتەمەنی پازدە ساڵیدا دەستبەرداری خوێندنی ئامادەیی ببوو، ئەو لە چیادا ببووە گەریلا. بۆخۆی لەم بارەیەوە دەیگوت: "ئەوە تەنها ڕێگە بوو، کە پێویست بوو سێکس قەدەغە بکرێت، چوون گەر وانەبا، هەرگیز کوردەکان زارۆکانیان نەدەناردە بەرەی پەکەکەوە. وەلێ پێم وابێت یاساغبوونەکە فرە زیادەڕۆو توند بوو، تەنانەت سلاوکردن لەرەگەزی بەرامبەر دەبوویە سەرئێشەو دوور نەبوو قۆڵبەستت بکەن".

هەندێك لەفەرماندەکان ڕێیەکی نێوەندییان گرتبوو لەبەرامبەر پێوەندییە سۆزدارییەکاندا، یان چاوپۆشییان دەکرد یاخۆ بەرووخۆشییەوە دەجولانەوە تا ڕێگریی بکەن لە درێژەدان بە پێوەندییە فیزیکییەکان، وەلێ هەموو ئەم نهێنییەیان بە داخراوی ئەهێشتەوەو هەموانیان دەخستنە ژێر چاودێریەوە. حوسەین زۆرجاران گەریلاکانی ڕووبەڕووی هەڕەشەو گوڕەشە کردبوویەوە، ئەوانەی باوەڕی وابوو نیازی نێزیکبوونەوەیان هەیە، وەلێ لەئێستادا بۆخۆی کەوتبووە داوی ڕەوشێکی لەوجۆرەوە.

ڕۆژێك هێڤیدار وێنەکانی خۆی پیشانی حوسەین دا، ئەو وێنانەی پێش پێوەندیکردنی بە تەڤگەرەکەوە گرتبوونی. حوسەین نوسیبووی: "ئەو بێ ئەنداز جوان بوو". حوسەین لەو بارەوە بەئاوازێکی ئیحراجو شەرمەوە ئەم ڕستەیەی دەردەبڕی: "ئەو جوانتر لەو جلانەیدا پێشچاو دەکەوت". ڕۆژێکی دیکە حوسەین تێبینی جلەکانی هێڤیداری کرد. جلو بەرگی گەریلاکان پانتۆڵو شێرتی سەوزی گوشاد بوون. لەگەڵ شاڵو چاکەتی ئەستوور، کە لە زستاناندا بەجۆرێك بوو تەنی گەریلاکانی سەغڵەتکردبوو. حوسەین پێشنیاری کرد بۆ هێڤیدار تا لەنێو کۆگای جلوبەرگەکاندا پۆشاکێکی نوێ بپۆشێت. لەم بارەیەوە نوسیبووی: "ئێمە پۆشاکگەلێکی فرەمان هەبوو، خەزێنەکانمان پڕ پڕ بوون لە جلو بەرگ". وەلێ هێڤیدار شانەکانی هەڵتەکاند. ئەو بە حوسەینی وتبوو قەیدی نییەو تازە بەمانە ڕاهاتووم. تۆپیقدەر لە وەڵامەکە دڵی ئاوی نەخواردبوویەوە. هەربۆیە

سەبارەت بەوە بۆخۆی نوسیویەتی: "نەمدەزانی چۆن پێی بڵێم نامەوێت ئەو جلە کۆنانە بپۆشێت".

ئەو تەنها جارێك پێداگریکرد. تا جارێك پاش ئەوەی هێڤیدار پیازی خواردبوو تا سود لە ڤیتامین سی وەربگرێت بۆ تەندروستی. حوسەین پێشنیازی بۆکرد کە گیاهانێکی دی هەن کە بۆندارنین‌و هەروەها دارای ڤیتامین سین. چونکە رێگەی زۆرهەن بۆ تەندروستی ژیان‌و چاودێریکردنی خۆ.

رۆژێك کە ٥٥ هەمین رۆژی مانەوەی گەریلاکان بوو لەشیوەکەدا، حوسەین چووە خێوەتەکەی خۆیەوە تا سیگارەکەی بکێشێت. ئەو تێبینی کۆپتەرێکی کرد کە بەسەرویانەوە گوزەری دەکرد. لەو هەرێمەدا کە پڕپڕبوو لە بنکەی سەربازی تورکیاو تەواوی رێگاکانیش بەبەفر کلۆمدرابوون.

هەربۆیە لەرەوشێکی وەهادا بوونی کۆپتەر شتێکی نامۆ بوو. وەلێ ئەو رۆژە کۆپتەرەکە بە ئاسمانی شیوەکەدا دەسوڕایەوە، پاشان دوو فڕۆکەی کوبرا هاتن‌و رووەو بارەگاکانی پەکەکە نێزیك بوونەوە.

فڕۆکەکان بۆردومانی شیوەکەیان کرد. ئەوکات حوسەین رووپۆشی خێوەتەکانی بەبەفر دانەپۆشیبوو تا فڕۆکەکان فریو بدات. هەربۆیە لەدەرێ مابوونەوەو دەترسان هەرجوڵەیەکیان ببێتە مایەی ئاماژەدان بە فڕۆکەکان. ئەوان بەردەوام بوون لە بۆردومانی شیوەکەو گردۆڵکەکانی دەوروبەری تاوەکو رێ لەهەرجۆرە هەڵهاتنێکی گەریلاکان بگرن. گەریلاکان هاتنە لای حوسەین‌و ئەویان بردە شوێنێکی نیوە پەنهان‌و بەرتەسك بەنێو چیاکەدا. ئەوێ دەیڕوانی بەمل گردەکاندا، سەربازانی تورك کەمتر گومانیان لەهەڵهاتنی گەریلاکان دەکرد لەو قوڵەوە. ئیتر پیاوەکان دەستیانکرد بە هەڵزنانێکی سەخت بۆ لوتکەکان، شۆرشگێڕەکانی تری شیوەکەیش لەلایەکی ترەوە هەڵگەڕان بە بەرزاییەکاندا. ئەوان بەگورجی لە لوتکەی تەپۆڵکەکاندا دەستیانکرد بە لێدانی خەندەقێك بەنێو بەفرەکاندا بەو هیوایەی بتوانن لەسەرچۆکان خۆیان لەنێویدا گرمۆڵەبکەن.

لەکۆتایدا وەختێك فڕۆکەکان کشانەوەو بۆردومانەکە دومایی هات. حوسەین جەنگاوەرەکانی هەر دەژماردو دەژماردەوە، هەندێك لەوانە شوێن بزر ببوون. یەکێ لەوانەی دیار نەمابوو هێڤیدار بوو، کاتێکی زۆر تێپەڕی. ژنو پیاوێك دەرکەوتنەوەو پاشان پیاوێکی دی لە جەنگاوەران هاتەوە. حوسەین لە دوایین کەسی گەڕاوەی پرسی "خەریکە چی روودەدات؟". تەماشای نێوچاوی پەشۆکاو هەڵبزرکاوی کەسەکەی دەکرد. "دووان کوژران، هێڤیدارو جەندا، کۆبتەرەکە هەوەڵجار بۆردومانی خێوەتی ژنەکانی کرد. لەوانەیە ئەوان درەنگ فریای خۆیان کەوتبن‌و خێمەکەیان جێهێشتبێت".

هیچ دەرفەتی شین پۆشیو گریەو هاواریش نەبوو. فڕۆکە شەڕکەرەکان گەڕابوونەوە ئاسمان‌و بەسەر سەر گەریلاکانەوە بوون‌و بۆمبیان دەهاویشتە نێو شیوەکەوە. هێشتا وەختی رۆژ بوو، لەبەر ئەوە دژوار بوو بتوانیت خۆت حەشار بدەیت. گەریلاکان لەچوارچێوەی پلانێکدا بڵاوەیانکرد، تاوەکو پاش ئەوەی دنیا تاریکدابێ خۆیان بگەیەننە ئاواییەکی نێزیك‌ودیاریکراو. یەکێك لەفڕۆکەکان بە شوێنی حوسەینی زانیو بۆردومانی شوێنەکەی کرد. ناوبراو گەڕایەوە بۆ ئاراستەی چیاکەو خۆی هاویشتە دامێنی چاڵێکی بەرتەسکەوە. وەختێك هێزە هەواییەکانی تورکیا جارێکی تر لێگەڕان‌و کشانەوە. حوسەین لەحەشارگەکەی هاتەدەرێ. هاوکات هەندێك لە گەریلاکان گەڕانەوە شیوەکە تاوەکو چەك‌و تفاق‌و پاشماوە بەجێماوەکان گردکەنەوە. لەناو کەل‌و پەل‌و چەك‌و چۆڵەکاندا تفەنگەکەی هێڤیداریان هەڵگرتەوە. حوسەین تفەنگەکەی هێڤیداری هەڵگرت. ئەو تا ئەوکات هەرگیز نەیگوت بەهێڤیدار کە ئەو کەوتۆتە داوی خۆشەویستییەوە لەگەڵیدا. ئەو بۆ خودی خۆیشی بەئەستەم دانی نا بەو راستییەدا "من نەمدەویست دەربارەی هەست‌و سۆزم شتێك بەو بڵێم". ناوبراو بە مەرەکەبێکی شین‌و بە رێك‌و پێکی لەیاداشتە تەواونەکراوەکانیدا نوسیبووی: "خۆشویستنی هەندێك لەشتەکان جوانە، وەلێ ئێمە چارەیەکی ترمان نەبوو جگە لە خۆ یەکلاکردنەوەی هەست‌و کردەوەکانمان بۆ دوو شت، ئەوانیش مردن‌و کوژران یاخۆ شتێك کە لەدەسەلاتی خۆماندا نەبوو لێی دەربازبین".

## باسی سێهەم:

## ئاوێتەبوونی سیاسەتو جەنگ (١٩٩١-١٩٩٣)

پێش ئەوەی بەفر دەستکات بەبارینو رێگە سنووریەکانی هەرێمی کوردستانی ئێراق لەتورکیا دابخات، فڕۆکە جەنگییەکانی تورکیا دەستیان دەکرد بۆ دژە هێرشێکی بەربلاّو بۆ سەر بارەگاکانی پەکەکە لەچیاکانی باکوری ئێراق دا. هەڵکوتانە سەربازییەکەی ئەرتەشی هەوایی تورکیا لە مانگی هەشتی ١٩٩١ وە درێژەی کێشا تا مانگی پێنجی ١٩٩٢. ئامانجی ئەم هەڵمەتو هێرشانەیش بەدوور راگرتنی سنوورەکانی تورکیابوو لەبارەگاو بنکە سەربازییەکانی پەکەکە. وەڵێ دژوار بوو بۆ ئەرتەشی تورکیا بتوانێت ئامانجەکانی بەدروستی بپێکێت. چوون گەریلاکان لەهەناوی چیاکانو لەنێو ئەشکەوتەکانداو لەنێو پەناگە سەختەکاندا جێگیر ببوون. لەبەر ئەوە پاسەوانە سنوورییەکانی تورکیا چانسێکی فرەکەمیان هەبوو تابتوانن گەریلاکان لەو سنورانەدا هەڵکەنن.

هاوکات هێرشو هەڵکوتانەکانی تورکیا لەلای هەریەك لە ئەمریکاو بەریتانیای هاوپەیمانیو فەرەنسا، ببوویە پرسێکی هەستپێکراو لەو پێودانگەوە نائارامیی خۆیان بۆ رەوشەکە دەردەبڕی. هەموو ئەو ولاّتانە رازیببوون بە دروستکردنی ناوچەیەکی ئارامی دژە فڕین لەباکوری ئێراق بۆ کوردەکانی ئەوێ تا سەدامو هێزە ئاسمانییەکانی بۆیان نەبێت بەئاسمانی ناوچەکەدا تێپەڕین. کەچی فڕۆکەکانی تورکیا سنووری ئاسمانی ئێراقیان دەبەزاندو ئەو ناوچە دژە فڕینەیان دەبەزاند تا کێومالّی بنکەو بارەگاکانی پەکەکە بکەن[٢٣٠].

---

[230] Description of the 3rd Congress draws mainly on Celik's recollections, along with information provided by PKK members who later received infor" mation about the proceedings. Published sources include Birand, Apo ve PKK, 141; and Yuce, Bildirgesi, 233–234.

لەهەمان کاتدا کوردانی تورکیا دەنگی نارەزاییان لەهەمبەر بندەستبونی نەتەوەیی و هێرشی سەربازیی بۆ سەر ئاوابیەکانیان بەرزکردەوە. ئەوە سەخت بوو بۆ کوردانی تورکیا کە تێبگەن بۆچی کوردانی ئێراق شیاوی پاراستنن‌و ئەوان هیچ کارێکی بەدەمەوەچونێکیان بۆ نییە.

هەندێك لە شرۆڤەکارانی نێونەتەوەیش سەریان لەو راستییە سوڕدەما کە ئەو جیاوازییە چییە کە سیاسەتیی کوردی باش‌و کوردی خراپ رەچاودەکات. کیڤن ماکیرنان ئەو کەسەی دەرهێنەری فلمێکە رێك بەنێوی کوردی باش‌و کوردی خراپ. لەراڤەی ئەوەدا دەیوت: "کوردی باش بریتین لە کوردانی ئێراق، ئەوانەی ئێمە یارمەتیان دەدەین‌و ئەوان قوربانی دەستی سەدام حوسەینن، کوردانی خراپیش کوردی تورکیان. ئەوان دەستیانداوەتە یاخیبوونی سەربازی دژ بەتورکیا. تورکیای هاوپەیمانی ئەمریکا ئەوەی دواین‌و خاسترین چەکەکانی لەئەمریکا وەردەگرێت."

وەلێ هەڵمەتە سەربازییەکانی تورکیا هەندێکجار شپرزەو پەراگەندەو هەوانتە بوون لەوێدا کوردانی ئێراق لەسنورەکاندا دەکوژران‌و برینداردەبوون‌و دێهاتەکانیان بۆردومان دەکرا. ئەوکات بەرپرسانی کوردی ئێراق مژوڵی بەرێوەبەرایەتییەکی خۆبەرێوەبەریی بوون، هەربۆیە وادیاربوو کە رووداوەکان بە ئەنقەست لەسنوورەکانی باکوری ئێراق ئاڵۆز دەبوون. بەرپرسە کوردەکانی ئێراق لەو باوەڕەدابوون تورکیا بەم کارەی دەیهەوێت هۆشداری بداتە ئەوانیش. یاخود پێویستە یاریدەی ئەرتەشی تورك بدەن بۆ کێومالی پەکەکە لەسنوورەکەدا یاوەخۆ ئەوانیش وەك بەشێك لە کێشەکان چاویان لێدەکرێت. لە بارەگای پارتەکەی تاڵەبانی لە زاخۆ جەلادەت تەها مەزهەر بە گازاندەوە دەیگوت: "گەرەکیانە ئێمە بتلێنن لەجەنگی دژ بە پەکەکەوە". بارزانی رایگەیاند کە ئەنکەرە پێویستە سنوورەکانی خۆی بپارێزێت، لەجیاتی ئەوەی کوردانی ئێراق بکاتە بەرپرس لە دابینکردنی ئاسایشی سنوور کە هیچ کات ئەرتەشی تورکیا نەیتوانیوە دابینی بکات.

سەرۆکایەتی کوردستانی ئێراق لەوەدا دڕدۆنگ‌و گەشبین نەبوون کەوا رابکێشرێنە نێو جەنگی نێوان پەکەکەو تورکیاوە. هەریەك لە جەلال تاڵەبانی‌و مەسعود بارزانیش باش

دەیانزانی کە بەشێك لە پاراستنی نێوچە ئارامەکەی باکووری ئێراق پەیوەستە بە پیشاندانی نیاز پاکی تورکیاوە"[231].

دیارە کە پشتیوانی تورکیا بۆ پاراستنی نێوچەی ئارام لەباکوری ئێراق پێویستییەکی هەنووکەیی‌و لەپێشچاوگیراو بوو.

گەشتە ئاسمانییەکانی هاوپەیمانان کە لەباکوری ئێراقدا دەگوزەران، لەبنکەی ناتۆ لەنێوخۆی تورکیادا ستاریان دەگرت. هەر شەش مانگێك ماندێتی چالاکییەکان کە نێودەبرا بە ئۆپەراسیۆنی ئارامش لەلایەن پەرلەمانی تورکییەوە نوێدەکرایەوە. لەگەڵ ئەوەی کوردانی ئێراق پشتیان دەبەستە تورکیا وەك تەنها دەریچەی سەرەکییان بۆ پێوەندیی کردن بە جیهانی دەرەوە. ئەوان بەبەکارهێنانی گوزەری سنووریی بەندەرەکان هەموو پێداویستییەکانیان لەشمەك‌و هێزی مرۆیی‌و خەڵك لەدەرێ پێدەگەیشت.

لەمبارەیەوە بارزانی ئاماژەی دا: "رەچاوکردنی پێوەندییەکانمان لەگەڵ تورکیا ئێجگار پێویستییەکی حەیەویە"[232]. هەروەها ئەنکەرەیش راستەوخۆ بەرژەوەندییەکانی خۆی لەپێوەندیی لەگەڵ سەرکردایەتی کوردانی ئێراقدا دەبینییەوە. تەنانەت لەکاتێکدا کە دەیەویست بزووتنەوەی کوردانی تورکیا لەو رێگەیەوە سەرکوت بکات.

گۆڕان لە هەڵوێستی تورکیا بەهۆی سەرۆك تورکوت ئۆزالەوە هاتە گۆڕێ. ئەو گەیشتبووە بڕوایەك کە ئەنکەرە پێویستە ئەو تەوقی ترسە لەکوردان بشکێنێت، ئەگەر بێت‌و بیەوێت رۆڵێکی کارا لەرۆژهەڵاتی ناویندا بگێڕێت.

ئۆزال ئەنکەرەی خستبووە رەوشێکی دڕدۆنگیەوەو نەیەویست لایەنی هاوپەیمانان بگرێت لەجەنگی کەنداوی ۱۹۹۱دا. هەربۆیە لە ئازاری هەمان ساڵدا بەنهێنی چاوی کەوت بەتاڵەبانی‌و نوێنەری بارزانی. ئەوەبوو ئۆزال پاش چەند رۆژێکی کەم دانی نا بەدیداری نێوانی لەتەك رێبەرانی کوردی ئێراق. ئەو دیدارانەی وڵاتی توشی شۆك کرد، چون

---

[231] Ocalan, 3. Kongre, 378.
[232] Yuce, Bildirgesi, 219.

تائەوكات تێكڕای ڕێبەرانی كورد وەك دوژمنی داخ لەدڵ تەماشادەكران. ئۆزال لەم بارەیەوە وتی: "خۆ هەمووان ئەو ڕێبەرانە دەبینن، گەر ئێمە لەگەڵیان كۆنەبینەوە، ئەوا ناتوانین زاڵبین بەسەر ئەو ڕەوشەی كە تێیدا دەیگوزەرێنین‌و لە قۆناغەكە كەڵك وەرناگرین"[٢٣٣].

دامەزراوەی سیاسی‌و سەربازی توركیا، تەنانەت لەدەرێی سنوورەكانی توركیاشدا، دەستبەرداری دڕدۆنگییان نەبوون لە خواستە نەتەوەییەكانی كورد. وەلێ ئۆزال لەو باوەڕەدا بوو كە چێكردنی پێوەندی نێزیك لەگەڵ كوردانی ئێراقدا كاریگەریی توركیا لەسەر باكوری ئێراق فەراهەم دەكات‌و بۆ هەر حساباتێكی سیاسیی چاوەڕوانكراویش لەگەڵ بەغدادا سازو ئامادە تریاندەكات. واتێبینیدەكرا كوردانی ئێراق بەلایەنی كەمەوە ئۆتۆنۆمی یاخود جۆرێك لە فیدراڵییان بۆ دەستەبەر بێت، كە تێیدا بتوانن كاروبارەكانی تایبەت بەخۆیان راپەڕێنن. ئەم نەزمی چارەسەرە لەلایەن دامەزراوەی توركیاوە نەفرینكراو بوو. وەلێ ئۆزال بەهەموو جۆرێك ئامادەیی خۆی دەردەبڕی‌و ریسكێكی لەوجۆرەی ئەزموون دەكرد. تەنانەت پێی وابوو ئێراقێكی فیدراڵ‌و فیدراڵیی بۆ كوردانی ئێراق زیان بەبەرژەوەندییەكانی توركیا ناگەیەنێت. هەروەها ئۆزال پێی وابوو كە دامەزراندنی پێوەندیگەلێكی لەم جۆرە لەگەڵ كوردانی ئێراقدا تەنانەت ئەو راستیە دەداتە كوردانی توركیا كە توركیا داخ لەدڵ‌و رقئەنگێز نییە دژ بەكورد، بەڵكو تەنها گرفتی لەگەڵ ڕەوتی توندوتیژیی پەكەكەدا هەیە[٢٣٤].

لەلایەن ئۆزالەوە كلیلی ڕەوشەكە رازی كردنی كوردانی ئێراق بوو بۆ كەمكردنەوەی هێزو هەرەكەتی پەكەكەو ناچاركردنیان بوو تا هێزەكانی پەكەكە لەخاڵەسنوورییەكانی باكوری ئێراقدا وەدەرنێن.

---

[233] Information on Diyarbakir prison relies on interviews with former prisoners. Published sources include Zana, Bekle Diyarbakir, 336 – 346 and Prison No 5, 3–36; Yuce, Zindan Direnisi; and Helsinki Watch, Destroying Ethnic Identity (1988).

[234] Details are given in Yuce, Zindan Direnisi, 191–220 and Zana, Prison No 5, 28–35.

ئەنکەرە بۆ ئەو مەبەستە ئەوەی نەشاردەوە کە بۆ شکستی هێزەکانی پەکەکە ئاتاجی بەکوردانی ئێراقە. جەلال تاڵەبانیش لەهەوەڵ دیداریدا لە ئەنکەرە ئەوەی خستە روو کە بەکارهێنانی نەرمیو خەباتی ناتوندوتیژیی بۆ رەوشی ئێستای کوردانی تورکیا پێویستە.

تاڵەبانی لەلێدوانی بۆ رۆژنامەی وڵاتی نوێ لەهاوینی ١٩٩١ دا، کە رۆژنامەیەکی کوردی تورکی نێزیك لەپەکەکەبوو رایگەیاندبوو: "گەر ئێوە لەو پرسیارەگەرێن کە چ جۆرە کارێك بۆ چارەسەریی بکرێت، ئەوا سیاسەتم دەکرد، ئەگەر لەشوێنی پەکەکە بوومایە". هاروەها وتی: "بۆماوەی ساڵێك دەستم لەخەباتی چەکداریی بەردەداو پێم دەوتن چارەسەریی دۆزی کوردم دەویو خواستی دیالۆگم بەرزدەکردەوە"[235].

پەکەکە هیچ بایەخێکی پیشان نەدا بۆ راوەستاندنی هێرشەکانی. ئەنکەرەیش هەوڵیدا تا بۆشایی هێز لە باکوری ئێراق بقۆزێتەوە لەپێناو بەرژەوەندییەکانیدا. هەربۆیە هێزی سەربازی تورك لە کۆتایی ١٩٩١ و دەستپێکی ١٩٩٢ دا سنوربەزاندنی ئەنجامداو هەڵی کوتایە سەر نێوچە سنوورییەکانی باکوری ئێراقو تارادەیەکی کەم ئامانجەکانی فەراهەم هێنا. هێزی سەربازی پەکەکە لەنێوخۆی تورکیادا لەگەشەسەندندابوو، تواناکانیشی بۆ بەکارهێنانی بارەگا سەربازییەکانی لەباکووری ئێراق زەمینەی بۆ رەخسابوو، چوون لەوێوە خاڵی دەرچوونی هێرشەکانیان بۆ نێو تورکیا بێ گرێو گۆڵ بوو. لەلایەکیترەوە بارزانیو تاڵەبانی لە سنوور بەزاندنەکانی تورکیا بۆ کێومالّی گەریلاکانی پەکەکە نیگەران بوون. هەربۆیە پێویستبوو بەلایەنی کەمەوە گەریلاکان لەخاڵە سنوورییەکان خۆیان بەدوور بگرن. لەراستیدا ئەم رەوشەیش هێندەیتر تەنگژەی نێوان گروپە ئێراقیو تورکییەکانی بەرەو هەڵدێر دەبرد.

لەهاوینی ١٩٩٢ دا. زنجیرە کوشتارێك لەنێزیك زاخۆ روویدا. ئەوانە کوردی ئێراق بوونو پێوەندییان بەپەکەکەوە هەبوو، بەڵام دەرکەوت دژ بەپەکەکە چالاکییان کردبوو،

---

[235] Helsinki Watch, Destroying Ethnic Identity (March 1988), 15.

هەربۆیە پەکەکە لەنێوی بردن. دووابەدووای ئەوە جەنگاوەرانی بارزانی لەهەولی تۆڵەی یەکێك بوون لەو کوژراوانە. هەربۆیە هەڕەشەی هەڵکوتانە سەر بارەگاکانی پەکەکەیاندەکرد[236].

جەنگاوەرانی پەکەکەیش لەو باوەڕەدابوون کە پارتەکەی بارزانی وەك بەکرێگیراوێك. دەوڵەتی تورکیا بەکاریدەهێنێت بۆ مەرامەکانی. هەربۆیە بەتوندی گەمارۆی یەکێ لەرێگە سەرەکییەکانی گەیاندنی باکوری ئێراق بەتورکیاوە درا. لەم پێوەندییەدا شۆفێرە بارهەلگرەکانی تورك‌و کوردی تورکیا هەڕەشەکانی پەکەکەیان فرە بەجدی وەردەگرت. لەکاردانەوەی ئەوەدا تێپەڕبوونی ٥٠٠ بارهەلگر لەڕۆژێکدا و لەخالی سنووریی خاپوورەوە کەمیکرد بۆ نێزیکەی ١٢ بارهەلگر لە رۆژێکدا.

لەراستیدا کەسێك ناتوانێت لەوە دلنیابێت کە هێزو هەرەکەتی پەکەکە ئەو رەوشەی دروستکردووە. بەلام بەدلنیاییەوە تەنگژە سنوورییەکان لەتەمەی گەورەیان لەئابوری‌و داهاتی ئەوخالە سنوورییەی خاپووردا، کە ببوویە سەرچاوەیەکی سەرەکی داهاتی حکومەتی هەرێمی تازەدامەزراوی باشووری کوردستان.

وەختێکیش پەکەکە گەمارۆکەی لەسەر سنوور هەلگرت، نە تالەبانی‌و نەیش بارزانی لەمەزاجیاندا هیچ ئەجێندایەکیان بۆ دانوستان لەگەلّ پەکەکەدا نەبوو. تالەبانی گوتی: "پەکەکە تەنها هەلبژاردنێکی لەبەردەمدا بوو". ئەو زیاتر روونیکردەوەو گووتی: "پەکەکە یان دەبێت دەست هەلبگرێت لەبەکارهێنانی بنکە سەربازییەکانی لەباکوری ئێراقدا، یاخۆ دەبێت چالاکییەکانی خۆی بەرێتەوە بۆ نێوخۆی تورکیاو بەگوێرەی ستراتیژی خۆیان چالاکی ئەنجامبدەن"[237].

---

[236] Description of Pinarcik attack taken from reports in Milliyet and Cum" huriyet newspapers; other information uses Birand, Apo ve PKK, 141 – 145; Oz" can, PKK, 99 – 100; Imset, the PKK, 49 – 78; Helsinki Watch, Destroying Ethnic Identity (March 1988).

[237] Milliyet, June 24, 1987.

ئۆجەلان خواستەکانی ئەوی بەهەند وەرنەگرت. ئەو پێی وابوو باکوری ئێراق ئێجگار گرنگە بۆ مانەوەو گەشەی پەکەکە، بەتایبەت ئەوە لەکاتێکدا بوو کە تورکیا سوریای بەوە رازیکردبوو دەستبەرداری پشتیوانیکردن لە پەکەکە بێت. هەربۆیە لەمانگی نۆی ١٩٩٢ دا ئەکادیمیای مەسعود قۆرقمەس لە دۆڵی بیقاعدا داخرا.

پەکەکە هەندێك زەویی سیاجکراوی لە دیمەشقدا وەرگرتبوو، وەلێ بۆ مەشقی سەربازی نەگونجاوبوون. هاوکات وەك شیوی بیقاعیش جێگەی ژمارەیەکی زۆر گەریلای تێدا نەدەبوویەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا پەکەکە ئاتاجی بە کەمپێکی سەربازی هەبوو بەجۆرێك لەباربێت تا هێرشەکانی لەوێوە ئامادە بکات بۆ باکووری ئێراق.

## براکوژیی: شەڕی خوێناوی نێوان کوردەکان

لە کۆتایی مانگی نۆی ١٩٩٢ دا پەکەکە دەستی دایە زنجیرە هێرشێکی بەرفراوان بۆ نێوخاکی تورکیا. لەوانە هەڵیان کوتایە سەر خاڵی پێشەوە ژەندرمەکانی سنووری دێریك، لەئاکامدا ٢٣ سەربازو سیان لە پاسەوانانی گوند کوژران. دوواجار سەربازەکان توانیان گەریلاکان ناچار بەکشانەوە بکەن بۆ نێو سنوورەکانی ئێراقو زیاد لە ١٠٠ گەریلایش لەو پێکدادانەدا کوژران[٢٣٨]. چەند رۆژێك دوواتر لە ٢ی ئۆکتۆبەردا، نێزیکەی ٥٠٠ جەنگاوەری کوردی ئێراق بەدرێژایی سنووری تورکیا هێرشیان کردە سەر گەریلاکانی پەکەکە. بەزوویی هێرشە هەواییەکانی تورکیایش بۆردومانی ئەو شوێنانەیانکرد کە گەریلاکانی لێبوو.

فەرماندە سەربازییەکانی پەکەکە خۆیان بۆ هێرشێکی دلڕەقانەی لەو جۆرە ئامادە نەکردبوو. پەکەکە بەدرێژایی سنوورەکانی شەڕ مۆڵگەکانی ئازوقەو جبەخانەکانیان قایمکردبوو بۆ وەرزی سەختی زستان، لەبەر ئەوە بێجگە لەبەرگریی هەڵبژاردنێکی تریان لەبەردەمدا نەبوو. جەنگاوەرانیشیان بۆ جەنگێکی وەها هێند شارەزاو شیاو نەبوون.

---

[238] From a 1987 issue of Serxwebun, quoted in Birand, Apo ve PKK, 142.

ئەوانەی کە دارای ئەزموونی جەنگ بوون لەنێوخۆی تورکیا بوون. بەڵام چەکدارەکـ
سنوور کە بە ٢٠٠٠ جەنگاوەر دەخەمڵێنران هێند کارامەو چالاکی مەیدانەکانی جەنـ
نەبوون. ئەوان یان زۆر جەوان بوون، یان بیمارو ناساغبوون یاخۆ دارای ئەزموونی جەنـ
نەبوون.

نەوال کە خوێندکارێکی زانکۆبوو، مانگێك پێش هەڵگیرسانی جەنگەکە پێوەنـ
بەڕیزەکانی پەکەکەوە کردبوو. ئەو یادەوەری دەکرد چۆن بەبێ ترس‌و بیم کۆمەکـ
دەهێناو دەبرد بۆ جەنگاوەران. نێوچەی جەنگیی ئەو لە کەمپی هاکورك بوو لەباشو
نێوچەی سێگۆشەی سنووریی نێوان ئێراق‌و ئێران‌و تورکیا. ئەو دەیوت: "تا ئەوکـ
نەمدەزانی خەڵکی چۆن دەمرن". ناوبراو کاتێك دیدارەکەی دەکرد بۆم لە شوقەکەی
خۆیدا لە ئەڵمانیا تەنێ دانیشتبوو، هاوکات زارۆ نوێیەکەی لەئامێزیدا بوو. ئەو دەیو
"بەچاوی خۆمان فڕۆکە جەنگییەکانی تورکیامان لەسەرمانەوە دەبینی. من هەـ
بەردەوامبووم، دووای ئەوەی خانمێکم بینی مرد، ئیتر بەنەزمێکی جیاواز هەستـ
لاگەلاڵەبوو".

شەڕی کوردو کورد پشتیوانی جەماوەریی نەبوو، بەتایبەتی گەر شەڕەکە بۆ لەبری
دەوڵەتێك بکرێت کە کەمینەی کوردی بندەست‌و سەرکوت کردبوو. لەمیانی دوو هەفتەد
ئیتر جەلال تاڵەبانی کە زێدەتر حەزی بەدانوستان بوو تا لەجەنگ، کەوتە میانگیریی‌و
هێورکردنەوەی رەوشەکە. وەلێ بارزانی تەواوی ئەو ناوچەیە لەژێر رکێفیدا بوو کە
سەربازگەکانی پەکەکە تێیدا گەشەیاندەکرد، ئەو دیسان سوربوو لەسەر پاشەکشەو
دەرپەڕاندنی گەریلاکانی پەکەکە لەناوچەکەدا. لەهەمانکاتدا گەریلاکان لە زەحمەت‌و
زیاندا بوون. ئەوان کۆمەك‌و ئازوقەو هێزی پێویستیان بۆ بەرگری کردن لەخۆ هێند
لەبەردەستدا نەبوو. هەرچەند کە هێشتا گەریلاکان دەستبەرداری ئەنبارو کۆگاکانی
تفاقیان نەببوون. لەنێوەندی ئەو مانگەدا هێزە زەمینییەکانی تورکیا بەپاڵپشتی هێزە
ئاسمانییەکان هاتبوونە نێو سنووری باکوری ئێراقەوە. هاوکات لە ئۆردوگاکانی نێزیك
سنووری تورکیا ژمارەی گیانلەدەستدانی گەریلاکانی پەکەکە بەرزببوویەوە. ئۆرهان

دەیگوت: "خەڵكی شەكەت بوون، ئەوان خەو و خۆراكیان نەبوو، ئەوانە ئەو كەسانە نەبوون كە پێش مانگێك وەختێك بۆ یەكەمجار گەشتبوونە كەمپەكە بینیبووتن".

ئۆرهان جەنگاوەرێكی پەكەكە بوو لە بارەگای سەربازی هەفتانین دا . ئەو بۆخۆی ئەو لەتمەیەی بینی كە هێزە زەمینییەكانی كوردی ئێراقو ئەرتەشی تورك سرەواندیانە پەكەكە. رەوشەكە لە سەربازگەو ئۆردوگاكانی تری پەكەكەدا باشتر نەبوو، تەنانەت ئەو بارەگایانەیش كە نێزیكتر بوون لە سنوورەكانی ئێران. لەكۆتایی ئەو مانگەدا ئۆسمان ئۆجەلانی برای ئاپۆ، كە فەرماندەی كەمپی هاكورك بوو لەنێزیك سنووریی ئێران ئەوەی ئاشكراكرد كە خەزێنەكانیان وەختە كۆتاییان پێبێت. ئیتر ئەوان تەنها لەبەردەم دوو ئەگەردا بوون. یان دانبنێن بەشكستداو ملبدەن بۆ چارەسەر لەگەڵ كوردانی ئێراقدا یاخۆ بەردەوام بن لەجەنگ تا دووا هەناسەیان لەسەنگەردا دەدەن. لەمبارەیەوە نەوال دەیوت: "ئەو بەهەمووانی راگەیاند كە یان شەڕدەكەین تا خۆمان دەكوژینەوە یاخۆ ملدەدەین بۆ چارەسەریی سیاسیی".

لەژێر رەوشێكی ئاسایدا عەبدوڵا ئۆجەلان دووا بڕیاری خۆی دا. وەڵێ پێوەندیكردن لەگەڵ ئەودا سەخت بوو تا بڕیارەكەی بخەنەكار. فاروق بۆزكورت بەرپرسی كەمپی كوكوركا بەپێشنیازەكەی ئۆسمان ئۆجەلان رازی بوو. وەڵێ موراد فەرماندەی كەمپی هەفتانین ئەوەی دایە دوواوەو رایگەیاند كە بڕیارێكی بەرژەوەندخوازانەیە. وەڵێ ئۆسمان لەنێو زۆرێكدا كە ئەو وەك واقیعگەرایەكی سیاسی دەناسن ئەو راستیانەی بڕیارەكەی خۆی رونكردەوەو ئەوەیشی دایە دوواوە كە پاشگەز بێتەوە. نەوال پێی وابوو كە ئۆسمان بەبڕیارەكەی خۆی شادومان نەبوو، بەڵام رێگەیەكی تری شك نەدەبرد. نەوال لەم بارەوە رایگەیاند: "ئۆسمان دەیوت ئەنجامدانی بڕیارەكەم تاڵە وەك خواردنەوەی زەهر، بەڵام من ئەنجامی دەدەم".

ئۆسمان تیمێكی ناردن تا چاویان بەنوێنەرانی بارزانیو تاڵەبانی بكەوێت. دوواجار لە ٣٠ ئۆكتۆبەردا هەریەك لە ئۆسمان ئۆجەلانو سەرۆك وەزیرانی حكومەتی هەرێمی كوردستان رێكەوتنێكیان واژۆكرد. بەگوێرەی ئەو رێكەوتنە دەبوو پەكەكە هێزەكانی

لەسنوور بکشێنێتەوەو چالاکییەکانیشی لەباکوری ئێراقدا دژ بە نێوخۆی تورکیا رابگرێت[239]. لەبەرامبەردا پەکەکە کەمپگەلێکی نوێی نێزیك بەسنووری ئێران بۆ دیاریکرد. هاوکات رێگەی پێدرا کە چالاکی سیاسیو ناتوندوتیژ لەسنورەکانی ژێر کۆنترۆڵی هەرێم ئازادانە ئەنجامبدات.

ئیتر لەدەستپێکی مانگی یازدەدا ئەندامانی پەکەکە بەپێیانو بەشپرزەوی و دژوارییەوە بەرێکەوتن بۆ کەمپە نوێیەکانیان لەنێزیك سنووری ئێران. نەوال دەیگوت "ئێمە نەماندەویست برۆین، هەمووومان پەژارەو دڵتەنگ بووین، ئەوە وەك ئەوە وابوو لەبەینبرابین".

ئەرتەشی تورکیا بەردەوام بوو لەجەنگەکەیداو لەهەفتەی یەکەمی نۆڤەمبەردا تەرکیزی چالاکییەکانی خستە سەر کەمپی هەفتانین. لەوێ هەندێك لە پێگەی پەکەکە مابوون کە ئامادە نەبوون چەکەکانیان بکشێننە دوواوە.

بارەگای نوێی پەکەکە گوێزرایەوە بۆ زەڵێ، ئەوێ نێزیك بە سنووریی ئێران بوو. یەکێك بوو لە بارەگا دێرینەکانی تاڵەبانی لەوێدا کە نێزیك بە گوندێکی خاکەساری داڕووخاو بوو. جەنگەوانانی پەکەکە لەوێ خێوەتو بارگەو بنەیان لەنێو شیوەکانو لەتەختایی گردۆڵکەکاندا داکوتی. نۆهان دەیگوت: "هاوکات لەوێ خەڵکێکی هەڵهاتووی ورە بەردراو و دەربەدەر گردببوونەوە، لەوێ کێشە گەلێکی فرە هەبوو، کێشەی خۆراكو پۆشاکمان هەبوو".

بەزوویی کەمپەکانی ئەوێ پڕبوون لە کە سانی زامدارو زیاتر لە ٣٠٠ کەسی بریندار لەوێندەر داڵدەدرابوون. بەشێك لەوانە بەهاماکاری چەکدارانی کوردی ئێراق گوازرابوونەوە بۆ کەمپەکانی پەکەکە. هاوکات پەکەکە رایگەیاند کە ١۶١ کەس لە شەڕوانەکانی لە جەنگەکاندا کوژراون. وەك ئەوەی کە دەوترا کوردانی ئێراقیش بەنێزیکەی هەمان رێژە

---

239 Cumhuriyet, June, 26, 1987.

کوژراویان هەبووە. وەلێ قوربانیانی ئەرتەشی تورك هێند زۆر نەبوو، چوون ئەوان لەجەنگەکاندا هێزی زەمینییان فرە سنووردار بەکارهانی بوو.

هێزەکانی تورکیا بەشانازییەوە ئالآی نەتەوەیی تورکیایان لە هەفتانین بەرزکردەوە، وەلێ پاش ماوەیەك کشانەوە، چون هۆشدارییان دابوویە کوردانی ئێراق کە دەبوو بەرپرسبن لەپاراستنی ئاسایش‌و ئارامی سنوورەکانی نێوانیان. هاوکات هەوڵەکان بۆ دروستکردنی نێوچەیەکی دابڕاو وەك پشتێنەیەکی ئەمنی بەدرێژایی چەندکیلۆمەترێکی کەم شکستیان هێنا، چوون لەماوەکانی داهاتوودا یەکێك لە ئەفسەرەکانی ئەرتەشی تورکیی رایگەیاندبوو کە بارزانی‌و تاڵەبانی ئامادەییان تێدا نییە بۆ یاریدەدانیان لەو پرۆژەیەدا. لەبەرئەوە ئەرتەشی تورکیش ئەستەمبوو بۆی بتوانێت بەردەوام لەوسنوورانەدا چاودێریی هەبێت. چونکە هیچ پیاوێك لەناوسوپادا نەیدەتوانی ئەرکی سەربازیی خۆی بە فولتایم بەئاکام بگەیەنێت، ئاسان نەبوو مانەوە لە شاخە دژوارو سەختەکان‌و کەندەلآنەکاندا. ئەوەیش زۆرجار پێوەندیی بەدژایەتی کوردەکانەوە نەبوو. چونکە گەر سوپای تورکیا توانیبێتی ئەوە بکات، ئەوە لەمێژە ئەو سنوورانەی کۆنترۆڵکردبوو. ئەم سەختی‌و سەهەنەییەی چیاکان وایکرد کە رێککەوتنی پەکەکەو رێبەرانی کوردی ئێراق زۆرنەخایەنێت. هەربۆیە پاش چەند مانگێکی کەم گەریلاکان گەڕانەوە تا چەك‌و چۆڵە حەشاردراوەکانی وەختی راگوێزانیان بەدەستخەنەوە یاخۆ چەکی تر لەبازاڕەکانی هەرێمدا بەدەستبهێنن. دوواتر بەتەواوی گەڕانەوە بۆ کۆنە مەنزڵەکانی خۆیان و سەراسەری سنوورەکانی نێوان دوو ولآتیان گەمارۆ دایەوە.

نە بارزانی و نەیش تاڵەبانی هیچ بایەخێکی ئەو تۆیان بە ئەگەری هەلآیسانی مەترسی جەنگ‌و رێگریکردن لەچالاکییەکانی پەکەکە نەدەدا. ئەوکات بۆخۆیان دارای سەرئێشەو گرفتی تایبەت بەخۆیان بوون. ئەوان لەسەر دابەشکردنی دەسەلآت لەنێوانیاندا نەگەیشتنە هیچ رێککەوتنێك‌و بۆ دوو ساڵ پاشتر ناکۆکییەکانیان تەشەنەی سەند تا ئیتر جەنگ‌و ناکۆکی نێوخۆیی بەتەواوی هەرێمەکەیانی تەنییەوە.

لەراستیدا بۆ هەموو ئەو پارتانەی کە دەرگیری جەنگی یەکتر ببوونەوە، ئەوە شتێکی نێزیک بە ئەستەم بوو کە چارەیەکی سەربازیی بۆ ئامادەیی پەکەکە لەباکوری ئێرا هەڵبژێرن. لە خولێکی تری جەنگدا کە سەربازانی تورکیا لەسالانی ١٩٩٥ "٩٧" هەڵیانکوتایە سەر نێوچەکەو سنوورەکانیان چەندینجاریتر بەزاندەوە. وەلێ وەك هەمیشە و جار لەدووای جار لەو پەلامارانەدا ئەرتەشی تورك رووبەڕووی گرفتو گوڵمەزی نوێ دەبوونەوە. چوون بەپلەی یەکەم چیاکانو کەندەلانە سەختەکان بۆخۆیان پەرژینێکی سروشتی بەهێز بوون، کە ئەستەم بوو هیچ هێزێکی بەهێز بتوانێت پێشێلیان بکات، کێومالی ئامانجەکانی بکات. لەراستیدا پاش جەنگی ١٩٩٢ ئیدی گەریلاکان دارای ئەزموونو ئەجێندای خەباتو بەرگری بوون. ئەوان هەرگیز بەرگرییان لە قەڵەمڕەوەکەیان نەدەکرد، بەڵکو بەپێی پێویست لە شوێنێکەوە دەچوونە شوێنێکی دیکە. بەمجۆرە ئەرتەش لەهێرشی زەمینیدا ئامانجی نەدەپێکاو ئامانجی هەڵمەتە هەواییەکانیش دیسان بەهۆی سەختی چیاکانەوە هێند کاریگەر نەبوو، چونکە خۆحەشاردانی گەریلاکان لە ئەشکەوتو کەندەلانەکاندا، ئامانجی فڕۆکەکانی دژوارو ئەستەمدار کردبوو. تەنانەت گەر هێزەکانی میریی بیانتوانیایە لەخالێکی سنوورەوە دەستبگرن بە سەر مۆڵگەیەکی گەریلاکاندا، ئەوا پاش چەند دەقیقەیەك دەبوو چۆڵی کەنو سەرلەنوێ گەریلاکان دەنیشتنەوە بەسنوورەکانەوە. هاوکات هیوای تورکیا بۆ ئەوەی کوردانی ئێراق دەستگرۆییان بکەن لە شەڕتو پەرتکردنی پەکەکەدا هەرگیز نەهاتە دی. چونکە تاڵەبانی لەوکاتانەشدا کە گەرموگوڕبوو بۆ سەرکۆنەی پەکەکە، بێزی لەجەنگ دەهاتەوە لە جەنگو دەرگیریی لەگەڵیان. بارزانی لەگەڵ ئەوەی فرەجار دارای چەندین هۆکاربووە بۆ سەرکوتی پەکەکە، چونکە ئەوانی بەرکابەری دەسەڵاتداریی نێو قەڵەمڕەوەکەی زانیوە، وەلێ چەکدارەکانی هەمیشە دوو دڵ بوونە بۆ هەرجەنگێك کە ئەوان راکێشێتە نێو مەیدانی پەکەکەوە. جیا لەهەموو گریمانەکانی تر ئەوان وەك سەرچاوەی پاراستنی پەکەکە زانراون لەسنوورەکەدا. تورکیایش لەهەمانکاتدا چاوێکی لەسەر دەسەڵاتە ساواکەی باشوری کوردستان بوو. ئەو بەهیوای ئەوە بوو پشێوی و

پەڵپی ئاسایشیی زیاتر بگرێت تا وەك هەمیشە گەریلاکان بیر لەهێرش‌و هێز نەکەنەوە. هەروەك نەوال دەیگوت: "لە کۆتایدا، ئێمە هەموومان کورد بووین".

## سیاسەتی شکستخواردوو

نوێنەرانی کورد لەپەرلەمانی تورکیا کە لەسەر پارتێکی فەرمی کوردیی لە ئۆکتۆبەری ١٩٩١هەڵبژێردرابوون، گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە چالاکیی سیاسیی کارا لە تورکیادا کارێکی ئەستەمە[240]. نوێنەرانی تر لەنێو پارتە سیاسییەکانی تردا هیچ ئەرزشێکیان بۆ خەموو خولیای وان دانەدەنا لەهەمبەر دۆزی کورداندا. پێوەندییەکانی نێوان نوێنەرانی کوردو هەموو نوێنرەکانی تری تورك بەرەو گرژیو ناتەبایی دەرۆی، بەتایبەت لەو کاتەوە کە کوردەکان سوێندی یاساییان خواردو چەندین هەراو هورییاییان خستەوە. ئیتر بەرە بەرە لەهەمبەر رەخنەکانیان بۆ مافی مرۆڤو خواستەکانیان پێوەندییەکان دادەتەپین‌و کوردەکان نامۆو نەخوازراو دەبوون. مەهمەد ئەمین سیڤەر دەیگوت: "هەندێك لەوانە تەنانەت سەیریشیان نەدەکردین، بۆمان نەبوو لەپەرلەمان قسان بکەین". ئەو پیاوێکی هێمن‌و لەسەرخۆبوو، پێش ئەوەی بێتە نێو کایەی سیاسییەوە کاری جەراحی دەکرد. ناوبراو دەیوت: "ئەوان ئاماژەیان بە پێوەندی ئێمەو پەکەکە دەداو پێیان وابوو پارێزەری پەکەکەین. ئێمە هیچ پێوەندییەکیشمان بە پەکەکەوە نەبوو". نوێنەرانی کورد ئەوانەی گەرەکیان بوو پرسی کورد لەپەرلەمان چارەکەن، هەندێکجار هاوایان بەسەردا دەکرا یاخۆ رووبەڕووی هەڕەشەی جەستەیی دەبوونەوە.

کاتێك ئەوان بەفەرمی داوایان کرد لێپێچینەوە لەبارەی رەوشی مافی مرۆڤو پێشێلکارییەکان بکرێت کە زۆرینەی حاڵەتەکان لە کوردستان دەهاتنە روودان. ئەوان راستەوخۆ نوێنەرانی کوردیان تۆمەتباردەکرد بە کارکردن و دەست تێکەڵکردن لەگەڵ پەکەکەدا. لە ئازاری ١٩٩٢ هەر هیوایەکیان هەبوو بۆ ئەوەی لەرێی پەرلەمانەوە میریی

---

[240] Milliyet, June 24, 1987.

ناچار بە گۆڕانێکی دروستو راستەقینە بکەن لەدەستیان دا. چونکە پەرلەمان بەزۆرینەی دەنگ بڕیاریی دا تا باری نائاسایی لە باشووری رۆژهەلاتدا درێژە بکێشێت. دیارە کە ئەوەیش ئاماژەیەك بوو بۆ بەهەند وەرنەگرتنی پرسی چارەسەریی ئاشتی بۆ ئاریشەی نێوچەکە.

هاوکات و لەهەمان مانگداو لەکاتی یادەکانی نەورۆزی کوردیو سەری سالی کوردیدا، هێزە ئاسایشییەکان دەستڕێژی گوللەیان کرد لە خۆنیشاندەرانو نێزیکەی ٩٠ هاولاتییان کوشت. لەمیانی ئەو رووداوانەدا ١٤ پەرلەمانتاری کورد دەستیان لە پارتی کۆمەلگەی دیموکراتی کشاندەوەو پێوەندییان کردەوە بەپارتە کۆنەکەیانەوە کە پارتی کاری گەل بوو. مەحمود قلینج دەیگوت: "هیچ ئەگەرێکی ترمان لەپێشێ نەبوو، بەتایبەت دوای قەسابخانەکەی نەورۆز. هەروەها دەیگوت: "دێموکرات سۆشیالەکان بەشێك بوون لە حکومەتو ئێمەیش بەشێکبووین لەوان، هەربۆیە پێویستبوو لێیان جودا بینەوە". ئیتر ئەوان پێوەندیان کرد بە لەیلا زاناو حەتیپ دیکلەوە، ئەو دوو نوێنەرە کوردەی کەببوونە هۆی شێتگیریی‌و پشێوییەکان لەوەختی خواردنی سوێندەکانیاندا. هەریەك لەزاناو دیکل چەندمانگێك پێشتر لەژێر فشاری رێبەرایەتی دێموکرات سۆشیالەکاندا دەستبەردار ببوون. پاشانی دوو ئەندام پەرلەمانی دیکەی کورد دەستیان لەکارکێشایەوەو وەك ئەندامانێکی سەربەخۆ خۆیان پیشاندا. بەمەیش تێکڕا بوونە ١٨ کورسی بەهێزو کارای نەتەوەیی کورد لەپەرلەمانی تورکیادا.

دەستبەرداربوون لە سۆشیال دێموکراتەکان رۆلێکی باشی لە باشووری رۆژهەلاتدا گێڕا. ئەوە لەکاتێکدا بوو کوردەکان هەستیان دەکرد زێدەتر پەراوێزدەخرێنو خراوتر مامەلەیان لەتەکدا دەکرێت لەلایەن دەسەلاتدارانی نێوەندییەوە. کەچی هێشتا ئەو رەوەندیی سەرکوتکردنە کارینەکردە سەر زێدەتر چالاکبوونی نوێنەرەکان. چوون هەر دابڕانی پێوەندییەك لەگەل سۆشیال دێموکراتەکانو ئاراستەی هزری ئەوان، یاخۆ هەر هەولێکیان وەك کاردانەوەی چارەسەرییەکانی تورکیا بۆ دۆزی کورد، ئەوا دەبینرا کە خیانەتیان دەرهەق بە نەتەوەی سەردەستی تورك کردووە. لەمانگی حەوتی ١٩٩٢ دا،

داواکاری گشتی چاویخشاند به دادگای دەستووریی دا بۆ ئەوەی پارتی کاری گەل دابخرێت. ئەمەیش بەبانگەشەی ئەوەی کە لەهەوڵداندا بوون بۆ لەبەینبردنی یەکێتی کۆماری تورکیا. لەهەمان کاتدا داواکاری گشتی ئەنکەرە هەوڵێکی ناسەرکەوتووی دا تا حەسانەی پەرلەمانی لەسەر نوێنەرەکان لابەرێت، تا بەو هۆیەوە بتوانن سزای مەرگ یان سزایەکی قورس بدەن بەسەریاندا، ئەوەیش لەو سۆنگەیەوە بوو کە ئەوان لەوەختی بانگەشەی هەڵبژاردنەکانداو لەپەرلەماندا قسانێکی ناجۆرو وتارگەلێکی دژ بە دەستووری تورکیایان هێناوەتە گۆڕێ.

بەمجۆرە پێوەندییەکانی نوێنەرانو دەنگدەرانیان بە پشێوی بەرەو پێشەوە چوو، تامەزرۆییو هەستی شەقامی گشتی کە ملیاندابوو بۆ هەوەڵ هەڵبژاردنی ئازادو کراوە بەرە بەرە بەرەو دواوە پاشەکشەی دەکرد. وەختێك گەشتیان دەکرد بەنێو نێوچەکانی باشووری رۆژهەلاّتدا بۆ دیداری دەنگدەرانو هەوادارانیان، ئەوا لەلایەن هێزە ئاسایشییەکانی میرییەوە هەڕەشەیان لێدەکراو بێزاردەکران. چوون نوێنەران لەهەوڵدانداوون بۆ کۆڵینەوە لە خراپ بەکارهێنانەکانی مافی مرۆڤ لەهەرێمەکەدا، وەلێ لەلایەن هێزە ئاسایشییەکانەوە رێگرییان لێدەکرا بچنە نێو ئاواییو شارۆچکەکانەوە، ئەو شوێنانەی کە کەوتبوونە بەر بۆردومانو خەڵکەکەیشی لەلایەن هێزەکانەوە دەستبەسەرو بندەستکرابوون. لەسەردانێکدا فەرماندەی فەوجێکی ژەندرمەکان گوتبووی بە پەرلەمانتاران لەیلازاناو ئۆرهان دۆگان، ئەو دەیهەوێ خوێنی خەڵکەکە بمژێتو وەك مشك بیانترنجێنێتە زێدەکەیان[٢٤١].

ڤیدات ئایدینی بەرپرسی پارتی کاری خەڵك لە دیاربەکر، کەچالاکوانێکی مەدەنی کورد بوو، خۆی ئەندامێکی سەر بەپەکەکە نەبوو[٢٤٢]. لە مانگی حەوتی ١٩٩١ دا چەندرۆژێك پاش ئەوەی پیاوگەلێك بەنێوی پۆلیسەوە لە ئاپارتمانەکەی بردبوویان، ئیتر

---

[241] The best analysis on Kurdish tribal structure and behavior remains van Bruinessen's Agha, Shaikh. See pages 64 – 73 for an overview of the history of blood feuds.
[242] Imset, the PKK, 100fn92.

تەرمەکەی بە کوژراوی دۆزرایەوە. کوشتنەکەی ئەو ئاماژەبوو بۆ میتۆدێکی نوێی میریی لەبەکارهێنانی نەزمی کوشتن بۆ هەموو چالاکوانە مەدەنییەکانی نێوچەکە بەبیانووی جۆراو جۆر. هاوکات ئەو بەرپرسانەی دەستیان لەگەڵ پارتی کاری خەڵکدا تێکەڵبوو، هاوکات زەمینەی مەترسیگەلێکی فرەشیان بۆ رەخسابوو. ئەوەبوو لەساڵی داهاتوودا ٢٧ بەرپرسی پارتەکە تەنها لە باشووری رۆژهەلاتی تورکیادا غافڵکوژکران.

لەساڵی ١٩٩٣ یشدا ١٧ بەرپرسی لە هەمان پارت کوژران کە لەناو ئەوانیشدا پەرلەمانتارێکی سەر بەپارتەکەی تێدا بوو. لەساڵی ١٩٩٤ یش ١٨ بەرپرسی دیکەی پارتەکە لەنێوبران[٢٤٣]. بەم نەزممە نەتوانایی نوێنەرانی کورد لەبەرامبەر بەرگریکردن لەگیانی خۆشیان هۆیەك بوو تا شەرعییەتی خەباتی سیاسیو سیاسەتی پارتی لەنێوچەکەدا کەنەفتو کەلەلابێت. نوێنەرانی کورد ئۆرهان دۆگانو مەحمود ئەلینەك دەیانگوت: "ئێمە بەپێش دەوڵەتەوە چووین، وەلێ ئەو دەرگاکانی بەرووماندا کلۆم دا". هەروەها دەیانگوت: "ئێمە بەپیر خەڵکییەوە چووین، وەلێ کە نەمانتوانی گرفتەکانیان چارەبکەین، ئیدی متمانەمان لای وانیش نەما، تەنانەت هەندێکجار میریی بواری نەدەداین بچینە نێو هەرێمەکانی هەڵبژاردنی خۆشمانەوە. لەژێر ئەم رەوشو رووەی رامیاری ولاتدا، ئیدی تاقەتمان وەبەر نەمابوو، تەنانەت وامان بیرنەدەکردەوە کەپەرلەمانتاریی بەردێك بخاتە سەردیواری خواستەکانمانو خواستی وازهێنان لەکەللەی دابووین"[٢٤٤].

### ئەنجومەنەکە

ئۆجەلان دارای بۆچوونێکی پەیوەست بەخۆی بوو. تەنانەت لەهەڵبژاردنی نەتەوەیی ١٩٩١ وە ئۆجەلان ئەوەی نەشاردبوویەوە گەر دەوڵەت پەڵپو بیانووی هەبێت لەبەرامبەر کارکردن لەگەڵ کورداندا تا پێکەوە بگەنە چارەسەرییەك بۆ دۆزی کورد، ئەوا ئەوان

---

[243] The TIHV (Turkish Human Rights Foundation) included a compre"
hensive report on attacks on teachers in its 2001 Turkiye Insan Haklari Raporu.
[244] McDowall, Modern History, 423.

دەتوانن لێنەوێن بۆ دامەزراندنی ئەنجومەنێکی نەتەوەیی پەیوەست بەخۆیان لە کوردستاندا. ئەنجومەنەکە وەك چەترێك وەهابوو کە تەواوی کوردانی لەژێر سایەیدا گرد دەکردەوە. هاوکات یاساو بڕیاری سیاسی دەردەکردو نوێنەرایەتی تەواوی کوردانی دەکرد لەئاستی نێونەتەوەیدا. ئەوە لەراستیدا هەیمەنەو هێزی پەکەکە بەسەریدا دەشکا، وەلێ شوێن پەنجەی چەکداریی‌و گەریلاکانی پێوەدیار نەبوو. ئەنجومەنەکە وەك ئەنجومەنێکی حوکم وابوو بۆ کوردان لەهەرشوێنێك بن، بەتایبەتی بۆ کوردانی تورکیا. چالاکوانەکانی پەکەکە لەوبارەوە گەیشتنە بڕوایەك کە ئیتر هیچ پاساوێك بۆ دواخستنی ئەنجومەنێکی لەو جۆرە نەماوەتەوە.

موراد دەیگوت:"پەرلەمانتارانی کورد لەپەرلەمانی تورکیادا هیچ گوێیان بۆ رانەدەگیرا". ئەو چالاکوانێکی پەکەکە بوو، خواستی هەبوو کە کورد لە رژێمی سیاسی تورکیادا بکشێتەوە". هەروەها دەیگوت: "ئەنجومەنەکە بیرۆکەیەك بوو تا دامەزراوەیەك هەبێت تێیدا رووناکبیران‌و سیاسییەکانی کورد بتوانن نومایانی کوردایەتی خۆیان بکەن". هۆکارێکی تری گرنگ هەبوو تا هەنگاو بەرەو ئەنجومەنێکی نەتەوەیی بنرێت. چونکە کوردانی ئێراق لەساڵی ١٩٩٢ توانیان پەرلەمانێکی تایبەت بەخۆیان بەدەستبهێنن، ئەوە یارمەتی وانی دا تا لەبواری شەرعییەت‌و سیاسیدا وەخۆکەون. موراد لەم بارەیەوە دەیوت: "ئەنجومەنێکی لەو جۆرە دەکرا بۆ ئۆجەلان شەرعییەتی نێونەتەوەیی بەدەستبهێنێت". هەروەها دەیوت: "ئۆجەلان ئاتاجی بە شەرعییەت پێدان هەبوو". لەنۆڤەمبەری ١٩٩٢ لەسەراسەری ئەورووپادا پۆستەرە سوورو سەوزو زەردەکانی پەکەکە هەڵواسران‌و داوا لەتەواوی کوردان کرا کە دەنگ بدەن بۆ ١٥ نوێنەری پەکەکە تا وەك پێکهاتەی نەتەوەیی ئەنجومەنەکە دیارییبکرێن. ئیتر سندوقەکانی دەنگدان لە نێوەندە فەرهەنگییەکان‌و کۆمەڵەکانی سەراسەر ئەورپا دانران. هاوکات تەواوی گرووپە نەیارەکانی پەکەکەیش بانگهێشتکران بۆ بەشداریکردن، وەلێ هیچکام لەوان بەدەم داواکەوە نەچوون. چوون تاوەکو ئەوکاتە هیچ ئەزموونێکی پۆزەتیڤیان لەتەك پەکەکەدا نەدیتبوو. هەربۆیە دڵگرمێ بوون لەوە کە ئۆجەلان بتوانێت رێز لەدەسەڵاتەکانی ئەو

ئەنجومەنە بگرێت. بەتایبەت کەمال بۆرکای لە پارتی سۆشیالیستی کوردستان زۆر بە توندی داکۆکی لە دانەدوواوەی بەشداریکردن کرد لە ئەنجومەنەکەدا.

موراد کە هەندێك دانوستانی لەتەك وان ئەنجامدابوو دەیگوت: "ئەوان رەخنەکانی دەرهەق بەپەکەکە فرە توند بوو، ئامادەی هیچ جۆرە پەیوەندییەك نەبوون لەگەڵ پەکەکە لەژێر هیچ جیاکاریو نا دادگەرییەکدا"[245]. ئۆجەلان رەچاوی نوێنەرانی کوردی سەر بە پارتی کاری خەلکی نەکردو ئەوانی بەهەند وەرنەگرت لە نوێنەرایەتی ئەنجومەنەکە، بەڵکو ئەنجومەنەکەی وەك بەدیلێك بۆ پەرلەمانی تورکیا زانی. ئەو بۆ ئەنجومەنی نەتەوەیی کورد پێشنیازی بۆ رووناکبیرو کرێکارو پارێزەرانو سیاسەتوانانو رێکخراو کۆمەڵە نەیارەکانیشکرد تا ببنە ئەندام ئەوەیش هەمووی لەپای پێداکردنی شەرعییەتدا بوو بۆ ئەنجومەنەکە. یەکێك لە کۆمەڵەیەکی ناحکومیی مافی مرۆڤ روونیکردەوە: "داوایان لێکردم، وەڵێ دامە دوواوە، وابیرم نەدەکردەوە بتوانێت کارێك بکات، بەروونی پێم وتن نەخێر". زەینولعابدین خان کە مامۆستایەکی ئامادەیی بوو. ئەو نێزیکببوویەوە لەپێوەندی لەتەك ئەنجومەنەکەدا، ناوبراو لەوەدا تێمابوو ئایا پەکەکە بە دروستی دەتوانێت لەگەڵ رواڵەتەکانی دێموکراسی ئەنجومەنێکی لەوجۆرەدا هەڵبکات یان نا. زەینەدین بۆماوەی سێ ساڵی لە زیندانی دیاربەکردا بەسەربردبوو، ئەو بەتۆمەتی ئەندامێتی گروپی کوردیی رزگاریی بەندکرابوو. ناوبراویش وەك چالاکوانەکانی تر لەئاست توندوتیژییەکانی پەکەکەو بەپیرۆز زانینی کەسایەتی ئۆجەلاندا نەیارو نا تەبا بوو. هەرچەند کە بەردەوام ئەوە حاشا هەڵنەگربوو کە جەنگی گەریلایی پەکەکە هێند دۆسیەی کوردیی پڕ دەنگۆ کردبوو کە هەرگیز بڵاوکراوە نهێنییەکانی رزگاری نەیاندەتوانی کارێکی لەو جۆرە بکەن.

---

[245] Milliyet, June 16, 1988. Ocalan told this to Mehmet Ali Birand, the first mainstream Turkish journalist to interview him. The series of articles Birand later wrote was banned before it could run in full.

پاشنیوەڕۆیەك لەدوكانێكی چاپدا كە زەینولعابدین بەڕێوەی دەبرد، لە بەرلیندا بینیمو بەپەرۆشەوە پێمی گوت: "نەبیركردنەوەی من گۆڕابوو، نەیش پەكەكە گۆڕابوو، وەلێ جگە لەپەكەكە رێكخراوێكی تر نەبوو. یان دەبوو سەربە پەكەكە بیت یان دەوڵەت. نەماندەتوانی پشتیوانی دەوڵەت بین، هەر بۆیە پەكەكەیشمان جێهێلا".

لە دەستپێكی مانگی ئازاردا زەینولعابدین جانتایەكی بچوكی پێشایەوەو ماڵئاوایی كرد لە خێزانو منداڵەكەی. وەختێك پرسیارم لێكرد ئایا ئەو وابیردەكاتەوە ئەو جیابوونەوەیەی بۆ ماوەیەكی نادیارە یان نا. ئەو بەپێكەنینەوە دەیگێڕایەوە: "ئەوە نەزمێكی نۆرماڵ بوو لە نێو خێزانەكانی كورد دا، لەهۆشمەندیماندا چێنراوەو لەساتەوەختی ئەركو هۆشی رابردووەوە تا ئێستا ئەم دابڕانو لێكپچڕانە هەر هەبووە".

چەكدارانی پەكەكە رێو شوێنیان بۆ زەینولعابدینو نێردراوەكانی تر ئامادەكرد تا بتوانن سنور ببەزێننو بپەڕێنەوە بۆ باكووری ئێراق. سەرەڕای پلانی نوێی توركیا بۆ چاودێری توندی سنورەكان. ئەوان بەسانایی تێپەڕینو گەیشتنە كەمپی زەلێ. ئەو ئۆدوگایە دەكەوتە نێوەندی سنووریی ئێراقو ئێران، لەوێ ١٦٠٠ گەریلا بوونی هەبوو، لەگەڵ خێوەتێكی گەورە كە رۆژانە تیایاندا نوێنەران و نێردراوان گفتوگۆیان لەبارەی پرۆژەكانەوە دەكرد. ئۆجەلان پێشتر ئاماژەی كردبوو بەوەی كە نوێنەرانی ئەنجومەنەكە دەبێت ٨٠٪ هیچ پێوەندییەكیان بە پەكەكەوە نەبێت. هاوكات وتبووشی پێویستە ئەنجومەنەكە ئازادو دێموكراسی بێت. لەنێو دانیشتنەكاندا لەوێ هەندێك لە گەریلاكان لەوەختی هاموشۆی نێو دانیشتنەكان گوێیان بۆ وتەكان رادەگێرا، زەینەدین یەكێك بوو لەوانەی كە بەشێكی دیاریكراوی دانیشتنێك بەم شێوەیە دەگێڕێتەوە:"

ئێمە وەزیرگەلێكمان بۆ كاروباری ژنان، ئایین، بازرگانی تەنانەت مافی مرۆڤ دیاریكرد. لە بیرمە هەندێك دەیانوت پێویستمان بە وەزرارەتی مافی مرۆڤ نییەن چوون ئێمە لەجەنگداین لەپێناو مافی مرۆڤدا. هەر لەوێدا ئەندامێكی پەكەكە هەستایەوەو گوتی(لێرە زەبرو زەنگ هەیە، من خەڵكیم ئازار داوە، پێویستمان بە وەزارەتێكە بۆ سزادانی ئەو نەزمی بەڕێوەبردنە) ".

نێردراوەکان ١٣٠ کەسێك لە کۆی هەموویان بەسەدان پەیپەریان لە یاساو بە‌ـ‌ـ ‌ وردەکاری پەیوەست بەهەموو شتێك ئامادەکردبوو گردبوونەوەکە چەند کاتژمێرێکی خایاندو دوواتریش مشتومڕەکان درێژەیان کێشا. لەکۆتایی رۆژیشدا هەمووان بەپێـ ـ چوون بەنێوشاخەکاندا. زەینولعابدین بە شۆخییەوە دەگێڕێتەوە : "دیمەنێکی زۆرجو ـ بوون تەنها خواردنمان پێنەبوو، دەنا وەك سەیرانێك وەها بوو".

## فەراهەمهێنانی ئاشتی لە زوترین کاتدا

ئۆجەلان هەرچەند کە جۆرێك لە پەشێوی دەرونی هەبوو بۆ مانەوەی ـ سەرۆکایەتیداو بۆ نرخاندنی گرنگییەکەی، وەلێ لەرووی سیاسیو لۆژیکییەوە کار ـ بەتوانا بوو. پلانی ئۆجەلان بۆ ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستان، ئەو هەستەی گەلاڵەکردبوو کە تا کاتێکە رژێمی سیاسی تورکیا نوێنەرە هەڵبژێراوەکانی کورد وەك نوێنەر دەناسێنێت. وەلێ ئەوە چارەسەرییەك بوو بۆ ئەگەری نەبوونی ئەو دانپیانانە. هەرچەند ئۆجەلان بەڵێنی دابوو بە گەریلاکانی کە تا کشانەوەی دووا سەربازی کورد لە کوردستان جەنگ دەکات، وەلێ لەو راستییەیش تێگەیشتبوو کە باشترین چارەسەر بۆ گرفتەکان دانوستانە لەگەڵ بەرامبەردا. بۆچەندین ساڵ ئۆجەلان ئەوەی نەشاردەوە کە بەرژەوەندییان لە وتوێژی سیاسیو دەرکردنی بەیاننامەدایە لەگەڵ ئەنکەرەداو بەتەواوی لەخواستەکانیدا ئەوەی دوپاتدەکردەوە کە پێویستە کوردو تورك بە راگرتنی تایبەتمەندیی جیاوازییەکانیان پێکەوە کاربکەن.

ئۆجەلان لە دەستپێکی ١٩٨٨ دا وتبووی: "ئێمە لەگەڵ نەتەوەی تورکدا کێشەیەکمان نییە کە نەتوانین چارەسەریی بکەین"[٢٤٦]. دامەزراوەی سیاسی تورکیا بەهیچ کلۆجێك نەیدەتوانی بەشداریی بەنوێنەرانی هەڵبژێراوی کورد بکات و ئامادەیی بۆ هیچ گفتوگۆیەك نەبوو، چوون نەدەکرا لەتەك کەسانێك دانوستان بکەن کە پێشتر بە

[246] A good overview of the PKK's difficulty of holding forced recruits is given in Ozcan, PKK, 121–127.

تێرۆریست ناوزەدی کردبوون. ئۆجەلان لەو بڕوایەدابوو کە تورکوت ئۆزاڵ پاش وازهێنانی لە سەرۆك وەزیرانی تورکیا، ئەو وەك ڕێبەرێکی لیبراڵو سەربەخۆ زیاتر مەیلی بەرەو چارەسەرێکی سیاسیدا دەشکایەوە. لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٢ دا ئۆزال لەدانیشتنی لەگەڵ ٣ لە پەرلەمانتارە کوردەکان ئاماژەی دابوو بەوەی کە ئەو ناتوانێت هیچ شتێك بکات تاوەکو پەکەکە واز لەخەباتی چەکداری نەهێنێت. ئەو وتبووی: "گەر لوولەی چەکەکان خامۆشکران، ئەوکات دەتوانم دەستدەمە پرۆژەکانو مەرجەعە باڵاکان قایلبکەم بە چارەسەری سیاسیی دۆزەکە"[٢٤٧].

دیارەکە بڕوابوون بە هەوڵی ئۆزال تێبینی دەکرا، چوون ئەو لە ساڵی ١٩٩١ دا توانی گەمارۆی سەر گەلێ لەقەدەغەکارییە یاساییەکان هەڵبگرێت لەوانە نوسینو قسەکردن بەزمانی کوردیی. هەر لەهەمان کاتدا ئەو توانی ئەو بەستەڵەکی پەرێزییو دابڕانە لەتەك کوردانی ئێراقدا بڕەوێنێتەوەو پێوەندی راستەو خۆی لەگەڵ واندا دامەزراند. ئۆزال ترسی لەدامەزراوەی سەربازیو ئەرتەشی تورکیا نەبوو، بەڵکو کۆمێنتەکانی خۆی بەرەوانی لەسەر بێدەنگیو نەپەرژانی دەوڵەتی تورکیا لەسەر شوناسی کورد دەگەیاند. ئەو هێند داکۆکیکاربوو تەنانەت جارێك ئەوە راگەیەنرا کە لەوانەیە ئۆزال بەرەچەڵەك کوردبێت[٢٤٨].

ئۆزال چەندینجار بایەخی خۆی بۆ ئاگربەست بۆ جەلال تاڵەبانی دوپاتکردبوویەوە. تاڵەبانی پێوەندی دۆستانەی خۆی لەتەك هەردوو ڕێبەری پەکەکەو سەرۆکی تورکیا پاراستبوو[٢٤٩]. تاڵەبانی دیسان بۆ ئۆجەلان پێشنیازی کردبوو کە رەوشەکە هێور

---

[247] . This section draws on interviews with a number of former Kurdish militants with firsthand information about relations with Iran. Books used in" clude Dagli, Birakuji, 49 – 57; Ozcan, PKK, 231 – 237, 262 – 264; Imset, the PKK, 138, 184, 205; McDowall, Modern History, 272–275, 351–360, and 372–373

[248] Robert Olson, in The Kurdish Question, argues that Iran feared that a Turkish presence in northern Iraq would allow Ankara to exert a destabilizing influence over Iran's Kurdish and Azeri populations.

[249] Ozcan, PKK, 263fn217.

بکاتەوە. تاڵەبانی دەڵێ: "من بۆخۆم پێم وت: "ئایا تۆ رازیت جەنگ راوەستێتو ئاشتی بەرقەراربێت". ئەویش لە وەڵامدا گوتی بەڵێ"[٢٥٠].

دیارە کە ئۆجەلان مەبەستی نەبوو کۆتایی بەجەنگ بهێنێتو چەك دابنێت. بەلام ناوەناوە ئۆجەلان پەنای دەبردە بەر ئاگربەستی تاك لایەنەو دەستبەرداری بەرژەوەندییەکانی نەبوو لەنێو ئاگربەستدا بۆنموونە لە کۆنفرانسێکدا لەتەك تاڵەبانی ئاگربەستێکی ٢٥ رۆژەی راگەیاند. کە لە ٢٠ مانگی ئازار واتە رۆژێك پێش سەری ساڵی نوێی کوردییەوە دەستی پێکرد، وەك دەزانرا ئەو کاتانە هەموو جارێك لە خۆپیشاندانەکاندا توندوتیژی سەری هەڵدەدا. وەلێ ئۆجەلان لە کۆنفرانسەکەدا رایگەیاند کە دەخوازین تورکیا واز لە جەنگ بهێنێتو پرۆسەی چاکسازییەکان دەستپێبکات. بەرپرسانی تورکیا بەبێ بایەخو گوماناوییەوە روانییانە ئاگربەستەکە. عیسمەت سێزگینی وەزیری نێوخۆی تورکیا رایگەیاند: "دەوڵەت لەگەڵ باندەکاندا دانوستان ناکات"[٢٥١]. هەروەها ئەوەیشی رونکردەوە کە ئەوان هیچ سەغڵەت نابن بە پێشنیازەکان بۆ چارەسەرکردنی رەوشەکە. سەرۆکی ئەرکانی گشتی تورکیا جەنەراڵ دۆغان دوپاتی کردەوە کە دۆزێك بەنێوی پەکەکەو کوردەوە نییە، کێشەکە کێشەی باشوری رۆژهەلاتی تورکیایە، هەر بۆیە ئۆپەراسیۆنەکان لە باشوری رۆژهەلات بەردەوام دەبن. هاوکات هەندێك لە بەرپرسانی دەوڵەتیش لەو بڕوایەبوون کە پەکەکە لە هەڵوەشاندنەوەدایە. موحەمەد عەلی بیراندی نوسەریش پێی وابوو: "کێشەکە پەیوەندیدار نییە بە ئاپۆو پەکەکەوە، بەڵکو کێشەی نەتەوەی کوردە"[٢٥٢]. وەختێك ئۆجەلان راگەیەنراوی ئاگربەستی هێنایەگۆڕێ، ئیدی لەجیاتی قاتو شەرواڵی کەتافی، کراسو بۆینباخی دەبەستو تیشێرتی وەرزشی لەبەردەکرد. ئۆجەلان لەم شێوەو شکڵەدا باوەڕی وابوو سازو ئامادەی وتوێژە لەهەمبەر ئۆزالدا.

---

[250] Talabani recounted the details in Birand's Apo ve PKK, 193–197.
[251] McDowall, Modern History, 351.
[252] Birand, Apo ve PKK, 197.

ئۆجەلان دەیوت:"ئایا ئۆزال راستگۆیە یان نا، هیوادارم پێکابێتی". یاخۆ دیگوت: "ئایا ئۆزال دارای میتۆدێکی جەربەزەیە لەپشت هەنگاوەکانییەوە بۆ ئەوەی برەو بە نەخشە رێگەکەی بدات؟ ئایا ئەو گەرەکییەتی هەنگاوگەلێکی جددی بەرەو ئەم پرسو پێناوە بگرێتە بەر؟"[253].

ئۆزال لە پرۆسەکەدا خەریك نەبوو شتێك بڵێت. ئەو تەنیٚ لە دووەم دیداری نوێنەرانی کورد لەمانگی ئازاردا ئاماژەی بەوە دابوو کە پلانێکی بەدەستەوەیە. ئەو بەڕوونو رەوانی قسەی کردبوو، تەنانەت زیاتر لەوەیش نەیشاردبوویەوە کە نیازی چارەسەرکردنی دۆزی کوردی هەیە[254]. وەلیٚ ئۆزال پێویستبوو جۆرێك مامەڵە بکات تاوەکو بەهیچ کلۆجێك لە وتوێژ لەگەڵ رێبەری پەکەکە رووبەڕوو نەبێتەوە، وەلیٚ گەر ناڕاستەوخۆ ئەو کارە بکرێت، ئەوا مشکلێك نەدەبوو. ئۆزال ئیدی بۆی گرنگ نەبوو ئەو کەسە ئۆجەلان بێت یاخۆ دێوانەیەك، هەروەك چۆن زۆرجار ئۆزال بەو جۆرە ئاماژەی بەنێوی ئۆجەلان دەکردو پێی وابوو بوونی ئۆجەلان لە وەستاندنی جەنگەکاندا فرە جددیو پێویستە. ئۆزال دەیگوت، ئۆجەلان بێننە نێو گەمەکەوە، کە تەنها دێوانەیەکە". پاش راگەیاندنی ئاگربەست، ئۆزال بەتاڵەبانی دەگوت، هێنانی دێوانەیەك دروستە نەبا جەنگ سەر هەڵبداتەوە[255].

بەکارهێنانی تاڵەبانی وەك نێوەندێك بۆ نێوبژیکردن، بریتی بوو لە نێزیکبوونەوەی راستەوخۆو نافەرمی نێوان پەکەکەو تورکیا، کە دوواجار وای لێهات ئاگربەستەکە درێژتر بکرێتەوە. ئۆزال پاش گەڕانەوەی لەسەردانێکیدا بۆ یەکێك لە ولأتانی ئاسیای نێوەراست لە نێوەندی مانگی ئەپرێلدا، ئەو بەئاشکرا رووی گەشی پێوە دیارنەبوو، چوون نیگەرانییەکەی لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە حکومەتی ئیئتلاف نەیتوانیوە هیچ

---

[253] Birand, Apo ve PKK, 198.
[254] TBMM (Turkish Parliament), Tutanak Mudurlugu, Birlesim: 10, Tarih: 19/1/1988. Copy provided by Mehmet Ali Eren. See also Cumhuriyet, Jan. 20, 1988, for coverage of the speech.
[255] Milliyet, Jan. 21, 1988.

هەنگاوێكی نوێ یاخۆ بوێرییەك لەمەڕ قۆستنەوەی بەرژەوەندییەكانی لەو ڕەوشە وەربگرێت.

بەهۆی ئەو فیزو لەخۆباییە گێلو گەوجانەیەوە كەلە واقیعەكەدا نومایان دەبوو گەلی هەلی گەورەو گرنك لەكیس چوون[256]. وەختێك ڕۆژنامەنوسی تورك جەنگیز كان پرسیاری لەئۆزال كرد مەبەستی ئەو كێیە لەو ناتۆرەیەی كە دەیلێ ؟ ئەویش لەوەلامدا نایشارێتەوە كە مەبەستی حكومەتی توركیایە. ئۆزال بەكاندار دەلێت:"ئایا ئەوان گرفتەكان نابینن كە چین؟ من لە زیهنمدا ڕێگە گەلێك هەبوون بۆ چارەسەری قەیرانەكە"[257].

ئۆجەلان لە ١٥ ئەپرێلداو لە دووەم كۆنفرانسدا لەبیقاع، ماوەی ئاگربەستەكەی درێژكردەوەو داوای لە ئەنكەرە كرد مافە كلتورییەكانی كورد بداتو لێبوردنی گشتی دەربكات، هاوكات قەدەغەكارییەكانی سەر پەخشی كوردیو فێركردنی كوردی هەلبگیرێنو خراپ بەكارهێنانەكانی مافی مرۆڤ ڕابگرن. ئەمە مانای ئەوە نەبوو كە ئۆجەلان دەستبەرداری خولیای فیدرالیبووبێت بۆ كوردو تورك لە توركیاداو تەنانەت دەستبەرداری خەونی سەربەخۆ بوونیش نەببوو. وەلێ ئەوە مانای ئەوە بوو كە ئۆجەلان بەباشی لە هەموو ئەو سنوربەندە سیاسییانە تێگەیشتبوو كە ئۆزال پێویستبوو ئەنجامیان بدات. هاوكات ئەو باش لە وتەكانیشی تێگەیشتبوو، كاتێ كە لێدوانی دەدا ئەگەرنا لەوانە بوو كوردەكان پێویستبێت زۆر كەمتر لەسەربەخۆیی لەچارەنوسیان بنوسرایە.

بۆ ڕۆژێ دوای ڕاگەیەنراوەكەی ئاگربەست، ئۆجەلان فرەبەتامەزرۆییەوە چاوەڕێی بیستنی كاردانەوەی حكومەت بوو، ئەو تەلەفزیۆنەكەی كردەوە، لەپڕ هەواڵێكی

[256] This section draws heavily on an interview with Mehmet Ali Eren. Published sources include Ahmad, Modern Turkey, 194 – 197; Olmez, DEP, 55 – 109; McDowall, Modern History, 357–360; and Cumhuriyet and Milliyet newspapers (January 1988).
[257] Hurriyet, Jan. 22, 1988.

چاوەڕێنەکراوی تاڵی بیست. ئۆزال دوچاری جەڵدەی دڵ ببوو، هەر بەو هۆیەوە لەنیوەڕۆی ئەو ڕۆدا مەرگی ئۆزال ڕاگەیەنرا. هیواکان لەدەستدانی تەڤگەرە سیاسییەکە نەبوو، ئۆجەلان یەکسەر نیازی خۆی بۆ ئاگربەست ڕاگەیاندەوە. وەلێ سیاسییەکانی تورکیا مژوڵی گۆڕانە سیاسییە نێوخۆییەکانی وڵات بوون کە بەمردنی ڕێبەرە بەهێزو کاریزماکەیان هەتبوونە پێشێ. هاوکات لەدەستدانی زەجرو سنورەکانی ئۆزال لەسەر هێزە ئاسایشییەکان، هۆیەکی تر بوو تا ئەوان زیاتر دەستو پێیان لەسەر سوربوونی زیاتری ڕەفتارەکانیان بکرێتەوە.

لە ١٩ مانگی پێنجی هەمان ساڵدا زیاتر لە ١٠ گەریلا لە کەمپی کولپ، کەوتنە مەتەرێزی هێزە سەربازییەکانی تورکیاوەو کوژران. ئەو هەرێمە لەژێر کۆنترۆڵی فەرماندە شەمدین ساکیك دا بوو. ساکیك هۆشداری دایە ئۆجەلان لەبارەی لەدەستدانی ورەو ئیعتباری گەریلاکان، هەربۆیە ئەویش لە ڕێگەی بێسیمەوە پێی ڕاگەیاند کە گەریلاکان ئازادن لەوەی گەر بیانهەوێت تۆڵەی ئەو هێرشە سەربازییەی تورکیا بکەنەوە. دکتۆر سولەیمان وتی: "ئۆجەلان نامەی نارد، ئێوە دەتوانن بەرگری لەخۆتان بکەن، ئەوە لەکاتی نوێنەرایەتی ساکیك دا بوو". زۆری نەخایاند ساکیك بڕیاری نومایانی هەرەوەزییەکی بەرفراوانی دا بەوەی هەموو ڕێگە سەرەکییەکانی هەرێمی ئامەد ببڕن. ئەمە جۆرێك لە چالاکی بوو کە گەریلاکان دەیانگرتە بەر بۆ نومایانی دەسەڵاتو هێزیان لەنێوچەکەکەدا. هاوکات داوای شوناسنامەو لێپرسینەوەیان لە شوناسی نەتەوەیی شۆفێران دەکردو تەقەیان لە فەرمانبەرانی بێ شانسی میریی دەکرد، چوون بەسانایی‌و بە بێ ڕووبەڕوو بوو نەوەی مترسییەکی ئەوتۆ دەیانتوانی بیاندۆزنەوە. هێزە سەربازییەکان دڵیان پێوە نەبوو ڕووبەڕووی گەریلاکان ببنەوە، بەتایبەت لەو شا ڕێگە سەرەکییانەی کە بەدرێژایی نێوچەکە هەبوون، فرەجار لەوەختی گواستنەوەی

سەربازەکانی، ئوتوبوسی سەربازییان بەکار نەدەهێنا تا لە مەترسی بنبەستی ڕێگەکان قوتاربن.

هەمان شەو کە سالیك فەرمانیدابوو ڕێگە سەرەکییەکان دابخەن، یەکێك لەو ئوتوبوسە بێ هێمایانە لە ڕێگەی بنگۆل بوو بۆ ئەلازیگ. سەرنشینانی ماشینەکە ٥٣ سەربازی بێچەك لەتەك چەند هاولآتییەکی مەدەنی بوون. ئوتوبوسەکە لەیەکێ لەخاڵەکانی پشکنینی گەریلاکان وەستێنرا، گەریلاکان لەلایەن دوو لەفەرماندەی بەتالیۆنەکانی پەکەکەوە سەرپەرستی دەکران. سەربازە تورکەکان فەرمانیان پێکرا دابەزنە خوارێو پاشان لەسەر شا ڕێگە سەرەکییەکی ڕاکشێن پاشان درانە بەر دەستڕێژی گولله. لەوان ٤ مامۆستا هەبوون، تەنها دووان لەسەربازەکان توانیان رزگاریان بێتو هەڵبێن. وەختی هەواڵەکە بڵاوبوویەوە، تەنانەت ئۆجەلانیش لەکردەیەکی لەوجۆرە حەپەپەسابوو.

کوشتنی ٣٣ سەرباز لە کۆتایی مانگی پێنجی هەمان ساڵدا، ئاماژە بوو بۆ کۆتایی هاتنی ئاگربەستەکەی پەکەکە[258]. هەرچەند کە ئۆجەلان دوپاتیدەکردەوە کە بەردەوامە لە ڕێزگرتن لە ئاگربەستەکەی، وەڵێ ئیتر کەسێك نەمابوویەوە تا بڕوا بە ئاگربەستەکەی بکات. هەندێك لە سەربازەکانی نێوخۆی میریی، باسیان لەوە دەکرد کە میریی بە مەبەستەوە ئەو سەربازە بێچەکانەی لە شەوێکی وەهادا بەئۆتۆبوس گوێزاوەتەوە. ئەوەیش بە ئومێدی ئەوەوە بووە کە هێرشێکی وەهایان بکرێتە سەر تاوەکو ئاگربەستەکە هەڵبوەشێتەوە. تەنانەت سینارۆیەکی لەو جۆرەیش شۆرشگێڕەکانی لەو بەرپرسایەتییە نەبوارد. هەر بۆیە لە مانگی شەشی هەمان ساڵدا پەکەکە لەلایەن خۆیەوە بەفەرمی ئاگربەستەکەی کۆتایی پێهێنا. دروست لەو کاتەیشدا سەربازانی تورك سەرگەرمی جێبەجێکردنی پەلامارەکانیان بوون بۆ سەر گەریلاکان. کوجوك زەکی

[258] Cited in Olmez, DEP, 60.

دەیوت: "کوشتنی سەربازەکانی تورك خاڵێکی وەرچەرخان بوو". ئەو کرابوویە فەرماندەی ٢٠٠ کەسی بەهێزو کارا لە هەرێمی موشدا، شوێنێك کە زۆر دوور نەبوو لەو شوێنەی ڕووداوەکەی تێدا قەوما بوو. ناوبراو دەیوت: "سەربازەکان ئۆپەراسیۆنێکی ئێجگار گەورەیان لەدژ بەرپاکردین‌و شەڕەکە ئێجگار دژوارو تاقەت پڕوکێن بوو".

## بێ گوناهەکان لە چیاکاندا

نێردراوان بۆ ئەنجومەنی پلان دابۆڕێژراوی پەکەکە، گەشتنە کەمپی زەڵێ. بیرکردنەوەکان لەو تەوەرانەدا دەسوڕانەوە تا وان کارێکی وەها بکەن ببنە بونیادی بناغەیەکی پتەو و حکومەتێکی دامەزراوەیی لە وڵاتێکی نوێدا. ئاگربەستەکەی ئۆجەلان کە لە مانگی ئابدا بوو، دەبوو ئەو باوەڕە لای ئەنجومەنەکە گەڵاڵەبکات تا ببنە نێوبژێکارو قسەکەری نێوان ئەنکەرەو پەکەکە، وەلێ وەختێکی بەشێوەیەکی بنچینەیی ئاگربەستەکە لە مانگی پێنجدا کۆتایی هات، ئیدی ئەوان گەڕانەوە بۆ بەرنامەی هەوەڵ‌و بڕیاریاندا دەسەڵاتێك فەراهەمبهێنن تا بەنەزمێکی ئاشتیانە برەو بدات بە خواستە سیاسییەکانی نەتەوەی کورد. وەلێ نێردراوەکان بەسەختی دەیانتوانی ئەو پشتیوانییە بۆ کارکردن لەسەر پڕۆسەکە بەدەستبهێنن. گەریلاکان لەکەمپی زەڵێ، ئەو نێردراوانەیان وەك هەلپەرستێك دەبینی‌و ئەوانیان تۆمەنباردەکرد بە بینینەوەی بەرژەوەندی خۆیان لە مەرگی گەریلاکان تا بۆخۆیان لافی دەوڵەتی کوردی لێبدەن.

نێردراوەکان، هەندێکیان تەمەن‌و رابردویەکی دورودرێژیان هەبوو لە خەبات‌و نەبەردیی سیاسییدا، ئەوان لەژێر فشاردا وایان لێکرا تا بەرگ‌و پۆشاکی مەدەنی فڕێبدەن‌و بەرگی سەربازی بپۆشن‌و پێوەندی بکەن بە یەکەکانی ڕاهێنانی سەربازییەوە. نەوال دەیگوت: "ئێمە(شۆڕشگێڕەکان) ئەوانمان بێبایەخ دەبینی". ناوبراو ڕێگەیەکی دوورو درێژی لەتەك هێزەکانی عوسمان ئۆجەلان بڕیبوو تا لە خواکورکەوە گەشتبوونە زەڵێ. ئەوە لە دومایی ئەو جەنگەی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٩٢ دابوو، کە لەگەڵ کوردانی ئێراقدا دەرگیر ببوون. ناوبراو دەیوت: "ئێمە شۆڕشگێڕبووین‌و لەپێناو شۆڕشدا

دەجەنگاین بۆ گەلەکەمان. ئەوانیش لە جۆرە سیاسەتێکەوە گلابوون کە ئێمە فرێ ناکاراو ئیفلیج تەماشامان دەکرد". هەروەها بایەخی ئۆجەلانیش بۆ ئەنجومەنەکە لاو بوو. چونکە سوریا ئەوەی نەشاردبوویەوە کە هیچ کەیفخۆش نییە بە ئەنجومەنێکی لەو جۆرە. لەوانەیە لەبەرئەوە بووبێت کە ئەو کارە رێگەی خۆشدەکرد بۆ چێبوونی بزووتنەوەیەکی کوردیی سەربەخۆو راسان. هاوکات مردنی ئۆزال هۆیەك بوو تا ئۆجەلان گوتارێکی روون‌و رەوانی بەرامبەرەکەی بۆ روون نەبێتەوە. هاوکات کاری ئەنجومەنەکەش کورتکرابوویەوە لە هێزو هەیمەنەی تاکرەوانەی ئۆجەلاندا. کار گەیشتە ئەوەی لە مانگی هەشتی هەمان ساڵدا ئۆجەلان فەرمانیدا ئاشبەتاڵ لە ئەنجومەنەکە بکرێت.

رێبەری پەکەکە رووبەرووی ئۆپۆزسیۆنێکی چاوەڕێنەکراو بوویەوە. موراد دۆقدیلانی سەرۆکی ئەنجومەنەکەو بەرپرسی پێشووی پارتی کاری خەڵك باوەڕی وابوو کە ئەنجومەنەکە فرسەتی بەنێونەتەوەییکردنی خواستەکانی کوردی بەخشیبوویە دۆزەکەو بواری بەرفراوانکردنی بەخۆداچوونەوەو چاوگێڕانەوەی لەخۆیدا جێکردبوویەوە. سەرەڕای دڵسۆزی موراد بۆ پەکەکە لەرێگەی ئەنجومەن‌و کۆمەڵەکەوە، ئەو دەستی دابوویە بیرکردنەوە لەبارەی ئەوەی کە پێویستە رێبەرایەتییەکی هەمەچەشن هێزی پێبدرێت، چونکە پێی وابوو پێویستە ئەنجومەنەکە رێگەیەك بێت بۆ سنووردارکردن‌و هاوسەنگکردنی هێزو دەسەڵاتی ئۆجەلان.

نیگەرانی موراد کاتێ نومایان بوو کە ساڵی پێشووتر سەردانی بیقاعی کردبوو. لەوێ بۆ یەکەمجار چاوی بەئۆجەلان کەوتبوو. هاوکات لەیەکێك لە وتارەکانیدا بەتەواوی گوێی شلکردبوو بۆ نیازو نواڕینەکانی. موراد دەیگوت: "وتارەکەی ئەو شتێکی تێدا نەبوو کە پەیوەستبێت بە پرس‌و جۆکانی ئێمەو دۆزە سیاسییەکەمانەوە. هەموو ئەوەی کە دەیوتەوە، پێداگری بوو لەسەر ئەوەی کەخودی خۆی چۆن بووەتە جێی سەرسوڕمان‌و چلۆن نومایانی خۆی دەکرد. لەو کۆڕەدا کە ٥٠٠ کەسێکی تێدا بوون تەنێ دەربارەی خۆی دەدوا. دانیشتنەکە ٤ کاتژمێری رەبەقی خایاند. بیرم کردەوە لەوەی کە خەریکم

چی دەکەم، چۆنە وا کەوتوومەتە دەستی دێوانەیەکەوە". موراد دارای نەزمێکی نیو یۆرکیی بوو لە سەرکۆنەکردن بە شێوەی گاڵتەو گەپ (هەرچەند کە ئەو هەرگیز لەوێ نەبووە) هەربۆیە پێدەکەنیو دەیوت: "لەلایەکەوە نەبەردییەك لەگۆڕێدا بوو، لەلایەکیتریشەوە پلانەکانتانو پاشان ئەم پیاوە هەبوو. هەوڵمدا شتەکانی خۆم قایلکەم بەوەی کە زۆر خراپ نەبوو. سەرباری ئەوەی ئەو دەتوانێت چەند بژی؟ ئەوە بەسبوو بۆ ئەوەی بچینە پێشیو دەستبدەینەخەباتو سەرکەوین".

وەلێ ئێستا بڕیاری ئۆجەلان بۆ ئاشبەتاڵی ئەنجومەنەکە بەشێوەیەکی راستەوخۆ نەتەنها تەحەدایەك بوو بۆ پلانەکانی موردا، بەڵکو تەحەدایەکیش بوو بۆ سەر دەسەڵاتەکەی وەك بەرپرسێك لە ئەنجومەنەکەدا. هەربۆیە موراد بڕیارەکەی ئۆجەلانی دایە دوواوە کە وتبووی پێویستە هەموو نێردراوەکان بنوسن رازین بە فەرمانی رێبەری پەکەکە. ئەو وتی: "نوسیم ئەوە دەدەمە دوواوەو هیچ کەسیش بۆی نییە فەرمان بکات بە هەڵوەشانەوەی ئەنجومەنەکە، چوون ئەم پێکهاتەیە رەنگدانەوەی خواستی گەلە".

دەنگدانێکی نوێ بەڕێوەچوو، موراد وتی ١٠٠ کەس لە کۆی ١٣٠ نێردراو دەنگیان دا تا ئەنجومەنەکە بەردەوامبێت. هەرچەند کە ئەوە دژوار بوو بۆ هەڵشاخان بەرووی گەریلا چەکدارەکاندا. موراد دەیگوت: "فەرماندەیەك کە بە عوسمان ناودەبرا، هاتە لامو پێمی گوت، پێویستە تۆ بڵێیت، نەتزانیوە کە ئەمەت نوسیوە". بەم شێوەیە کاتێك موراد وازی هێنا، ئیدی فرە بەسانایی ئەنجومەنەکەش پرژو بلاو بوو. ئیتر هیچ کەس بۆی نەبوو جارێکی تر باسێك لەو پلانە بکاتەوە. ئەنجومەنەکە لەسەرەتاوە بەباشی نەخشەی بۆ دانرا، وەلێ لەکۆتاییدا بەئاشوبو ئاژاوەگێڕیی سەری نایەوە. نێردراوەکانو نوێنەرەکان خۆیان رووبەرووی مەترسییەکی گەورە کردبوویەوە بەوەی هاتبوونە باکووری ئێراق، ئێستایش رووبەرووی مەترسیەکی دی دەبنەوە بەوەی بگەڕێنەوە بۆ نێو تورکیا. هەندێك لەوان پێداگرییان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە هەڵبێن بەرەو کیشوەری ئەورووپا. ٤ لەوانە توانیان بگەڕێنەوە. بەوتەی مورادیش نێزیکەی ١٢ کەسیشیان

لەلایەن هێزەکانی پشتیوان لە رژێم کوژران[٢٥٩]. ئەوانی دیکەیش لە کەمپی زەڵێ دا مانەوە، ئیتر یان پێوەندییان کرد بەهێزەکانی گەریلاوە یاخۆ لە بواری چالاکی رۆژنامەگەریو سیاسیی پەکەکەدا دەستیان دایە خەبات. بەنیسبەت مورادیشەوە، ئەو گوتی بە عوسمان ئۆجەلان لەپلاندایە بۆ ئەوەی دەستبەرداری گروپەکە بێت. لەم بارەیەوە موراد وتبووی: "بە عوسمان ئۆجەلانم راگەیاند کە ئیتر رێیەك نەماوە بۆ بۆ بیرکردنەوە جگە لە بیرکردنەوەی ئۆجەلان، هەربۆیە نامەوێ چیتر لەم پارتەدا بم".

موراد قایلکرا بەوەی کە پەکەکە ویستوویەتی بیکوژێت. وەڵێ ئەو باوەڕی وەهابوو کە گروپەکە یەکلا نەبووەتەوە بۆ کوشتنی، لەبەر ئەو نیگەرانییەی کە دەترسان لەنێو ئەندامانی تری ئەنجومەنەکەدا بەخراپی دەنگ بداتەوە. دەکرا ئۆجەلان فرە هەستیار بوویێت بۆ نەزمێکی هاوشێوەی ئەمە. هەربۆیە گەریلاکان موراردیان لە ماڵێکی سلاّمەتدا لە شاری ئورمییەدا پاراست. دوواتر بە شێوەیەکی نەشیاو دەستبەرداری بوونو وەدەریان نا.

بەرێکەوت، لەهۆتێلێکی هەرزانبایی سەرسنووری ئێراندا، موراد هەڵهات بۆ نێو گوندپارێزەکانی سنووری تورکیە؛ کە چاودێریی جموجوڵو هاموشۆی پەکەکەیان دەکرد. موراد ژمارە تەلەفۆنی خۆی دایە وان تا یارمەتی بدەن بۆ چوونە نێو خاکی تورکیا. بەمجۆرە لە ئەنکەرەیش توانی لەرێگەی پاسپۆرتی ساختەوە دەربازی ئەورووپا بێت. موراد دەیگوت: "پەکەکە هۆشیارییان دابوو پێم کە هیچ نەدرکێنم، وەلێ من ئەوەی بۆم لواو بۆمکرا درکاندمو باسمکرد".

لەراستیدا هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنەکە چاوەڕێکراو بوو. چوون لە نێوەندی هەشتاکانەوە، ئۆجەلان تەنێ دوو ئامانجی لەپێشچاو گرتبوون، ئەوانیش برەودان بە رووبەڕوو بوونەوە چەکدارییەکانو پاراستنی پێگەو دەسەلاّتی خۆی. وەختێکیش رووبەڕوو بوونەوە دەبوو، لەنێوان هەردوولا، ئەو هەمیشە خۆپاراستنی هەڵدەبژارد.

---

[259] For details of the conference, see the Institute’s Bulletin: “Interna" tional Conference on the Kurds" (February 1990).

هەندێکجار تەنها بۆ دڵنیابوون لەپاراستنی خۆی پێش رووداني رووبەڕوو بوونەوەکان ڕێو شوێنی خۆی دەگرتە بەر.

کێشەکە لەوەدا بوو کە هەموو کەس بەمەی نەدەزانی. میتۆدی ئۆجەلان شاراوە نەبوو. وەلێ فرە بەباشی پەردەپۆش دەکرا لەژێر ناوی پلانگێڕیی دژ بە پەکەکەو هەڕەشەکردن بۆ سەر رێبەرایەتییەکەی. لەگەڵ ئەوەی دەکرا ئۆجەلان قایلبێت بە بۆچوونەکانی، وەك یەکێك لە شێوەکانی پێکهاتەی سیاسیی، بۆئەوەی لەرووی نێو نەتەوەییەوە برەو بە کوردان بدات. ئەمەیش زۆرجار بەلایەنی کەمەوە لەڕووی تیۆرییەوە بۆچونێکی فرە باش بوو. ئەوەش یارمەتی پەکەکەی دا کە تەنها ڕێکخراوی ناسیۆنالیستی کوردیی بوو لە نەبەردیدا بوو لەگەڵ تورکیادا. لەراستیدا ئەوە سەخت بوو کە ناسیۆنالیستانی کورد بتوانن ئەو تایبەتمەندییەی پەکەکە لەپێشچاو نەگرن کە بەردەوام لەچالاکیو چەلەنگیدا بوو. ئەوە تەنها ناسیۆنالیستە کوردە پەڕاگەندەو ناپەیوەستەکانی نێوتورکیا نەبوون کە بڕوایان بە بەڵێنەکانی ئۆجەلان هەبوو. تەنانەت کەمال بورکای کە تەمەنێك لە ململانێدابوو لەگەڵ پەکەکەدا، دووا بەدوای ئاگربەستەکەی ئۆجەلان گۆڕان لە بۆچوونیدا لەمەڕ پەکەکە دروستبوو. بورکای بەوە رازی بوو کە لەتەك پەکەکەدا بگەنە هاوپەیمانەتییەك. ئەوەش بە ئومێدی ئەوەوە بوو کە هەردوو ڕێکخراو بتوانن پێکەوە لەسایەی پاڵپشتی ئۆجەلان بۆ پرۆسەی ئاشتیو دانوستان لە تورکیادا سیاسەت بکەن.

بۆرکای بەدەم ئاماژەی هەڵتەکاندنی شانەکانییەوە گوتی: " نەدەکرا ئەو پەرێز بخەین، ئەوە مانای وا نەبوو کە ئێمە بەهەموو شتێك رازیبین کە ئەوان کردوویانە".

ئومێدی بورکای تەنێ ماوەیەکی کەم لەمیانی هەردوو ئاگربەستەکەو پلانی ئەنجومەنەکەدا گەشبینانە دەپێورا. دوواجار لەهاوینی ١٩٩٣ دا پرۆتۆکۆڵەکەی نێوانیان هەڵوەشایەوە. بورکای دەیوت: "لەپرۆتۆکۆڵەکەدا هاتبوو، گەر گرفتێك لەنێوان دوو گروپەکەدا بێتە گۆڕێ، هیچکامیان بۆیان نییە پەنا بەرنە بەر توندوتیژیی. بەڵام پەکەکە دەستی بەو بەندەوە نەگرت".

ئامادەنەبوونی ئۆجەلان بۆ دەستبەردارنەبوون لە دەسەلاتە رەهاکەی، نەبووە لەمپەر، وەلێ پاش ئەوەی پەکەکە رۆژ لەدوای رۆژ گەش‌و نمای دەکردو شۆڕدەبوویەوە بۆ نێو نێوەندە سیاسی‌و فەرهەنگییەکان، ئیتر رەوشەکە گۆڕا. لە دەستپێکی نەوەدەکانەوە پەکەکە وەك هێزێکی گەریلایی گەشە کردوو بەرەو هێزێکی سیاسیی واقعیی وەرچەرخا، ئەوەیش بە پتەوکردنی پێگەی لەنێو چاپەمەنییە پەیوەندیدارەکان‌و پارتە سیاسییەکان‌و دامەزراوە فەرهەنگییەکان هاوتابوو. ئیدی هەوادارانی پەکەکە تەنێ دێهاتییەکان نەبوون، بەڵکو مامۆستایان‌و پیشەوەرو سەندیکاکان‌و پارێزەرانیش هاتبوونە ریزەوەو ئامادەییەکی بەهێز لە نێوەندە شارییەکانی خۆرئاوای تورکیادا هەبوو. ئەمانە هەمووی کاریگەری‌و هێزێکیٚ مەزنی بەخشییە پەکەکە. وەلێ لەجیاتی گرتنەبەری رێوشوێنی پێویست بۆ سودمەندبوونی لەو ئامادەییە بەهێزەی پەکەکەو برەودان بەدامەزراوە نیمچە خۆبەڕێوەبەرەکانی کورد، کە دەکرا شوناس‌و هێزی کوردی بەهێز بکردایە، کەچی ئۆجەلان تەقەلای دەکرد تا هەموو ئەو هێزانە لغاو بکات بۆ برەودان بەپێگەی خۆی‌و پاراستنی هەیمەنەو هێزی پەکەکە.

لەئاکامدا کوردەکان نەیانتوانی گەشەبدەن بە دامەزراوە هەمیشەییەکان‌و نەیانپەرژایە سەر پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی کە لەماوەکانی جەنگو سەرکوتکاریدا نێوچەکەی گرتبوویەوە. هەربۆیە نەمانی هزری ئەنجومەن‌و کاری پێکەوەیی تەنێ لێدانێك نەبوو لە گەشەی سیاسیی کورد، بەڵکو لێدانێك بوو لە نەخشی خۆبەڕێوەبەری‌و نیمچە سەربەخۆیی کاری دامەزراوەکان لەنێو کۆمەڵگەی چالاکوانانی کورد لە تورکیا دا. هەڵهاتنی گەلێ لە چالاکوانەکان بەتۆپزی تەنها زیانی نەگەیاند بە جڤاکی چالاکوانانی کورد، بەڵکو هۆشدارییەك بوو بۆ ئەوانی تر تا هۆشیان بە هێزو هەرەکەت‌و سنووری جموجوڵەکانیانەوە بێت.

## کۆتا هەنگاو

گەریلاکان مەبەستیان بوو تەنگ بەهێزەکانی میریی لەهەرێمەکەدا هەڵبچنن، ئەوان نومایانی هێزی خۆیان بەوە دەکرد کە تاوەکو ئەوکات چەند هاولاَتییەکی خۆرئاوای ولاَت لەخۆیان رادەبینی بێنە هەرێمەکەوە، هەر بۆیە گەرەکیان بوو بەتەواوی هەرێمەکە لەوانیش دابڕن. ئەو گەشتیارانەی کە ویستبوویان رووبکەنە نێوچەکەو هەوایەك لە نێوچە چیاییەکاندا هەڵمژن‌و سەردانی کڵێسا دێرینەکانی ناوچەکەو مزگەوتە سەرنج راکێشەکان بکەن. هەموو ئەوانە پەکەکە هۆشداری پێدابوون کە بەبێ مۆڵەتی فەرمی پەکەکە ناتوانن سەردانی ئەو ناوچانە بکەن.

بۆ ئەم مەبەستە ئەوان پێویستبوو ڤیزا لە پەکەکە وەربگرن. سەبارەت بەوەیش پەکەکە نوسینگەی تایبەتی لەئەوروپا کردبوویەوە بۆ پێدانی ڤیزا بە گەشتیارانی باشووری رۆژهەلاَتی تورکیا. وەلێ زۆرینەی گەشتیاران ئەو هۆشدارییەی پەکەکەیان رەچاونەدەکرد، تا دوواجار پەکەکە دەستی وەشاندو لە سالَی ١٩٩٣ دا توانی ٢٠ گەشتیاری نێوچەکە بڕفێنێت. هەندێك لەوانە لە بازگە کاتییەکانی پەکەکەدا رفێنرابوون، چوون ئەوان ماشینەکانیان دەوەستان‌و رێگا سەرەکییەکانیان دادەخست. هەندێکی تریان وەختێك سەرگەرمی گەشت‌و سەفا ببوون‌و لەشاخەکان نێزیکببوونەوە رفێنرابوون. هەموو ئەوانە بێ رووبەڕوو بوونەوەی هیچ زیانێك ئازادکران. چونکە رفاندنی ئەو گەشتیارانە تەنێ بۆ ئەوە بوو ئەو راستییە پیشان بدەن کە حکومەت لە نێوچەکانی باشووری رۆژهەلاَتدا دەسەلاَتی خۆی لەدەستداوە. هاوکات کەسپ‌و کاری خۆرئاوای ولاَت لەناوچەکەدا تا ئاستێکی کەم مابوویەوەو بەرهەمهێنان‌و بوارەکانی تری هەڵکەندنی چاڵە نەوتەکان هەموو ئەوان بوونە مایەی نیگەرانی‌و سەر ئێشە بۆ میریی. سالَێك پێشتر، سێ لەئەندازیارانی تورك کە لە کۆمپانیای زەبەلاحی نێونەتەوەیی مۆبیل ئۆیل کاریان دەکرد لەلایەن پەکەکەوە لەسێدارە دران. لە سالَی ١٩٩٣ یشدا کۆمپانیاکە ژمارەی کارمەندەکانی کەمکردەوەدو خێزانی کرێکارەکانیشی لەنێوچەی باتمان بردەدەرێ.

هاوکات تیمەکانی شوێنەوارناسی دەرێ بۆ ساڵی ئاینده که بەشێوەیەکی بەربڵاو هەبوون، نێوچەکەیان چۆڵکرد. چونکە پەکەکە هۆشداریدا بوو بەوەی گەر لەوێ بمێننەوە توشی سەر ئێشە دەبن. تەنانەت ئەرتەشی تورکیایش بەوانی وتبوو کە ناتوانن سەلامەتی ژیانیان لەنێوچەکەدا دابینبکەن.

زانای شوێنەوارناسیی ئەمەریکی مایکڵ رۆزەنبەرغ، کە لە شوێنەوارێکی نێزیك بە شاری باتمان لەهاوینی ١٩٩٣ دا مژوڵی کنەکردن بوو، بەم جۆرە رەوشەکەی دەگێڕایەوە: "سەربازەکان ئاماژەی نەهاتییو مەترسییان پێدەداین، پێیان دەوتین نابێت پێش کاتژمێر حەوتی بەیانیو دووای نیوەڕۆ لەشوێنی کارەکەماندا بمێنینەوە". هەروەها دەیوت: "ئەوە راستییەکی نەشاراوە بوو کە دەوڵەت هەموو دەسەلاتەکانی خۆی لە شەواندا لەدەست دابوو، تەنانەت بوونی شۆڵەی رووناکییەك لەشەواندا مایەی سەرسوڕمان بوو".

بەمجۆرە تیمی کارەکەیان لە کۆتایی مانگی حەوت دا بارگەو بنەی پێچایەوە. ئەوە پاش ئەوە هات کە بەردەوام پەکەکە هۆشیارییان پێدەدان لەمەڕ لێپێچینەوەو چاودێریکردنی هەموو کارەکانیان. مایکڵ لەم بارەیەوە دەیگوت: "بەردەوام گوێبیستی پڕوپاگەندە دەبووین، لەتەواوی ئەو شوێنانەی کە گەریلاکان دەیانزانی بوونمان هەیە، پێیان دەوتین پێویستە پوڵو پارەمان بۆ پاشەکەوت بکەن، گەرنا خراپتان بەسەردا دەهێنین"[٢٦٠].

هاوکات پەکەکە کاری دەکرد بۆ خاپوورکردنی هەر شوێندەستێکی مەدەنیو شوێنپێیەکی دەسەلاتی مەدەنی تورك کە لەنێوچەکەدا هەبوو[٢٦١]. گەلێ لەمامۆستاکان

---

[260] Details on events before and after the conference are found in Olmez, DEP, 67–84.
[261] This section draws on Olmez, DEP, 85 – 109, where the interactions between Kurdish and Turkish supporters of the planned new party are de" scribed in detail. I also relied on interviews with Kurdish politicians Mahmut Kilinc, Mehmet Ali Eren, Serafettin Elci, and Mehmet Emin Sever; the views of former PKK militants Selim Curukkaya and Zeki Ozturk; and rival Kurdish

دەستبەرداری کارەکەیان بوون‌و جارێکی کە نەچوونەوە سەرکار، ئەوان وازهێنانیان لاپەسەند تربوو تاخۆیان بدەنە دەست هاتو نەهاتی هەڕەشەی گەریلاکان. بەسەدان قوتابخانە بۆجارێکی تر دەرگاکانیان بەڕووی سالّی نوێی خوێندندا نەکرایەوە. هەندێك لەوانە لەلایەن گەریلاکانەوە ئاگریان تێبەردرابوو. ئیتر زۆرترینی قوتابخانەکانیش بەدەست نەبوونی مامۆستاوە لەمپەریان بۆ درووستببوو.

لەمانگی نۆڤەمبەردا پەکەکە بڕیاری داخستنی سەراسەر قوتابخانەکانی داو هۆشداری دایە تەواوی مامۆستایان‌و قوتابیان تا روونەکەنە قوتابخانەکانیان. ڕێژەی قوتابیان بەشێوەیەکی بەرچاو دای لەکەمی‌و لەگەلّ لە قوتابخانەکاندا مامۆستا سەرەکییەکان بەئامانج گیران. تەنها لەو ساڵەدا بەبەراورد بەساڵانی پێشووتر ٣٤ مامۆستا لەنێوبران. تیمەکەی دکتۆر سولەیمان تەواوی نامەکانیان دەگەیاندە شوێنەکان، ئەوەیش وەك ئاماژەیەك بوو کە گەریلاکان بەخواستی خۆیان دەتوانن لەنێوچەکەدا تەراتێن بکەن. سولەیمان ڕەوشەکەی بەمجۆرە دەگێڕایەوە: "نامەمان دەدایە دەست موختاری ئاواییەکان، بۆ ڕۆژی دواتریش ئەوان دەچوون بنکەکانی پۆلیس‌و پێیان رادەگەیاندن کە گەریلاکان ئەم پەیامەیان پێیە بۆیان". ناوبراو ئەم ڕەوشەی بەقاقاوە دەگێڕایەوە. تەواوی پەیامەکان هۆشدارییان دەدایە مامۆستاکان تا نەچنە سەرکار. هەروەها دەیوت: "گەلێ جار سەربازەکان هەولّیان دەدا مەفرەزەی تایبەت دەرکەن تا قوتابخانەکان بپارێزن. ئێمە هەرکات دەوامان بکرایە شەوان تەقەمان دەکردو بۆڕۆژیی دوایش دیسانەوە قوتابخانەکانمان دەکردە ئامانج، ئیدی مامۆستاکان ئاشبەتالّیان دەکرد. دواتر سەربازەکان دەهاتن‌و ئێمەیش شوێنەکەمان چۆلّدەکرد"[٢٦٢]. بەئاشکرا ئەرتەشتی تورکیا توانای بەرگریکردنی نەبوو. ئەوان زۆربەی بنکە شاخاوییەکانیان پێ چۆلّکرابوو. گەشتە سەربازییەکانیان لەمیانی ڕۆژی نیوەڕۆدا دەکەوتنە بەر هێرشی گەریلاکان. ڕەوشەکە بەشەواندا خراپتر دەقەوما. سەربازەکان

---

leader Kemal Burkay.

[262] Milliyet, April 19, 1988.

دڵنیانەبوون لە هاوسۆزی خەڵکی ئاواییەکان‌و شارەزای نێوچەکەنەبوون، هەربۆیە ملیان دەدا بۆ دەستبەرداربوون لەنێوچەکە لەشەواندا.

کەنداکچی یەکێ لەفەرماندەکانی ئەرتەشی تورکیە لەنێویاداشتەکانیدا دانی بەم راستییەدا ناوە: "هەموو دەستپێشەخەرییەك لەدەستی تێرۆریستاندابوو، تەنانەت سەربازە بەکرێگیراوەکانی میریی(گوند پارێزەکان) سەرگەرمی وازهێنان بوون لە چەکداریی بۆ میریی"[263]. پەکەکە متمانەی بە هێزە سەربازییەکەی هەبوو کە دەستبگرێت بەسەر نێوچەکەداو ئەو بۆشاییە سیاسییە فرە بە پتەوی‌و بەبەرنامەوە پڕبکاتەوە. لە ئۆکتۆبەردا هەریەك لەسەرنوسەرو پەیامنێرانی رۆژنامەیەکی فەرمی‌و نێوچەیی لەدیاربەکر کە بارەگایەکی سەرەکی رۆژنامەیەکی تورکیی بوو بانگهێشکران بۆ ئەوەی گفتوگۆ بکەن بۆ گەریلاکان[264]. ئەو بانگهێشتە هەروا بەهەوانتە وەرناگیرێت. چوون بەرۆژی نیوەرۆدا نوێنەرانی رۆژنامەیەکی لۆکاڵی لەنێوەندی شارەوە رێیان گرتەبەر بۆ کەمپەکانی رۆژهەلاتی نێوچە شاخاوییەکانی نێزیك سلیڤان. لەوێندەر پەکەکە هۆشدارییان دایە تەواوی رۆژنامەنووسەکان کە پێویستە بارەگای رۆژنامەکەیان دابخەن ئەگەر نا رووبەرووی سزای سەربازییان دەبنەوە. بەمجۆرە تارادەیەکی زۆر رۆژنامەنوسەکان دەستبەرداری کارەکانیان بوون‌و چالاکییە لۆکاڵییەکانیان کۆتایی پێهێنا.

کۆتا ئامانجیان بریتی بوو لە دەسەلاتە نێوچەییەکانی میریی لە نێوچەکەدا. پێشتر زۆربەی زۆری دەسەلاتە نێوچەییەکانی نێوچەکەی کۆنترۆڵکردبوو. پەکەکە شارەزایی تەواو تەواویان لەسەر شارەوانییەکان هەبوو، زەمانەتی ئەو دەسەلاتە نێوچەییانەیان دەکرد. هاوکات زۆرێك لە شارەوانییەکانیش هاوسۆزی پەکەکە بوون. وەلێ هەر هێندێك

---

[263] The provinces were Bingol, Diyarbakir, Elazig, Hakkari, Mardin, Siirt, Tunceli, and Van. In 1990, the newly formed provinces of Batman and Sirnak were added. Adiyaman, Bitlis, and Mus also fell under emergency rule as "neighboring" provinces.

[264] Further details on Decree 413 and the effect on the Turkish media are found in Helsinki Watch, Destroying Ethnic Identity (Sept. 1990), 13–18.

مابوون كه ملیان بۆ خواستەكانی پەكەكە نەدەداو رازی نەبوون بەو نەریتە سیاسییەی كە پەكەكە لەنێوچەكەدا پێڕەویان دەكرد. سولەیمان دەیوت: "ئەوەمان بەلاوە گرفت نەبوو كە پارتێك لەوێندەر بارەگای هەبێت، چونكە هەموو ئەو پارتانە دەستگرۆیی ئێمەیان دەكرد". پەكەكە تەنها بەمەوە نەوەستاو لە دەستپێكی ١٩٩٤دا گەرەكی بوو بەتەواوی دەسەلاَتی دەولَەت لەنێوچەكەدا خاپووربكات. هەربۆیە فەرمانی دەركرد بۆ هەموو دانیشتوان كە نەچنە سەركارو واز لە دەوامو فەرمانگەكانیان بهێنن. دكتۆر سولەیمان دەیگوت: "ئەو رێگەیەی ئێمە گرتبوومانە بەر بۆ داخستنی تەواوی رۆژنامەكانو داواكردن بۆ دەستبەرداربوون لە پارتە كۆلۆنیالیستەكان، ئەوانە هەمووی پلاندارێژراو بوون تا بتوانین ولاَتو وارێكی نوێ دروستبكەین". ناوبراو لەسالَی ١٩٩٤ دا پلەی بەرزكرایەوە بۆ فەرماندەی تەواوی هێزە چەكدارەكانی هەرێمی دیاربەكر. ئەو دەیگوت: "گەر ئەو كارەمان بكردایەو وامان بكردایە تەواوی هێزە سیاسییەكان لەوێ دەستبەرداربنو لەمالَێ دانیشن، ئەوا پێویستبوو بەزوویی راپەڕینمان هەلَبگیرساندایە".

## باسی چوارەم:

## گۆڕان لە سەروەت و ساماندا ١٩٩٣-١٩٩٧

یەکەکە لەپاش هەڵوەشانەوەی ئاگربەست لە مانگی پێنجی ١٩٩٣ داو پاشان کوشتنی ٣٣ سەربازی بێچەك لەیەکێك لە مەتەرێزەکانی رێگە سەرەکییەکاندا، ئیتر زیاترو زیاتر بەرەو پەرگیری و توندوتیژیی رۆیشت. لەهێرشەکانیدا بەتەواوی نومایانی هێزو زەبری خۆی دەکرد، بەجۆرێك فرەبەکەمی جیاوازی لەنێوان هێزەچەکدارەکان و خەڵکی مەدەنیدا دەکرد.

لە ئۆکتۆبەری هەمان ساڵدا گەریلاکان هەڵیان کوتایە سەر کۆمپانیایەکی بواری کارەباو دووان لە کرێکارەکانیان رفاند، هاوکات گرپیان بەردایە قوتابخانەیەکی نێزیك بەشارۆچکەی لیز. لە دەرگیرییەکانی دوواتریشدا فەرماندەیەکی ژەندرمەی تورك تەقەی لێکراو کوژرا. لەبەرامبەردا ئەرتەشی تورك دەستی دایە تۆڵەکردنەوە. ئەویش بەنومایانی توندوتیژی و رەق رەفتاریی لەهێزە سەربازییەکەیدا[٢٦٥]. لیز شارۆچکەیەك بوو کە ١٠٠٠٠ کەسێك دانیشتوانەکەی پێکدەهێنا. ئەو لەپەرێزو کەناردابوو، غەوارەکان زۆر روویان لێنەدەنا. هەر لەوکاتەدا سەربازەکان لولەی چەکەکانیان رووکردبووە خانوەکانی ئەوێ و ٣٠ لە هاوڵاتیانی مەدەنی ئەوێ و زیاد لە ١٠٠ کەسیان لێ بریندارکردبوون. هاوکات تەواوی خان و بەرەو دوکانەکانی شارۆچکەکە خاپورکران و هەموو ئەو سیاسەتوانانەی کە روویان کردبوویە شارۆچکەکەو هەوڵیان دەدە کۆڵینەوە لە رووداوەکە بکەن، بەتۆپزی و

---

[265] This section relies on extensive interviews with former PKK militants with firsthand or credible secondhand information on these internal execu" tions. Because of the sensitivity of the subject, I withheld most names. A vari" ety of unpublished sources were critical to this section, including the open let" ters of Cetin Gungor to the PKK, dated April 15, 1983, May 10, 1983, Oct. 19,
1983, March 18, 1984, and August 16, 1984, and an unsigned, undated eulogy for Enver Ata in 1984. Also used was a pamphlet from Die Gruenen / GAL, “Politische Mord in Europa," 25/6/87.

بەهێزی سەربازەکان تێکڕا گەڕێنرانە دوواوە. چەند هەفتەیەکی کەم پاش ئەوە، تەواوی خەڵکی شارۆچکەکە شاربەدەربوونو هەڵهاتن. پیاوە پیرەیەکی ئاواییەکە بەردەوام دەیوتەوە: "ئای چ کارەساتێك لە لیز روویدا؟".ئەو لەوەلاّمی رۆژنامەنوسێکدا دەیوت: "رێگەچارەی سەربازیی بە وەك تۆڵەیەك لەو شارۆچکەیە داواکرابوو"[٢٦٦].

ئەم نەزمی هێرشو هەڵمەتانە جار لە دووای جار لە ساڵی ١٩٩٤ وە زێدەتر و سامناکتر دەبوون. هاوکات زۆرێك لەخەڵکی نێوچەکە پەڕاگەندەکرانو بە هەرێمەکەدا سەرگەردان ببوون.

سیعرت بەشێوەیەکی سەرەکی کەوتبووە نێوان کەمپی گەریلاکان لە باکوری ئێراقو نێوچەی سەرەکی ئۆپەراسیۆنەکانیان لە چیای جودی. یەکەی زرێپۆشەکانی تورك، پاش ئەوەی گوێبیستی تەقو تۆقێك دەبوون، ئیدی بۆردومانی شارو شارۆچکەکانیان دەکرد، بۆنموونە لەکاردانەوەیەکدا پیرە پیاوێكو ساوایەكو دوو منداڵ کوژرانو چواری دیکەیش بریندارکران.

چەند رۆژێکی کەم پاش رووداوەکەی دەستپێکی سەری ساڵی زایینی. بۆردومانێکی دیکە شاری سعرتی گرتەوەو لەئاکامدا شەش کەس کوژرانو چواری دیکەیش بریندار بوون. هێزە ئاسایشییەکان بەرروونی دەیانگوت، کە ئەوە تۆڵەی ئەو تەقو تۆقانەیە کە گەریلاکان لەنێوچەکەدا دەینێنەوە. هاوکات وەختێك لەمانگی ئازاری هەمان ساڵدا گەریلاکان هەڵیانکوتایە سەربینایەو باڵەخانەکانی میری لەشارەکەدا، ئیدی هێزەکانی ئاسایشو گوندپارێزەکانیش بە هەڕەمەکی بەربوونە دەستڕێژی گوللە بەنێو ماڵەکانداو ١١ لە دوکانەکانی ئەو شارەیان خاپورکردو هاوکات بارەگای رۆژنامەیەکی کوردیی کە هەوادارانی پەکەکە دەریاندەکرد ئاگریان تێبەردا.

هاوشێوەی ئەم رووداوگەلە لەسەراسەری نێوچەکەدا لەلایەن ئەرتەشی تورکەوە بەردەوامبوو. ئەو رەوشە هۆکارێك بوو تا خەڵکێکی زۆری شارۆچکەو ئاواییەکانی ژێر

---

[266] Semir, open letter to the European committee, April 15, 1983.

چنگی شەڕ، ڕووبکەنە گەڕەکە تەسکەبەرو هەژار نشینەکانی دیار بەکرو شارەکانی خۆرئاوای تورکیا. تەواوی ئەو ئاواییانەی کە ببوونە مەکۆی ئازوقەو خۆراکی پەکەکە، سەرچاوەیەکی باش بوون بۆ پێدانی زانیاریو هەواڵ بە گەریلاکان زۆر بەسەختی ڕووبەڕووی زەبری سەربازی تورکیا بوونەوە[٢٦٧]. ٥ ئاوایی لە چیای جودی بەتەواوی تەقێنرانەوەو تەختکران، لەئاکامدا ٢٤ هاولاتی مەدەنی کەزۆربەیان بەتەمەنو زارۆ بوون کوژران. ئەرتەش لەو بارەوە دڵنیابوو کە هەموو ئاواییەکان هاوسۆزی پەکەکەن، بەلام بەهیچ جۆرێك جیاوازیان لەنێوان هاوسۆزێکی بێ چەكو چەکدارێکی پەکەکەدا نەدەکرد تەنها جیاکاریی ئەوان بۆ خەڵکەکە لەوەدا خۆی دەبینیەوە کە ئایا خەڵکی ئاواییەکە پێوەندیان لەتەك هێزە کرێگرتەکانی گوندپارێزی سەر بەمیریدا هەیە یان نا؟. ئیدی گەر پێوەندییان هەبوایە ئەوا ڕێگە خۆشکەرێك بوو بۆ نواندنی هاوسۆزی یاخۆ ئاواییەکەیان جێدەهێلاو هیچ زیانێکیان بۆیان نەدەبوو.

یەکێك لەو شێوە ئەزیەتدانەی خەڵکی ئاواییەکان کە هەمیشەو بەردەوام دووبارە دەبوویەوە، ئەوە بوو کە هێزە ئاسایشییەکان کە زۆرجار گوندپارێزەکانیان لەتەکدا بوو. لەگەڵ سەبای ساڵحاندا لەنێوەندی ئاواییەکاندا خەڵکیان گرددەکردەوەو ناچاریاندەکردن کە ببنە گوندپارێز یاخۆ دەبوو لە زێدی خۆیان رابگوێزرێن. هەروەها دێهاتییەکانیان ڕووبەڕووی ئازاری جەستەیی دەکردەوەو خانووبەرەی خەڵکە هەژارەکەیان گرتێبەردەدا. گەڵێ جاریش پیاوەکانیان راپێچ دەکرد تا پرسو جۆو کۆڵینەوەیان لەبارەوە بکەن. کەچی پاش ماوەیەك تەرمەکانیان بەفڕەدراوی دەدۆزرایەوە.

بەمجۆرە فشارو هەڕەشەو گوڕەشەی سەر زۆربەی ئاواییەکان هۆیەك بوو تا دێهاتییەکان بارگەو بنەیان وەپێچنو لەزێدی چەندین ساڵەیان هەڵبێن[٢٦٨].

---

[267] Ocalan, PKK’ye Dayatilan, 47.

[268] From the German"language translation of a November 1985 brochure issued by the PKK in Europe: “PKK"Vertretung in Europa," November 1985.

له لوتکەی ئەم رامیارییەدا لەساڵی ١٩٩٤ نێزیکەی ١٠٠٠ نشینگەی کورد بەتۆپزی راگوێزران. ئەوە جیا لەو ١٠٠٠ نشینگەیەی کە بەشێوەیەکی سەرەکی لەژێر فشارو زەبری شەڕەکاندا لەنێوان ساڵانی ١٩٩٠ بۆ ١٩٩٣ بۆخۆیان زێدەکانیان چۆڵکردبوو. بەم نەزمە راگوێزان بەشێوەیەکی زۆرەملێ بەدرێژایی دەساڵ درێژەی کێشا. ئیدی ژمارەی ئەو ئاوابیانە، کەببوونە جێ ئامانجی دەوڵەت لە کردە سەربازییەکاندا کەمتربوونەوە. بەگشتی لە و دەمەدا نێزیکەی ملیۆنێکو سێ سەد هەزار هاوڵاتی کورد راگوێزرابوون. زۆربەی ئەو هاوڵاتییانە رووياندەکردە گەڕەکە هەژارنشینەکانی دیاربەکرو ئەدەنەو شارەکانی خۆرئاوای تورکیا وەك ئەزمیرو ئەستەمبوڵ. ئەوە هەوڵێك بوو کە دەوڵەت واقیعبینانە بیریلێکردبوویەوە. ئەویش لەپێناو ئەوەدابوو کە بەرگریی چەکداریی پەکەکە وردەوردە لەنێوبەرێت. هەربۆیە لەو سۆنگەیەوە دەستی دابوویە کارو چالاکییەکانی. تۆپقیدار دان بەوەدا دەنێك کە راگواستنی کوردان کەڵکی گەلێ لە کەلەبەرەکانی دەوڵەتی گرت. ئەو دەیوت: "دێهاتییەکان هەموو شتێکیان بۆ ئێمە دابین دەکرد، خۆراك، پۆشاك، زانیاریی نهێنی. وەلێ کاتێك ئاوابییەکان چۆڵکران، هەموو ئەو شتانەیش لە ئێمە سەنرانەوە"[269].

هاوکات دەوڵەت گرنگی دا بە بەهێزکردنی خاڵەکانی پشکنین بەتایبەت لەو شوێنانەی کە پێشتر ببوونە سەرچاوەی سەرەکی گردکردنەوەی کۆمەكو خۆراك بۆ گەریلاکان. هەروەها ئەو شوێنانەی کە سەرچاوەی هێزی گەریلا نوێیەکان بوونو لەوێوە پێوەندییان بە کەمپەکانی نێوچە شاخاوییەکانەوە دەکرد.

لەهەموو ئەو دیژبانیانەدا خەڵکی ئاوابییەکان بەتایبەت جەوانو لاوەکان داوای ناسنامەیان لێدەکراو دادەبەزێنرانو پرسیارو کۆڵینەوەیان لەبارەوە دەکرا. هاوکات هەر ئۆتۆمبیلێك بارێکی پێبوایە وەك پۆشاكو خۆراكو پێداویستییەکانی ژیانی رۆژانە، ئەوان بەگومانەوە دەیانوەستانو گومانی ئەوەیان لێدەکرد کە کۆمەكو دەستگرۆیی

---

[269] Birand, Apo ve PKK, 163.

گەریلاکان بکات. یاخۆ کەسێك ئەگەرچی دارای خێزانێکی گەورەش بووایە ئاسان نەبوو بتوانێك شمەكو خۆراکێکی فرە بەرەو دوکان یان خێزانەکەی لەشارەوە بۆ ئاواییەك یان شوێنێکی دیکە بەرێت.

گەریلاکان وردە وردە خۆراكو کۆگاکانی ئازوقەیان دای لەکەمیو ژمارەی ئەو گەریلایانەی کە روویاندەکردە چیا کزببوو. بەشێوەیەکی گشتی هۆکاری ئەوەیش دەگەڕایەوە بۆ دژواریی دەستڕاگەیشتن بە بنکەکانی گەریلا لەچیاکاندا.

دکتۆر سولەیمان کە ساڵی ١٩٩٤ ببوویە فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکانی پەکەکە لە هەرێمی ئامەد دا. ناوبراو نەخشەیەکی سادەو ساکاری کێشابوو، ئەو نەخشەکەی پیشاندام، تێیدا هەموو خاڵەکانی پشکنینو بازگە نوێیەکانو ئاواییە راگوێزراوەکانی دیاریکردبوو. ئەو پێمی وت: "هەلومەرجی سایکۆلۆجی کە پشتیوانی بۆ پەکەکە فەراهەمهێنابوو نەگۆڕاوە. وەلێ دەوڵەت توانیویەتی رەوشی فیزیکی بگۆڕێت. چوون ئەوان هەموو ناوچەکانی نێوان چیاکانو شارەکانیان چۆڵکردووە".

ئەرتەشی تورکیا میتۆدێکی زۆر دوژمنکارانەو توندی دژ بە پشتیوانانو سەرخەرانی پەکەکە گرتە بەر، ئەوەیش وەك تاکتیکێك وەها بوو بۆ رووبەڕوو بوونەوەی هەڵگەڕاوەکانو جودا خوازەکان. پێشتر سەربازەکان راهاتبوون بە هەڵکوتانی لەناکاو و خێرا بۆ سەر کەمپو بارەگای گەریلاکان لەچیاداو ئیدی لەگەڵ تاریکی دادەهات دەکشانەوە، وەلێ لە ئێستادا ئەرتەش بۆ چەند هەفتەیەك دەتوانن لە پاش پەلامارەکان بمێننەوە. ئەوان بە تفاقو ئامێری نوێو پێشکەوتوو دەتوانن تاقیبی هەموو جوجوڵێکی گەریلاکان لەچیادا بکەن، بەجۆرێك گەریلاکان نەیاندەتوانی بچوکترین جوڵەبکەن. ئەمەیش هۆیەك بوو تا کۆنتاکی نێوان گەریلاکان کەمبێتەوەو نەتوانن چیدی بەسانایی دەستیان رابگات بە کۆگاکانی خۆراكو خەڵكو پێداویستییەکانیان.

ئازمان دەیوت: "هەموو ئەو سەربازانەی ئەرتەش کە بەردەوام دەنێردرانە نێوچیاکان بۆ کێومالکردنی گەریلاکان فرە پێشکەوتوو پرۆفیشناڵبوون لەکارەکانیاندا، ئەوان بە تاکتیکەکانیان دەزانی". ناوبراو پێشتر پارێزەر بوو، پاشتر لەنێو پەکەکەدا پێگەی

بەرزببوویەوە تا ببوویە فرەماندەی هەرێمی سەرحەد(ئاگری). ناوبراو دەیگوت: "ئەوان نێوچەیەکی بەرفراوانیان گرتبوو، هەوڵیان دەدا ئێمە بەشێوەیەکی بەردەوام سەرگەرمکەن بە جەنگو پێکدادانەوە. تۆ نەتدەتوانی بەسانایی بزانی لەدەورت چی دەگوزەرێو نەتدەتوانی بجوڵێیت. ئیدی پاش ماوەیەك رۆحییەی مەعنەوی خەڵك تێکشکا. بۆیە ئەوان دەستیاندایە وازهێنان لە ژیانی خۆیانو یەکلابوونەوە بۆ خواستە راستەقینەکانیان". گۆرانە تاکتیکییەکانی سوپا تەنێ لە پارێزگای ئاگری دا قەتیس نەمابوون، بەتایبەت سەختبوو کشان بەتەنها ئاراستەیەك بەرەو چیا سنوورییەکانی دیوی ئێران. هەربۆیە لەسەرانسەری باشووری رۆژهەڵاتی تورکیادا فەرماندە سەربازییەکانی پەکەکە لەهەمبەر تاکتیکە سەربازییە نوێیەکانی تورکیادا توشی سەرسورمان ببوون. کوچوك زەکی فەرماندەی هەرێمی ئەرزرۆمی پەکەکە بەم شێوەیە رەوشەکەی ڕووندەکردەوە: "سەربازەکان لە جەنگی چیاکاندا ئەزموونی باشیان وەرگرتبوو، هاوکات هێزی زەمینیو ئاسمانییان لەو پێناوەدا خستبووە گەڕ". ناوبراو بە دەنگێکی رەوان رونیکردەوە کە سەربازەکان دەستیانکردبوو بە کشان بەرەو نێوچەگەلێك کە تا ئەوکات نەیانتوانی بوو توخنی ئەو نێوچانە بکەون.

هەرچەند شۆرشگێرانی پەکەکە بەردەوامبوون لەچالاکیو بە کارامەیی مابوونەوە. بۆنموونە لە مانگی حەوتی ١٩٩٤ دا، فەرماندەی گەریلاکان لەهەرێمی هەکاریدا راپۆرتیدابوو کە زیاد لە بیست چالاکی گەریلایی جیاوازیان لەسنوورەکەدا ئەنجامداوە، لەوانە لە هەڵمەتێکی پارتیزانیدا گەریلاکان توانیبوویان ١٤ سەربازی تورك بکوژن، بەمەیش بەجۆرێك لەجۆرەکان سەربازانی تورك باجی تۆڵەکردنەوەکەی خۆیان وەرگرت. نەوال وەك خانمێکی فەرماندە، چالاکییەکانیی لەزاگرۆسدا بوو. ئەویێ هەرێمێکبوو دەیرِوانیی بەسەر سنووری تورکیاو ئێراقداو نێزیك بوو بە شەمدینلی. ناوبراو دەیگوت یەکە سەربازییەکان یەك لەدووای یەك تێکدەشکێنران، وەلێ کە هێرشمان دەکردە سەر نوکتەیەکی سەربازی، دواتر لەهەمان شوێندا دایاندەمەزراندەوە، کە سەربازێکمان دەکوشت، سەربازێکی تریان دەناردە شوێنەکەی. بەڕاستی لە ساڵی ١٩٩٣ دا ئێمە

ئێجگار سەرکەوتوو بووین. وەلێ لە ١٩٩٤ زیانو زەبرێکی فرەمان بەرکەوتبوو".
گەریلاکان هەوڵیاندەدا ئۆجەلانو سەرکردەکانی نێزیك بەو ملپێبدەن تا تاکتیکێکی نوێ لەهەمبەر جەنگەکەدا بگرنەبەر، وەلێ پێشنیازەکانیان لەلایەن ئۆجەلانەوە وەلامنەدرایەوە.

کوچوك زەکی دەیگوت: "ئێمە دەمانوت پێویستە پێوەندی بەهێزمان لەتەك خەڵکی شارەکان هەبێت، ئەوان دەیانگووت نەخێر لەچیاکاندا دەمێنینەوە، هەڵهاتن لە گوللەکان زیانەکانمان زیاتر دەکات". بەم شێوە گەریلاکانی پەکەکە مەیدانی نمایشی چالاکییەکانو مانۆڕی خۆنیشاندانیان کورتکرابوویەوە لە نێوچەیەکی قەتیسماودا. تۆپقیدەر دانی نا بەو راستییەدا کە جەنگە گەریلاییەکە بەباشی لە جێبەجێکردندا نییە. ئەو دەیگوت: "گەر تۆ فەرماندەیەك بیت، پێویستە لەنێوچەکەی خۆت بەرپرس بیت، وەلێ لەنێو پەکەکەدا تەنێ ئۆجەلان دەیپەرژایە سەر بەرپرسایەتی هەموو شوێنەکانو هیچ کەسی تر بۆی نەبوو".

## گرفتەکان لە سیاسەتدا

پارتی سیاسیو فەرمیی کورد HEP، پارتێکی گرنگ بوو بۆ برەودانو کۆڵینەوە لەمەڕ مشتومڕەکان بۆ چارەسەریی دۆزی کورد لە تورکیا، چوون بۆ ئەو پارتە فرە سانا بوو کە چالاکی بکردایە وەك هەڵوێستێکی نافەرمی و ناڕاستەوخۆی گروپە شۆڕشگێڕەکە کە پەکەکە بوو. ئەوە لەکاتێکدا گەر تورکیا بڕیاری ئەوەی بدایە کە بەڕێگەی دانوستان چارەسەرییەك بۆ دۆزی کورد بدۆزێتەوە. وەلێ دامەزراوەی سیاسیی تورك دووابەدوای مردنی تورکوت ئۆزال لە نیسانی ١٩٩٣ بەنەزمێکی چاوڕواننەکراو خۆی نیشاندا[٢٧٠]. چوون

---

[270] This figure is my own. Hatice Yasar, writing in the magazine Sterka Rizgari, No. 21, 2002 (Istanbul), 89fn12, names many of the same people; Bi" rand, in his Apo ve PKK, 121, came up with a figure of 10, but did not specify names.

دەوڵەت هەرگیز بەوەها دانوستانێك لەگەڵ سیاسییەكانی ئەو حزبەدا رازی نەدەبوو كە بەردەوام پێیان وابوو كێشەی نێوچەكە هەژارییەو تێرۆریزم نییە.

دوواجار لە مانگی حەوتی ١٩٩٣دا دادگای دەستوری توركیا بڕیاری داخستنی پارتەكەی دەركرد. بڕیاری "١٠١" كە بانگەشەی پارتەكەیە بۆ مافە بنچینەییە ئیتنیكییەكان، لەگەڵ دەستووری بنچینەیی وڵاتدا ناتەبایە. هەروەها ئامانجەكانی پارتەكە هەموو ئەوانەی بۆ دادگاكان، وا رووندەكردەوە كە شێوەتێرۆریستو تێكدەرین[٢٧١].

بڕیاری دادگا بۆ پارتەكە چاوەڕێكرابوو، چوون ڕێوشوێنی دۆسییەی سەر پارتەكە ساڵێك پێشتر دەستپێكرابوو. ئەوە هەر لەوكاتەوە بوو كە سیاسییەكانی پارتەكە هەنگاوگەلێكیان رووەو پاراستنی كورسییەكانیان لە پەرلەماندا گرتبوویەوە بەر. هەربۆیە هەر لەوكاتەوەی پارتێكی نوێ لەبەهاری ١٩٩٣ بەنێوی پارتی دێموكراسی DEP نێوی تۆماركرا. ئیدی لەو میانەدا پارتیHEP داخرا. دوواتریش زۆرینەی خەڵكیی ئەندامێتی خۆی گواستەوە بۆ نێو پارتە نوێیەكە. هەرچەند كە لەسەرەتادا پارتەكە وەك پارتی كوردو تورك خۆی ناساند، بەمەیش هاوسۆزانو لایەنگرانی پەكەكە تێیدا شوێنێكیان بۆ نەدەمایەوە. لەلایەكی تریشەوە وەك پارتێكی یەك توخمو یەك نەتەوەو پەیوەست بەكورد تەماشادەكرا، كە دەبوو هاوسۆزانی پەكەكە بتوانن رۆڵی تەواوی تێدا بگێڕنو پێیان وابوو كە پێویستی نەكردووە تێیدا شوناسی نەتەوەیەك پێناسەبكرێتو دیارییكەن.

یەكێك لەبەرپرسەكانی HEP پێمی گوت: "وەختێك HEP داخرا، ئیدی چالاكوانەكانی پەكەكە وتیان باشتر، پارتێكی گەورەتر دادەمەزرێنین. وەلێ وەختێك لەگەڵ كوردانی سەربەخۆدا دیدارم دەكرد، ئەوان دەیانگوت نەخێر، چوون ئێمە دەزانین

---

[271] The men arrested for the attacks on Ata and Gok had worked in the PKK's Serxwebun newspaper according to the Gruene/GAL report, "Politische Mord in Europa," 14.

چ گۆڤەندیٚ دەخولٚقیٚت. ئیدی ئەوان چالاکوانەکانی پەکەکەو پەکەکەیان بەوە قایلکرد کە دەستبەرداری هەولٚدان بن بۆ دەستبەسەراگرتنی پارتە نوێیەکە، بۆ ئەوەی ئەویش بەدەردی HEP نەچێت". هەروەها دەیوت: "من گوتم نەخێر، ئەوانیش(پەکەکە) تێگەیشتن لەشتەکانو بەوەیان زانی کە رەوشەکە ناکرێت بەو شێوەیە بەردەوام بێت. چوون ئیتر رەوشەکە گۆڕاوە".

پارتە نوێیەکە دەستی دایە بانگەشەیەکی گشتیو کاریگەر لەبارەی چۆنییەتی مامەڵەکردن لەگەڵ دۆزی کورد دا لە تورکیا. لەم بارەیەوە ئەمخواستانە بەئاشکرا بانگەشەیان بۆ دەکرا: کوردەکان مافی خۆیانە فێری زمانو نوسینی زمانەکەیان بنو پەخشی زمانی کوردیی ئازادو یاسایی بکرێت. هاوکات ئەوان ئازادن لەوەی کە گەشە بەشوناسی نەتەوەیی خۆیان بدەن. هاوکات پێویستە زەبرو زەنگو باری نائاسایی لەنێوچەکانی باشووری رۆژهەلاتی تورکیا هەلٚبگیرێت. هەروەها پێویستە هەرچی زووترە زەمینەسازیی بۆ ئاگربەست بکرێتو لێبوردنێکی گشتیش دەربکرێت لەسەرانسەری نێوچەکەدا.

وەلیٚ پارتەکە پێی باش بوو پێش دەستدانە چارەسەری گرفتەکان لەلایەنی میرییەوە پێویستبوو نێوی گرفتەکان دیاری بکرایە. چوون بە تێڕوانینی پارتەکە نێوی گرفتەکە گرفتی کوردان بوو لە باشووری رۆژهەلاتی تورکیا دا[٢٧٢].

بەلاٚم لەگەڵ مردنی ئۆزال لە دەستپێکی ئەو سالەٚدا. ئیدی ئاڕاستەی سیاسیی حکومەت بەئاڕاستەیەکی توندو تیژدا وەرچەرخابوو. سەرۆك وەزیران تانسۆچیلەر وەك خانمێکی نەشارەزای سیاسیی. سەرۆکایەتی کابینەی حکومەتی نوێی گرتە دەست. ئەوە لەکاتێکدا بوو کە سولەیمان دێمیریلیش بووە سەرۆکی کۆماری تورکیا. ناوبراو گرفتی ونو چارەنەکراوی کوردی فرە بەهەند وەرنەدەگرت. تانسۆچێلەر چارەسەری دۆزی کوردی سپاردە سوپای ولاٚتەکەی، ئەو سوپایەی تامەزرۆ بوو تا هەموو

---

[272] Cumhuriyet newspaper, Nov. 12, 1985.

ئازادییەك زەوتبكاتو هەموو زەمینەیەکی دەستێوەردانی مەدەنیی لەچارەسەری دۆزەکەدا نەهێڵێت. ئەو لە وتارێکیدا جەختی لەسەر ئەم خاڵەکردەوە: "ئیدی بەنەزمێکی جیاواز دەجوڵێینەوە"[٢٧٣]. بەم شێوەیە سەرۆك وەزیران بەڵێنی دا هەموو پشتیوانییەکی خۆی بۆ هێزە تایبەتییەکانی سوپا دوپاتبکاتەوە.

لە نیوەی دووەمی ١٩٩٣ دا. تەواوی چالاکوانانی کورد بەئامانج گیران، ئیتر ئەوان ڕووبەڕووی ئازارو کوشتنو دەستگیرکردن بوونەوەو کوشتنی بەکۆمەڵو بێسەروشوێنکردنو غافڵکوژکردنی گروپەکان بەشێوەیەکی بەرچاو ڕووی لەزیادیی کرد.

هەربۆیە بەرپرسانی پارتە نوێیەکە دەنگی ناڕەزاییان بەرزکردەوە بەوەی کە لەلایەن هێزەکانی ئاسایشو پۆلیسو بەکرێگیراوانی گوندپارێزەوە ڕووبەڕووی هەڕەشە کراونەتەوەو هاموشۆی نێوان شارەکانیان لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیادا لێزەوتکراوەو هاوکات بەردەوام بانگەشەو تۆمەتی یاریدەو هاریکاریی گەریلاکانی پەکەکەیان بۆ دەتاشرێت. هاوکات فرە بەسانایی کوشتنو تیرۆری چالاکوانانی کورد لەنێوچەکەدا بازی بەسەردا دەدراو هیچ لێپێچینەوەیەك لەو بارەوە ئاکامی نەبوو. لە سێپتێمبەری هەمان ساڵدا پەرلەمانتاریی DEP موحەمەد سینجەر لەمیانی سەردانێکیدا بۆ باتمان تا کۆڵینەوە لەبارەی شێوازی کوشتنەکان بکات، کەوتە مەتەرێزی چەند کەسێکەوەو غافڵکوژکرا. هاوەڵانو بەرپرسانی دیکەیDEP کە لەگەڵ سینجەر بوون دەمودەست هێزە ئاساییشییەکانیان بەوە تۆمەتبارکرد کە لەپشت کوشتنی هاوەڵەکەیانەوەن[٢٧٤]. ئەوان تێبینی ئەوەیان کردبوو کە لەهەموو سەردانەکانیان پۆلیس هاوسەفەریان بوونە، وەلێ لەو جارەدا هیچ بۆلیسێك لەگەڵ وەفدەکەدا نەنێردرا بوو.

---

[273] In his letter dated August 16, 1984, Semir identifies her as Ayten Yil" dirim, a name I also was given

[274] This section utilizes especially the firsthand experiences in the region of Baran, Celik, and former PKK militant S. The main published sources were Birand, Apo ve PKK, 134–143, and Imset, the PKK, 41–44, 107.

دیاره كه ئەم هێرشانە ئەندامانی پارتەكەی بەرەو توندڕەوی‌و رادیكاڵییەت دەبرد. هاوكات بەشێك لە ئەندامانی پارتەكەیش لەترسی كاردانەوەی هەڕەشەكان‌و لەترسی رەوشەكەدا دەستبەرداری پارتەكەیان بوون. هەروەها هەندێكیش هەڵهاتن‌و زۆرێك لە بەئەزموونترین چالاكوانی پارتەكە بنكەو بارەگاكانی پارتەكەیان بەچۆڵی هێشتەوە. هاوكات ئەندامە گەنج‌و توڕەكانی پارتەكە لەوانەبوو بیریان لە پێوەندیكردن بە ریزەكانی پەكەكە كردبێتەوە، چوون ئەو رێگەیان بەدروستتر دەزانی تا ئەوەی لەناخلاڤێكداو لەشۆستەیەكدا تەقەیان لێبكرێت‌و یاخۆ چاوەڕێبكەن بێنە سەریان‌و قۆڵبەستیان بكەن.

مەحمود كلینجی ئەندام پەرلەمانی سەربە DEP رەوشەكەی بەمجۆرە روودەنكردەوە: "ئەو خەڵكانە بواریان بە تۆ نەدەدا بەتەنهایی سیاسەت بكەیت، بەراستی ئەوە دەوڵەت بوو كە خەڵكی ناچار دەكرد رووبكەنە شاخەكان‌و هەڵبێن". لەسێپتەمبەری ١٩٩٣ دا حەتیب دیكل، كە پەرلەمانتارێكی DEP بوو، روانگەو رێبازێكی فرە رادیكاڵ‌و توندی هەبوو. لە گروپەكەیدا دەنگی بۆدرا بۆ لێپرسراوی هەموویان. بەبۆچوونی چاودێران هەڵبژاردنی دیكل‌و دەرچوونی ئاماژەیەك بوو بۆ گۆڕانكاریی لەبۆچوونی پەكەكەدا كە ئیدی پێویست نەبوو لەپشت پەردەدا بمێنێتەوە[٢٧٥]. گۆڕانكارییەكە رەنگە لەلایەن ئەوانەوە كە هەیمەنەیان لەباشووری رۆژهەڵاتی توركیا بێ چەندو و چوون بوو لغاوكرابێت. چوون ئەوان بوونی هێزێكی تریان لەسنورەكەدا بۆ سیاسەتكردن بەپێویست نەدەزانی.

دووا بەدووای هەڵبژاردنی دیكل ئیتر راستەوخۆ بارەگای سەرەكی پارتەكە تەقێنرایەوەو كەوتە بەر دەستڕێژی گوللە. هاوكات سكرتێری گشتی پارتەكە موراد بۆزلەك لە ئەنكەرەدا كەوتە بەردەستڕێژی گوللەو بریندارکرا. لەكاردانەوەی ئەو زنجیرە دەستدرێژییەدا لە نێوچەكانی باشوری رۆژهەڵاتی توركیا بەرپرسانی پارتەكە دەنگی ناڕەزاییان سەبارەت بەو هێرش‌و هەڕەشانە بەرزكردەوە[٢٧٦]. دوواجار لە سێپتەمبەری

[275] Birand, Apo ve PKK, 136.
[276] Birand, Apo ve PKK, 138.

هەمانساڵدا دادگای باڵای دەستووریی دەستی کرد بەتاوتوێکردنی دۆسییەی داخستنی پارتەکە، ئەوەیش بە پاساوی هەوڵدان بۆ جوداخوازیو پشتیوانیی لە گروپی پەکەکە سەرەداوەکانی بۆچنرابوو. هەروەها کۆمیسیۆنی پەرلەمان دەستی کرد بە پرسوجۆکردن لەبارەی لابردنی حەسانەی پەرلەمانیی لەسەر چەند ئەندام پەرلەمانێکی DEP، دیارە ئەوەیش هەوەڵ هەنگاو بوو تا بەتۆمەتی ناپاکییو غەیانیی بەسزایان بگەیەنن.

دیارە هەموو تۆمەتەکانیش لەو بەیاننامەوە سەرچاوەی گرتبوو کە نوێنەرەکان سەبارەت بەمافەکانی کورد خستبوویانە پێشچاوی پەرلەمانو ئامادەییان بۆ چارەسەریی دۆزی کوردو سەرزەنشتی جەنگ دژ بە گەریلاکانی پەکەکەیان کردبوو. ئەندامی پێشووی سەربە DEP مەحمود قلینچ لەسەر ئەوە سوور بوو کە کێشەکە هاوسۆزییان نەبوو بۆ ئەندامانی ڕێکخستنە سیاسییەکە، گرفتەکە ئەوە بوو ئایا ئەنکەرە ئامادەیی دەردەبڕێت بۆ هەرچالاکییەکی سیاسیی بەناو و بەنوێنەرایەتی کوردانەوە؟ ناوبراو دەیوت: "ڕەنگە فلان پەرلەمانتاریی پێشوو (نێوەکەی نەدا) لەپەکەکەوە نێزیك بووبێت، بەڵام تا ئەوکات هیچ یەکێکمان بەچەقۆ یان پارچە چەکێکەوە نەگیرابووین، هەرگیز پارتەکە هانی جەنگو توندوتیژیی نەدەدا".

هەروەها دەیگوت: "گەر دەوڵەت جددی بووایەو گەر ئەوان بیانویستایە ئاشتبوونەوەو نێزیکبوونەوە لەتەك کورداندا بکەن، ئەوا پێیان دەوتین بەڵێ بۆ ئاشتبوونەوە، ئێمەیش لەبەرامبەردا بوارێکمان دەرەخسان بۆ چالاکیی پارتەکە. وەلێ هەرگیز ئەو ڕەوشو نیانییە ڕووی نەدا".

هاوکات پەکەکەیش هیچ چاوەڕوانی نەدەکرد، چونکە هێرشە سەربازییەکانی لە کۆتایی ١٩٩٣دا گەیشتبوونە لوتکە. هاوکات زۆر بەفراوانی هێرشەکان لە هەرێمەکانی خۆرئاوای تورکیادا لەتمەیان دەدا لە دامەزراوەکانی میریی. لەمانگی دووی ١٩٩٤ دا. پارتیزانەکانی وێستگەی شەمەندەفەری توزلایان لە ئەستەمبوڵدا تەقاندەوە. لەوێدا پێنج خوێنکاری سەربازییو ٣١ ی دیکە بریندار‌بوون. لەو میانەدا دیکلی لەڕێگەی پەیوەندی

تەلەفۆنییەوە گفتوگۆیەکی بۆ تەلەفزیۆنێکی تورکی ئەنجامدا. ئەو لەو پەیوەندییەدا ئەوەی دایە دوواوە کە سەرکۆنەی ئەو تەقینەوەیە بکاتو رایگەیاند کە لەکاتی جەنگدا سەربازەکان لەبەرگی سەربازیدا جێگەی ئامانجی نەیارەکانیانن[٢٧٧]. دواتر دیکلی رایگەیاند کە ئەو تەنها خاڵێکی یاسایی وروژاندووە. کەچی وتەکانی وەك بەڵگەیەك بۆ پشتیوانیی لەجەنگی پەکەکە لەسەری ببوونە ماڵ. پاش دوو ڕۆژ لەو رووداوە نوسینگەی هەرێمی پارتەکە لە ئەنکەرەدا تەقێنرایەوە. ٤ رۆژ لەپاش ویش بۆمبێك لە سەرکردایەتی پارتەکە لە ئەنکەرە تەقێنرایەوە[٢٧٨].

لەکاردانەوەی ئەو رەوشەدا دیکلی سەرزەنشتی هەریەك لە هێزە ئاسایشییەکانو سەرۆك وەزیران تانسۆچیلەری کردو ئاماژەی بەوەدا کە تەقینەوەی بارەگای سەرەکی حزبەکەی لە شوێنێکدا بووە کە تەنها ١٠٠ مەترێك لە وێستگەی پۆلیسو ٥٠٠ مەتر لە پاسەوانەکانی پاراستنی باڵەخانەی پەرلەمانەوە دوور بووە.

لەبەرامبەردا وەزیری نێوخۆی تورکیا ئاماژەی بەوەدا کە DEP بۆخۆیان بارەگاکەی خۆیان تەقاندۆتەوەو ئەوەیشی راگەیاند کە دیکلی کەسێکی غەیانە بە وڵاتەکەی. هاوکات سەرۆك ئەرکانی گشتی، جەنەراڵ دۆغان رایگەیاند کە لەبری گەڕان بەشوێن باندیستو ئاژاوەگێڕاندا لە شیوی بیقاع، پێویستە لەنێو خودی پەرلەمانی تورکیادا بۆیان بگەڕێین. بۆ پێداگریی لەو بۆچوونە سەرۆك وەزیران تانسۆچیلەر هاوسۆزیی خۆی دوپاتکردەوە. سەرۆك وەزیران لە کۆتایی مانگی دووی هەمان ساڵدا رایگەیاند: "کاتی ئەوە هاتووە کە بوونی پەکەکە لەژێر سەقفی پەرلەماندا پاکبکەینەوە"[٢٧٩].

---

[277] Sources for this section included Syrian Kurds, Ely Carmon, an Israeli expert on Syria and the PKK, and former PKK members active in the Bekaa. Some details relied on Makovsky, "Defusing the Turkish"Syrian Crisis"; Seale, Asad, 427; and David Barchard, "Ozal Signs Security Agreement with Syria," Financial Times, July 18, 1987.

[278] Birand, Apo ve PKK, 177.

[279] Information on Iraq and Iraqi Kurds relies mainly on McDowall, Modern History, 347–352.

لەرەوشێکی وەهادا ئەندامانی DEP بۆیان زۆر دژوار بوو کە هۆشیان بەلای هەڵبژاردنە لۆکاڵییەکانی ئازاری ١٩٩٤ وە بێت. لەو بارەوە مشتومڕی ئەوە لە گۆڕێدا بوو ئایا بەشداریی هەڵبژاردنەکان بکەن یان نا؟ چونکە گرفتی سەرەکی خۆی لەو فشارانە دەبینییەوە کە لەسەر دەنگدەرانو کاندیدەکانی پارتەکەیان دروست دەبوو، بەتایبەت لە باشوورو رۆژهەلاتی تورکیا. لەبەر ئەوە ئامارەی چەندین ترسو بیم لە گۆڕێدا هەبوون کە مەترسی ئەوەیان لێدەکرا پارتەکە نەتوانێت بەسەرکەوتوویی بەشداربێت لەو راپرسییە چاوەڕوانکراوەدا[٢٨٠].

دیکلی هۆشداری لەم بارەیەوە دابوو: "لەبەر ئەوەی ئێمە وەك ئەوان بیرمان نەدەکردەوە، رێکخراو گەلێك دەستیان نابوویە بینی پارتەکەمانەوە".

لەهەمانکاتدا زۆرێك لە ئەندامانی پارتەکە لەسەر ئەوە کۆك بوون کە بەشداریی لە هەڵبژاردنەکاندا بکەن. چوون پێیان وابوو کشانەوە لە واقیعەکە هیچ لەبارەی رەوشەکەوە ناگۆڕێت. لەڕاستیدا گەر میریی بیویستایە پارتەکە بەشداریی پرۆسەی سیاسیی بکردایە، ئەوە حاڵی بەو رۆژگارە نەدەگەیشت، کەواتە پاشەکشەکردن لە هەڵبژاردن تەنها لەسودو بەرژەوەندیی میریدا بوو بەس. لەم بارەیەوە ئۆجەلان فرە بەئاشکرا جیاواز بیری دەکردەوە. بەگوێرەی سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان، تەواوی پشتیوانانی پەکەکە بڕیاریان دابوو بایکۆتی هەڵبژاردنەکان بکەن. دیارە ئەوەیش نموونەیەکی دروستە تا پارتە فەرمییەکەیش بەو ئاڕاستەیەدا بیربکاتەوە[٢٨١].

---

[280] They also were reported to be providing information on Turkish troops movement: See McDowall, Modern History, 426.

[281] This section utilizes interviews with former PKK militants active in Iraq and the Bekaa during this period; and also non"PKK sources familiar with events at the time, including Mesut Akyol and Paris"based Kurdish Insti" tute chairman Kendal Nezan. Published sources: Celik, Agri, 119– 120; Dagli, Birakuji, 29 – 47; McDowall, Modern History, 347, 350 – 351; and Chubin and Tripp, Iran and Iraq, 142. Barzani's comment on the PKK, probably half in jest, was made in 1982 to Nejdet Buldan, who had crossed into Iran to avoid an un" related jail sentence in Turkey.

پەرلەمانتارێکی پێشووی پارتە فەرمییەکە دەیگوت: "پەکەکە لەگەڵ هەڵبژاردنەکاندا نەبوو". هەروەها دەیوت: "پەکەکە ترسابوو کە خەڵکی دەنگەکانیان نەدەنە کاندیدە پەسەندەکانی کورد، بەمەیش شکۆو شەوکەتی پەکەکە دەهاتە خوارێ".

فشارگەلێکی فرە لەسەر پارتەکە هەبوون. لەدەستپێکی مانگی ئازاردا پەرلەمان دەنگی دا لەسەر هەڵگرتنی حەسانەی پەرلەمانیی لەسەر شەش لە نوێنەرانی سەر بە DEPو نوێنەرێکی سەربەخۆی کورد لە پەرلەماندا. ئیدی هەموو ئەوانە یەك بەیەك لەلایەن پۆلیسەوەدەستبەسەرکرانو برانە بەر لێپێچینەوەی دادگاکان. دیارە کە سزای چاوەڕێکراو بۆ هەموو ئەوانە ناپاکییو غەیان بوون بوو بە دەوڵەت. ئەندامانی دی کە تا ئەوکات لەپەرلەماندا مابوونەوە باش دەیان زانی کە کاتی وانیش دێت.

دوواجار لەمانگی شەشدا دادگای دەستووری وڵات فەرمانی دا پارتەکە دابخرێت.

دیارە کە پاساوی داخستنەکە هەمان پاساوی داخستنی HEP بوو. چوون دیسانەوە بانگەشە بۆ مافەکانی کورد لەگەڵ دەستووری بنچینەیی وڵاتدا یەکی نەدەگرتەوەو هەوڵێك بوو بۆ چاندنی تۆوی جوداخوازی لەوڵاتدا. پێش ئەوەی بڕیاری داخستنەکە بدرێت، نوێنەرانی دیکەی پارتەکە لە مشتومڕی ئەوەدا بوون بمێننەوە یاخۆ ڕووبەڕووی ئەگەری دەستگیرکردن بنەوە یا لەوڵات هەڵبێنو دەرباز بن.

ئەوان ئەوە لەمێشکیاندا نەبوو کە بیر لەدامەزراندنی پارتێکی نوێ بکەنەوەو نەیاندەویست دیسانەوە سەرئێشە بۆ خۆیان دروست بکەن. کیلینج بە گلەییەوە دەیوت: "دەوڵەت خەریك بوو یاری مشکانی لەگەڵ ئێمەدا دەکرد". ناوبراو دەیوت: "تۆ پارتێك دروست دەکەیتو ئەو دێت دایدەخات، دیسانەوە دروستی دەکەینەوەو بەهەمان شێوە چیرۆکەکە دووبارە دەبێتەوە". بەرەبەیانی ١٦ی مانگی شەش. ڕۆژی بڕیارە چاوەڕێکراوەکەی دادگا. پێنج لەنوێنەران لەڕێگەی فڕۆکەوە خۆیان گەیاندە بڕۆکسڵ. ئەوەی تریشیان پێشتر چووبووە ئەورووپا. کلینج دەیوت: "ئێمە بیرمان لەوە کردبوویەوە، گەر دەوڵەت ئێمەی نەوێت بۆ نوێنەرایەتی خەڵك، ئەوا بواربداتە کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی تا ئەوە بەچاو خۆیان ببینن". هەڵهاتنی نوێنەرانو داخستنی حزبەکەو

پاشان کردنەوەی دادگا بۆ لێپێچینەوە لە هەشت ئەندامی پەرلەمانی پێشووی تر بە تۆمەتی ناپاکیی، هەموو ئەمانە سەرنجی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بۆ کێشەو گرفتی کوردان راکێشا. وەلێ ئەنکەرە ئارامیی لەسەر ئەو دەنگۆیانە دەگرت‌و زیاتر رابردووی دەهێنایە یادی خۆی، کە بەچ زەحمەتێك توانیویانە یەکپارچەیی دەوڵەت رابگرن‌و چلۆن بەزیندان‌و دوورخستنەوەی سیاسییەکانی کورد وەهایان کردووە کە ئیتر مەحاڵە رێنیسانسێکی کوردانە سەر هەڵبداتەوە.

ئەو پارتە نوێیەی لە شوێنی DEP دروستبوو، بریتی بوو لە پارتی دیموکراتی گەل HADEP. دوواجار ئەویش لەلایەن دادگای دەستووری تورکیاوە لەساڵی ۲۰۰۳ دا داخرا. لەپاش ئەویش پارتێکی تر کە هەرگیز دارای سەنگ‌و سیمای جەماوەریی پارتەکانی پێشووی نەبوو. چوون ئەستەمە بۆ پارتێك کە بتوانێت ئاراستەیەکی سەربەخۆ بگرێت لەکاتێکدا قورسایی جەماوەرەکەی لەوانە پێکهاتبن کە دۆست‌و سەرخەری پەکەکەن. دەوڵەتیش رێگەی نەدەدا سیاسەتوانە کوردە سەربەخۆکان ئەو بۆشاییە پڕبکەنەوە. شەرەفەدین ئاڵچی وەزیری کابینەی پێشوو لە حکومەتی تورکیا لەساڵی ۱۹۹۷ دا پارتێکی سیاسی دامەزراند. دادگای دەستووری وڵات پاش دووساڵ ئەو پارتەیشی یاساغکرد. پێشتر پارتێکی جیاوازی تر هەبوو بەناوی پارتی دێموکراسیی‌و گۆڕان DDP ئەویش بێ ئەوەی فەرمان بەداخستنی بکرێت لەساڵی ۱۹۹٦ دا کەمتر لەساڵێك درێژەی کێشا. کێشەی سەرەکیی بریتی نەبوو لە کاریگەرییەکانی پەکەکە لە رەوشەکەدا، کێشەکە تەنها بریتی بوو لە کێشەی خواستە سیاسییەکانی کوردان لەو وڵاتەدا.

لەراستیدا کێشەی دەوڵەت لەوەدا بوو بڕوای بە سەربەخۆیی سیاسەتی کوردیی نەبوو، هەموو ئەوانەی گلابوون لەچارەسەریی کورد بە یەك چاو تەماشا دەکران. هەربۆیە سیاسییەکانی کورد لە نێوان نیازی دەوڵەت‌و پەکەکەدا بەهەڵپەسێراوی مابوونەوە.

پەرلەمانتارێکی پێشووی DEP دەیگوت: "لەدەرێش وادیاربوو کە هیچمان لەدەست نایە". ئەو دەیوت: "ئەوە راستە، لەوانەیە دارای ئەزموون نەبووبین، وەلی خۆ ئازاد

بووین. ئێمه بۆچوونێکمان هەبووایە، ئەو بۆ چوونه لەپەکەکەوە سەرچاوەی دەگرت"
ئەو له قسەکانیدا هەڵوێستەی دەکردوو دەیوت : "تەماشای ئەوانی تر (نوێنەرانی تورك پێویستبوو بیربکەنەوەو بزانن ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەی چی ویستووە". ئەو بەئاماژە به هەیمەنەی سەربازیی وڵات که راوێژکاریی حکومەت بوون ئەو وتانەی دوپاتدەکردەوە. هەر لەوبارەیەوە وتی: "لەیادمه پەرلەمانتارێکی تورك هاته لامو پێمی گوت: گەر ئێوه زۆر گوێتان رانەدارایه بۆ ئاپۆ و پەکەکە. ئیدی من وتەکانیم بڕیو پێم گوت وا ٧٥ ساڵ تێپەڕیوه بەسەر دامەزراندنی کۆماری تورکیادا ئایا تائێستا هیچ ئامادەییتان دەربڕیوه بۆ وەستان بەڕووی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا؟".

## سیاسەت له دەرێی وولآت

بۆ چەند کاتێکی کەم بەرپرسەکانی پەکەکه له ئەوروپا، لەمەنزڵێکی چۆڵی کشتوکاڵیدا و له زەوییەکی دوور لەشار شوێنێکیان بەکرێ دەگرت. زۆرجار ئەمەیان له وڵاتی هۆڵەندا دا دەکرد، ئیدی نێزیکەی پەنجا ئەندامی نوێیان دەبردە ئەوێو فێری وانەی سیاسییو راهێنانی حزبایەتییان دەکردن. ئەم کوڕو و کچه لاوانەی که لەکۆمەڵگەی کوردیدا دەستەبژێرکرابوون، لەوێو لەو شوێنانه که وەك کەمپێکی راهێنان نێویان دەبرد بۆ ماوەی ٣ مانگی رەبەق کۆرسی سیاسییان پێ دەخوێندن.

له بەیانیاندا راهێنانی وەرزشییو راکردن بوو، دووابەدوای ئەوه وانەی مێژووی کوردو پەکەکەیان پێدەخوێنراو ئاشنا بەتیۆرەکانی مارکسیزم دەکران. پاش نیوەڕوانیش کتێبگەلێکیان سەبارەت بەو بابەتانه دەخوێندەوە. لەکۆتایی کۆرسەکانیشدا گرد دەکرانەوەو وانەی پەیوەست به رەخنه لەخۆگرتنو دەربڕینی تێبینیو بۆچوونی خۆیان لەسەر ئەوانی تر بۆ دەرەخسێنراو خاڵی لاوازو بەهێزی تەڤگەرەکەیان بۆ نومایان دەکرا.
ئۆرهان که نێوێکی خوازراوی یەکێ لەبەرپرسەکانی پێشووی پەکەکەبوو، ناو براو تەمەنی نێزیکەی ٢٩ ساڵێك دەبوو. ئەو یەکێك بوو لەوانەی که له دەستپێکی نەوەدەکاندا ئامادەی بەرنامەو کۆرسەکانی پەکەکه بوو له ئەوروپا. ئۆرهان سەبارەت به رەوشی ئەو

کۆرسانە دەیوت: "ژینگەیەکی فرە جددی بوو، ڕاهێنانەکان فرە سەنگین‌و سەخت بوون". هەروەها دەیوت: "منداڵبازاڕ نەبوو، وەك قوتابخانەیەکی سەربازیی وەها بوو، وەلێ چەکمان پێنەبوو. ئەو وانانەی دەوترانەوە بۆ ئەوە بوو کە چلۆن بتوانین قسەبکەین دەربارەی شتە دیاریکراوەکان، هەروەها فێردەکراین چۆن گوێبگرین‌و چۆن ڕێزبگرین لە هەرشتێك کە ڕێکخراوەکە بیخوازێت بۆمان".

زۆرترینی ئەوانەی کە بەتاسە بوون تا لەو کۆرسانە بەشداربن‌و ئاشنابن بەپەکەکە پێشتر لە ئۆرگانەکانی حزبەکەدا لەئەوروپا کاریان کردبوو. وەلێ کە دەهاتنە کۆرسەکانەوەو ڕەوشە جددی‌و پڕ لە جەدەلەکەیان دەبینی، ئیدی توشی سەرسوڕمان دەبوون. ئەوانەی بەشداردەبوون، پێش ئەوەی بچنە کایەی ڕاهێنانەوە، ئیدی لەسەر ئەوە ڕێکیان دەخستن کە هەموو پێوەندییەك لەگەڵ خانەوادەو هاوڕێکانیان تا تەواو بوونی ماوەی ڕاهێنانەکە بپچڕێن. ئەوە شتێك بوو تا زەمینە سازیی زیاتر بۆ ئەو ئەندامانە بکات‌و بەتەواوی ببنە بەشێك لەپەکەکە.

ئۆرهان لەم بارەیەوە دەیگوت: "ئەمە لەژیانی ڕابردووی دادەبڕانیت". هەروەها ئاماژەی دا بەوە: "لەبەرئەوە کە تۆ لەدەستپێکردنی ژیانێکی نوێدابوویت، ئیدی لەو وانانەدا فێر دەکرایت چۆن ئاشنابیت بە دەستپێکی قۆناغێکی نوێ‌و ژیانێکی نوێ".

لەڕاستیدا شتێکی نامۆ نەبوو گەر کەسێك یان دووان لەبەشداربووانی کۆرسەکە تا پێش تەواو بوونی بەرنامەکە دەربکرانایە.

ئۆرهان دەیگوت: "ئەوانەی کە دەردەکران یان گوێڕایەڵی یاساو ڕێساکانی کۆرسەکە نەدەبوون یاخۆ سەختبوو بۆیان شان بەشانی کۆرسەکە بەر بەرن". هەروەها دەیگوت: " پێش ئەوەی دەربکرێن، ئەوە ڕوون دەکرایەوە کە ئەوان کوردگەلێکی خراپبوون‌و دارا مافی ئاگایی‌و ویژدان نین. لەبەر ئەوە ئیتر تێدەگەیشتی کە ئاسان نەبوو دەستبەرداری کۆرسەکە بیت یاخۆ گەر هەر سوور بوونایە لەسەر دەستهەڵگرتن لە کۆرسەکە، ئەوا دەبوو ملبدەن بۆ سوکایەتی‌و شەرمەندە بوونێکی لەم جۆرە".

لەگەڵ تەواو بوونی پرۆگرامەکەیشدا، پەکەکە بڕیاریی دەدا کێ لەوان بچێتەوە کوردستان‌و خۆی یەکلاکاتەوە بۆ جەنگی گەریلاییی‌و کێیش لە ئەوروپا بمێنێتەوە تا لە بواری دیپلۆماسییەتی پەکەکەو هەنگاوەکانی ئایندەی ڕێکخراوەکەدا هەڵسوڕێت.

زۆرینەیان بەتەوسەوە بوون تا لەنێزیکەوە جەنگەکان ببینن‌و ئامادەبن. ئۆرهان کە زمانی ئینگلیزیی‌و فەرەنسی ڕەوان بوو، نێردرایە یەکێ لەنێوەندە زانیارییەکانی پەکەکە لە فەرەنسا. ناوبراو کەمێك ڕەشبین‌و ڕاڕابوو لەهەمبەر ئەم بڕیارە. لەبەرئەوە دەیگوت " ئامەزرۆبووم تا بڕۆمەوە کوردستان‌و بەشداربم لە جەنگەکاندا، وەلێ دەبوو ملبدەین بۆ هەربڕیارێك کە پەکەکە دەیدا بەسەرماندا".

تۆڕەکانی پەکەکە لە دەستپێکی هەشتاکانەوە لەنێو ئەوروپادا دەستیان بە گەشەو نما کردبوو، هەر لەوکاتەوە ئەندامانی پەکەکە کە بەپەنجەی دەست دەژمێردران، خۆیان بەبەختەوەردەزانی و گەشبین بوون تا هەزاران دۆلار چنگبخەن یاخۆ چەند سەد کەسێك بەدەستبهێنن بۆ گرکردنەوەی کۆمەك‌و دەستگرۆیی بۆ تەڤگەرەکە. تەنها دەساڵێك پاش ئەوە، ئیدی پەکەکە چالاکیی لەچوارچێوەی تۆڕێکی چڕو پڕیی نێوەندە ڕۆشنبیرییەکان‌و نوسینگە سیاسییەکاندا دەکردو چەندین پرۆژەی چاپو بڵاوکردنەوەیان هێنایە بەرهەم. هەموو ئەو چالاکییانەیش لە نێزیکەی شەش لە وڵاتانی ئەوروپادا برەویان پێدرا. چالاکییەکان بەجۆرێك بوون کە پەکەکە ساڵانە دەیتوانی ٣٠ ملیۆن دۆلار لە ئەوروپادا پاشەکەوت بکات. هاوکات پەکەکە لە ڤیستیڤاڵەکانیدا کە سەرنجی دەیان هەزارکەسی کێش دەکرد، دەیتوانی ٢٠ ملیۆن دۆلار بەدەستبهێنێت.

بۆنموونە لە ئابوونەو ئیشتراکی گۆڤارەکانیدا کە هاوسۆزان‌و سەرخەرانی پەکەکە وەك پیشاندانی پشتیوانییان بۆ پەکەکە پارەیان دەدا، یاخۆ لە ڤیستیڤاڵە مۆسیقییەکان‌و لە قاوەخانەکانداو لەو چالاکییە وەرزشییانەی کە بۆ هەوادارو کوردانی ئەوێ ڕێکی دەخستن سەرچاوەیەکی گونجاو بۆ کۆڵەکەی ئابووری پەکەکە

بەدەستهاتبوو[٢٨٢]. ئاکیف حەسەن دەیوت: "ئامانجمان ئەوەبوو خەڵکەکەی ئەوێ رێك بخەینو وابەستەیان کەین بە پەکەکەوە بۆ خەبات". ناوبراو وتەبێژی پێشووی پەکەکە بوو، زیاتر ئامانجەکانی پەکەکەی روونکردەوەو دەیوت: "ئەمە مانای وابوو، هەموو شتێك بۆ بەدەستهێنانی خەڵکە نوێیەکە بوو لەپێناو جەنگەکاندا، هاوکات گرتنەوەی ئەو خەڵکەیش بوو کە لەدەرێی کاروانەکەنو لەدەرەوەی جەنگەکانن".

کارکردن بۆ پەکەکە هەمیشە ئاسانو بێ ئاستەم نەبوو، ئەوە فەرمانێکی بێ چەندو چوون بوو. چوون شەڕی گەریلایی پەکەکە دژ بە سوپای تورکیە، بەتەواوی لەنێو کوردانی گەنجی پەراگەندەی ئەوروپا دا روانگەیەکی سەرکەوتووانەو پشتیوانییەکی مەزنی بەدەستهێنابوو. وەلێ سانا نەبوو بۆ ئەو کوردانە ئاوێتەی کاری پەکەکە بن، هاوکات دۆزینەوەی کارو ئەرك بۆیان سەختترو ئەستەمتربوو. وەلێ ئەو کوردانەی کە دەهاتنە مەیدانەکەو ژیانی خۆیان لەو مەیدانەدا دەکردە قوربانی، ئەوە بەچاوێکی ئێجگار رێزو رەونەقەوە تەماشادەکران. ئیدی هەموو ئەوانە ببوونە دەمڕاستی پەکەکە لە ئەورووپاو کاریان دەکرد بۆ برەودان بە پەکەکە لەو کیشوەرانەدا.

گروپە کوردییەکانی تر، کەمێك زیاتر لە نوسینگەکانی تەنها کەسێکیان ئەنجامدەدا کە کاریان وەشانکردنی کتێبو رۆژنامەگەرییەکی چڕوپڕ بوو. وەلێ بەپێچەوانەوە پەکەکە لەلایەن کەناڵێکی ئاسمانی(ساڵی ١٩٩٥ لەژێر نێوی مێد تیڤی دەستی بەپەخشکرد)و رۆژنامەیەکی بەربلاوی جەماوەرییەوە بانگەشەی بۆدەکراو هاوکات هەر لەوێ پەیمانگایەکی ئەکادیمیی کاری دەکرد بۆ گرتنی کۆنفرانسگەلێك لەسەر دۆزی کورد.

جیالەوانەیش یانەو کۆمەڵەو رێکخراوگەلێك لە ئەورووپادا هەبوون کە ببونە سەکۆی کۆکردنەوەی رۆژنامەنوسانو پیاوانی کار پێکەوە، هەروەها هەریەك لە ژنانو قوتابیان شوێنو بنکەی تایبەت بۆخۆیان بۆ دانرابوو. بەمجۆرە کوردەکان بەبێ پێوەندیکردن بەپەکەکەوە دەیانتوانی بەشداربن لەکارو چالاکییەکاندا. بەمشێوەیە ئەو ئۆرگانو

[282] See Birand, Apo ve PKK, 130–133.

ناوەندانە یارمەتی دەرێك بوون تا خەڵكی زیاتر پێوەستبکەن بە تەڤگەری پەکەکەوە کاریگەرییەکانی پەکەکە لەنێو کوردانی ئەورووپادا هێند هەڵکشابوو، کە بەگوێرەی خەملاندنێك ٪۹۰ی تەواوی ئەو کوردانەی کە لە ئەڵمانیادا بوون هاوسۆزو هاوبۆچوونی پەکەکە بوون. دیارە کە نیوەی کوردانی کیشوەری ئەورووپایش لە ئەڵمانیادا نیشتەجی ببوون[283].

ئۆرفان دەیگوت: "وەختێك لەنێو پەکەکە دایت، ئەوان رێزت دەگرن، وا تەماشای تۆدەکەن کە کەسێکی ئامادەی بچیتەوە کوردستانو شەڕبکەیت لەپێناو پەکەکەدا". هەروەها دەیگوت: "ئەوە پیشەو کار بوو، زۆربەی ئەو کوردانە پێش ئەوەی پێوەندی بکەن بە پەکەکەوە دارای هیچ شتێك نەبوون، هەروەها گەر پەکەکە بوویتایە، ئەوانی تر لێت دەترسان، چونکە دەیانزانی پەکەکە لەهەر مەترسییەك دەتپارێزێت، هەموو ئەوانە شکۆمەندانە دەژیان لە ئەورووپا. بۆنموونە وەختێ دەچوونە رێستورانتە کوردییەکانەوە فرە رێزیان لێدەگیراو بەشکۆبوون".

ئەرکی سەرشانی ئەندامانی پەکەکە لە ئەورووپادا سەخت بوو، ئەوان بە دەقەو سەعات چاوەڕوان دەکرا ئەرکییان بەسەردا بدرێت. دروست وەك گەریلاکانی شاخ، بۆ ئەوانیش پێویستبوو لە هەموو جۆرە پێوەندییەکی سێکسی خۆیان بەدوور بگرن. بەرپرسانی پەکەکە لە ئەورووپادا دارای شوقەو یەکەی نیشتەجێبوونی تایبەت بەخۆیان نەبوون. موچەی مانگانەشیان لەنێوان ۱۵۰ بۆ ۳۰۰ دۆلار بوو. ئەوەیش تەنها بەشی قاوەو جگەرەکەی نەدەکردن. هەربۆیە لەتاو بێ پارەییدا دەبوو شەوانیان لەنێو خانەوادەی کوردە هاوسۆزەکانی پەکەکەدا بەسەربەرن.

ئۆرهان دەیوت: "دەبوو لەو خانەوادانەدا کە شەوان دەمایتەوە متمانەت لەلایان دروست کردایە، قەدەغەبوو گێچەڵ بە کچوکاڵیان بگێڕیتو بێزاریان بکەیت". هەروەها

[283] Attacks cited in Dagli, Birakuji, 44–45.

دەیوت: "گەر مۆراڵو بەهات نەبووایە، ئەوا خێزانەکان ڕێگەیان بە کچانیان نەدەدا بەشداریی بکەن لە تەڤگەرەکەدا".

پەکەکە پشتیوانانی خۆیان لە ئەوروپادا بەچەند ڕێگەیەکی جیاواز پۆلێنکردبوو. هەمیشە ژمارەیەك لەو ئەندامانە کە بۆ خەباتی چەکداریی دەستیان دەدا جودادەکرانەوە، ئەوانە فرە بەبایەخبوون بۆ پەکەکە. هاوکات بەشێکیشیان ئەوانەبوون کە خەڵکیان هاندەداو خۆپیشاندانەکانیان سازدەدا. لەگەڵ ئەوانەی هەرکات داوایان لێبکرایە ئامادەبوونماڵو پارەکانیان ببەخشنە تەڤگەرەکە. وەلێ پاراستنو مانەوەی ئەم شێوە پشتیوانییەی کوردانی هەندەران بۆ تەڤگەرەکە کاریی بەردەوامو تاقەتپڕوکێنی گەرەك بوو. هەسەن سەبارەت بەم پۆلێنکارییەی جەماوەری پەکەکە بەم شێوەیە کۆمێنتی خۆی دەوت:"

پێویست بوو خەڵکی ڕازیبکەیت، دیارە کە ئەوەیش گەلێ دژوارە. جارێکیان شانۆگەرییەکمان کرد دەربارەی گەریلایەك کە لە شەڕێکدا بریندارکرابوو. ئەو دەڕوا بۆ خێوەتێك بەهیوای ئەوەی فریای چارەسەریی دکتۆر بکەوێت، وەلێ ئیدی کات درەنگە بۆ ئەو، هەر بۆیە فریا ناکەوێتو دەمرێت، بەڵام پێش ئەوەی بمرێت، دەڵێ: بەزارۆکانم بڵێن، داوای لێبووردن دەکەم، چوون پێش ئەوەی بمرم نەمتوانی بیانبینمەوە. پەیامەکە ئەوە بوو کە ئەو مرد، لەبەرئەوە کە گەریلاکان بڕی پێویست فیشەکیان نەبوو(بەهۆی نەبوونی پارەوە)، ئیدی خەڵکەکە بەدیار شانۆگەرییەکەوە دەگریان".

هەروەها چالاکوانەکانی پەکەکە لەهەموو خێزانێکی کورد نێزیك دەبوونەوەو دەبوو مانگانە بڕێکی کەمیش بێت ببەخشن، هاوکات ئیشتراکی گۆڤارەکەیانو چەند چالاکییەکی تر دەبوونە هۆی ئەوەی کە چالاکوانەکان وا لەو خەڵکە بکەن ساڵانە ببنە هۆی بەخشینێکی زۆر. هەروەها هەڕەشەو تۆپزیش لەپێناو بەخشیندا بەکاردەهێنرا، وەلێ زۆرجار جدیبوونی پەکەکە لە جەنگە گەریلاییەکەداو توندبوونی لەدژایەتی ئەرتەشی تورکدا، ئیدی ئەوە بەستبوو تا خەڵکەکە دڵنیابکاتەوە لەوەی کە بەخشین پێویستە.

له ئەڵمانیا زۆربەی کرێکارەکان موچەیەکیان بەنێوی موچەی سیازەهەمین مانگ وەردەگرت. چالاکوانەکان ئەو موچەیان لە کرێکارەکان بەنێوی پێویستی بۆ جەنگە گەریلاییەکەیان لێدەستاندن.

بەرپرسێکی پەکەکە لە ئەوروپا بەمجۆرە رەوشەکە باس دەکات: "دەمانوت ئێوە ١٢ مانگەی خوا بۆ خۆتان کاردەکەن، چی دەبێت گەر مانگێکیش بیر لە خەباتە گەریلاییەکە بکەنەوە". زیاتر لەو بارەیەوە دەیوت: "ئێوە هەوڵدەدەن بۆ ئەوەی زەمینە سازی بکەن کە ئەوە جۆرێکە لە رەوشەکە". ئەمەیش بۆ ئەوەبوو تا بیسەلمێنن بۆ ئەوانەی کە کاریان نەکردووە، رێگەی تر لەپێشیاندا بوونی هەیە. هەروەها زیاتر هۆکارەکەی روونده‌کردەوە بەوەی:"هەندێکجار پارەیش بە تۆپزی کرابوو".

پەکەکە دارای سیستەمێکی دارایی ئاڵۆز بوو کە پێگیریی لەسەر ئەوە دەکرد پارەو پوڵ لە کوێوە دێتو چۆنیش بەکاردەهێنرێت، بەڵام ئەوە وانازانرێ کە بۆ زەمەنێکی دوورو درێژ بووبێت. هەسەن دەیگووت: "پەکەکە روانگەیەکی ئابووری دروستی نەبوو، هەروەها دارای پلانێکی ئابووریش نەبوو". بەمشێوەیە پلانی ئابووری پەکەکەی پێناسە دەکرد: "پارە هاتو پارە چوو".

لەراستیدا پەکەکە هەموو ئەو پارانە بەشێکیی دەدایە تێچوونەکانی خۆی لەئەوروپاداو بەشێکیشیان دەناردەوە بۆ ئۆجەلان لە دیمەشق. دیارە گەر پارەو پوڵەکە کەمی بهێنایە ئەوا بەسانایی داوای زیاتریان دەکرد.

ئەندامانی پەکەکە هەوڵیاندا تا پرۆژەگەلێکی بچووکی سەرمایەداریی بخەنەگەڕ وەك دوکانی سەوزەومیوە فرۆشیو دوکانی درومان، وەلێ ئەم پرۆژە بچوکانە فرە بەکەمی سەرکەوتووبوون لەوەدا کە ئاتاجی پەکەکە زامنبکەن.

چالاکوانێکی پەکەکە کە سەروکلاوی لەگەڵ پرۆسەکەدا هەبوو دەیوت: "خاوەنەکانی پرۆژە بچووکەکان هەموو قازانجەکەیان دەدایە ئێمە، لەراستیدا ئەوان دوچاری شکست بوون".

سەرچاوەیەکی تری سەرمایەگوزاریی پەکەکە بریتی بوو لە دانانی باج لەسەر بازرگانو خاوەن کارە کوردەکانو هەندێکجاریش باجیان لە بزنسمانە تورکەکان دەسەند. بزنسمانە نەتەواگەراکانی کورد داوایان لێکرابوو کە رێگەنەدەن لاوازیی‌و نەداریی مادی کاربکاتە سەر چالاکییەکانی پەکەکە. لەراستیدا زیانو لەدەستدانی قازانج لە تەواوی پرۆژەکاندا کاری کردبووە سەر پەکەکە، ئەوان نەیاندەتوانی یاساکان بۆ پەیگیریی لە زیانو قازانجی پرۆژەکان جێبەجێبکەن، چونکە ئەوان ئەندامی پەکەکە نەبوون، زۆربەشیان تلابوون لە بازرگانی مادەی هۆشبەرەوە، دیارە کە ئەو نەزمی بازرگانییە بۆ تەڤگەرەکە فرە مایەی سەرئێشە نەبوو. زۆرجار بەپرسانی حکومەتی تورکیا گلەییان لە ولاتانی ئەوروپا دەکرد، چونکە ئەوان لەبەرامبەر پەکەکەداو لەبەرامبەر تۆرێك لە چالاکیی داراییو سیاسییو رۆشنبیریی پەکەکەدا نەرمییان نواندبوو.

بەدڵنیاییەوە وەختێك کە چالاکیگەلێك خۆیان ببیننەوە لە قاچاخی مادەی هۆشبەرو بەزۆرو زەبر پارە کێشانەوە لەمو لەو و کوشتنی رکابەرەکان. پۆلیس دەیتوانی کۆڵینەوە بکاتو وەك گروپێك بەتەواوی قەدەغەیان بکات، وەلێ پەکەکە وەك بەرەیەکی سیاسیی لەئەوروپادا کارو چالاکی نومایان کردبوو، لەبەر ئەوە ئاسان نەبوو قەدەغە بکرێن. هاوکات زۆربەی ولاتانی ئەوروپی هاوسۆزو هاوڕابوون لەگەڵ گێچەڵی کوردیی دژ بەتورکیا، بەتایبەت وەختێ کە پەکەکە کاریدەکرد تا دۆزی خراپ بەکارهێنانی مافەکانی مرۆڤ لە تورکیادا بزرێنێت. وەلێ چالاکوانانی پەکەکە هاوسۆزی زیاتر لە ولاتانی ئەوروپا چاوەڕێبوون، چونکە پەکەکە دەیەویست ولاتە ئەوروپییەکان رێو شوێنی روونو رەوان لەهەمبەر ئەو پرسە بگرنە بەر.

لەتورکیادا، کوردانی ئاوابییەکان لە ماڵەکانیاندا، بەردەوام لەژێر فشارو زەبری سەربازەکاندا بوون. هاوکات سیاسییەکانی کورد بەردەوام سوکایەتییان پێدەکراو رووبەڕووی هەڕەشەو گوڕەشە دەبوونەوە. سەرەڕای ئەوەیش ئاگربەستەکەی ساڵی ١٩٩٣ی ئۆجەلان هەروا لەلایەن ئەرتەشو هێزە ئاسایشییەکانی تورکەوە پایماڵکرابوو.

لەبواری مافی مرۆڤیشدا، کرێکاران‌و رۆژنامەنوسان بەردەوام رووبەڕووی کوشتن‌و رفاندن دەبوونەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا وادیاربوو ئەوروپا هاوسۆزێکی بەهێزی تورکیا بێت. هەرچەند کە تاو تاو هۆشیاریی دەدرایە تورکیا سەبارەت بەسەرپێچییەکان‌و وا چەوەڕوانیش دەکرا کە ئەو ئاگادارکردنەوانە زیاتر بونایە. بەڵام تا ئەو کات ئەوروپا تەنێ چاودێریی رەوشەکەی دەکردو تەنانەت هەندێکجاریش پشتیوانییان بۆ تورکیا دەردەبڕی. هەسەن لەم بارەیەوە دەیوت:"بۆنموونە وەختێك پەکەکە چالاکیی ئاشتی لە ئەوروپا گرتە بەر، وەك مانگرتن لەخواردن و ڕێ‌و شوێنەکانی تری ئاشتیی، کەچی هیچ کام لە وڵاتە ئەوروپییەکان ئەو چالاکییانەیان بەهەند وەرنەگرت.

دیدارگەلێك لەتەك پەرلەمانتارانی ئەوروپادا هاتبووە گۆڕێ، وەلێ هەموو ئەو دیدارانە هیچی لێ سەوز نەببوو". ئەو زیاتر روونکردنەوەی داو وتی: "ئێمە پەیامێکمان لەو بارەیەوە خستەڕوو، وەلێ هیچ کات وەڵامێکی جددییمان وەرنەگرتەوە، دیارە کە ئەمەیش نائومێدییەکی دیاریکراو و رەشبینییەك دروستدەکات‌و ئیتر تۆ پێویستە بۆ بەرگرتن لەو نائومێدییە شتێك بکەیت".

لە ٢٤ی مانگی شەشی ١٩٩٣ دا، چالاکوانەکانی پەکەکە لە فەڕەنساو سویدو ئەڵمانیا، دەستیان دایە پەلاماردانێکی هەماهەنگ‌و بەرنامە بۆدارێژراو بۆ سەر کۆمپانیا تورکییەکان. ئەوەبوو لە ١٢ شاری ئەو وڵاتانەدا نارەزاییان پیشانداو هاوکات هەڵیان کوتایە سەر سێ لە کونسوڵخانەکانی تورکیا[٢٨٤]. لە مانگی یازدەی هەمانساڵیشدا دووبارە شەپۆلێکی نوێی تورەیی پشتیوانانی پەکەکە لە ئەڵمانیادا بەرۆکی کۆمپانیاکانی تورکیای گرتەوەو لەئاکامدا پیاوێك هاتە کوشتن. دوواجارو هەر لە هەمان مانگدا، وەزیری نێوخۆی ئەڵمانیا بەوە وەڵامی خۆپیشاندانەکانی دایەوە کە پەکەکەو ٣٥ ڕێکخراوی دیکەی پەیوەست بەپەکەکە لە وڵاتەکەیدا یاساغ دەکات. فەڕەنسایش کەوتە دووی نارەزاییەکان، وەلێ قەدەغەکارییەکانی ئەو وڵاتە کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نەبوو.

---

[284] Quoted in Yeni Gundem, 27 Sept.–3 Oct. 1987, 14.

چالاکوانێکی پێشووی پەکەکە بەمجۆرە ئەم تێبینییەی خستەڕوو: "لە وڵاتانی دێموکراسیدا، هێندە ئاسان نییە ئەم جۆرە شتانە یاساغبکرێن". هەروەها دەیوت: "تەنێ ناوەکان بگۆڕە، ئیدی مشکلێك نامێنێت، بۆ نموونە یانەی مافەکانی گەل گۆڕا بۆ یانەی مافەکانی مرۆڤ، هەروەها ڕۆژنامەی پۆلیتیکا ئۆزغور گۆڕا بۆ ڕۆژنامەی یەنی ئۆز غور پۆلیتیکا".

پەکەکە هیچ حسابێکی بۆ چۆنییەتی کاریگەرییەکانی ئەو قەدەغەکارییە نەکردبوو لەسەر پێوەندییەکانیان لەتەك پەرلەمانتارانی ئەورووپاو سیاسییە نەتەوەییەکانی ئەوێ. چوون ئیدی هەندێ لە کارە دیپلۆماسیی‌و پێوەندییەکانی پەکەکە لە ئەورووپادا ئەرزشی بۆ نەمایەوە، ئەویش بەهۆی مەترسی تێوەگلانیان لەگەڵ گرووپێکی یاساغ‌و نافەرمیدا.

تەنانەت لەئێستایشدا بەنێوی بەرەیەکی ڕێکخراویی نوێوە کاردەکەن، وەلێ هەموو ئەو ڕۆژنامەنوسە ئەورووپیانەی کە پێشتر مامەڵەیان لەگەڵ پەکەکەدا وەك دەنگێکی شەرعیی کوردان بوو، وەلێ ئێستە بەدوواوە ئیتر خۆیان بەدووردەگرن لە لەکەی تێرۆرو توندوتیژییەکانی ئەو تەڤگەرە.

حەسەن لەم بارەیەوە دەیگوت: "خەڵکەکە لەتەك ئێمەدا دیدارو بەدەمەوەچوونیان ڕاگرت، دەوترا کە ئەوان لەتەك تێرۆریستاندا کۆنابنەوە". هەروەها دەیوت: "لەسەر ئاستی پراکتیکدا، ئێمە هەر مژوڵی چالاکیی بووین، وەلێ چالاکییەکانمان سنوور داربوون. ئێمە بەردەوام پشتیوانییەکی هەمەلایەنەمان هەبوو، وەلێ بە جیددی کار نەدەکرا تا لۆبییەکی کاریگەر چێبکەن، تەنانەت خەڵکانێك هەر ئامادە نەبوون بێنە نێو ڤیستیڤاڵەکانمانەوە".

## ژیان لە دەرێی وڵاتدا

قوتاربوونی نوێنەرانی DEP بۆ ئەورووپا، پاش ئەوەی کە پارتەکەیان لەلایەن دادگای باڵای تورکیاوە داخرا، ببوویە نمای پروپاگەندەیەکی بەپیت‌و فەڕ بۆ پەکەکە. حەسەن وتەبێژی تەڤگەرەکە لە ئەورووپا دەیوت: "بەگەیشتنی ئەو نوێنەرانە، ئیدی تینی گەلێ لە

چالاکییە دیپلۆماسییەکان بوژایەوە، دیارە کە ئەوە هەڵەیەکی تورکیابوو کە ئەو پارتە سیاسییە کوردییەی لە تورکیا یاساغکرد".

زۆرێك لە بەرپرسەکانیDEP لە تورکیادا مکوڕ بوونو خەباتی بەردەوامیان دەکرد تا لەژێر نیرو نەریتی رامیاریی پەکەکە بێنە دەرێو سەربەخۆ بن، بەلأم ئێستەکانێ کە هاتوونەتە ئەوروپا، ئیتر وادیارنییە هێند بۆیان گرنگبێت گەر پەکەکە بیهەوێت بیانخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە یان نا. ئەوەیش بۆ وان ئاسان نەبوو کە وەك تورکیا بیانەوێت سەربەخۆبن، چون ئەوان کە گەیشتبوونە ئەوروپا، بەپارەیەکی کەمو بە پێوەندییەکی لاوازو بە کەنەفتییەك لە شارەزایی زمانە بیانییەکانەوە هاتبوون. لەهەمانکاتدا پەکەکە کۆنترۆڵی تەواوی کۆمەڵگەی کوردیی کردبوو لە ئەوروپا، لەهەموو شوێنێك نوسینگەو بنکەی هەبوو، پەکەکە دارای پارەو پوڵو هێزێکی مادیی باش بوو. تەنانەت گەر یەکێکیش بیویستایە لەتەك نوێنەرە هەڵهاتووەکان پەیوەندیی بکات، ئەوان هیچ کۆمەکو پشتیوانییەکیان نەبوو بۆی، ئیدی بەم نەزمە ئەوان تەنها هەڵبژاردەی بەردەمیان ئەوە بوو، کە شانبەشانی پەکەکە برەو بە کارو چالاکییەکانیان بدەن لە هەندەراندا.

نەجدەت بولدان، سەرۆکی شارەوانی پێشووی یوکسی کوفا کە سەر بە DEP بوو. ئەو پاش ئەوەی براکەی بە ساڤاس بولدان وەك دەستگرۆکەرو پشتیوانێکی دارایی پەکەکە تۆمەتبار کرابوو، ئیدی لە ئەستەمبوڵدا رفێنراو بە کوژراوی دۆزییانەوە. لەکاردانەوەی ئەوەدا نەجدەت هەڵهات بۆ ئەوروپا. ناوبراو تەمەنی ٤٤ ساڵ بوو. هەربۆیە لەئەوروپا دا تەنێ کەڵکەڵەی ئەوە لەسەریدا بوو چلۆن تۆڵەی کوژرانی برا گەنجەکەی بسێنێتەوە. بۆ ئەو گرنگ نەبوو کە پێوەندیی لەتەك پەکەکەدا چێبکات. بەلأم پەکەکەی وەك گروپێك دەبینیی کە تەنها ئەوان دەتوانن یاریدەدەربن بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکەی کە خۆی لە تۆڵەی براکەیدا دەبینییەوە. بولدان دەیوت: "دەوڵەت باشترینی لە خێزانەکەمدا گرتو کوشتی". ناوبراو لە سێپتەمبەری ١٩٩٤دا لەتورکیاوە هەڵهاتبوو. ئەو لەسەرەتاوە بە خۆحەشاردانی لەنێو سندوقی پاسێکدا خۆی گەیاندەبووە بولغاریا.

بولدان دەیگوت: "نەمدەتوانی هەڵبێم (پرسیارەکە ئەوەبوو) چلۆن دەوڵەت بخەمە رەوشێکەوە کە پێی نیگەران بێت. دەبوو شتێکم بکردایەو رۆڵم هەبووایە لە دۆزی نەتەوەکەمدا، ئایا دەمتوانی رۆڵم چیبێت؟".

بەرپرسانی DEP پێشنیازگەلێکی نوێ کەوتبوویە مەژگیانەوە. دواجار لەسەر دامەزراندنی پەرلەمانێك لە مەنفادا یەکیانگرت. چوون ئەوە ئاماژەیەکی بەگوڕ بوو بۆ کاردانەوەی رێگرییەکانی تورکیا لەوەدا، کە بواری بە پەرلەمانتارانی کورد نەدەدا تا لەنێو پەرلەمانی تورکیادا مژوڵی سیاسەت بن[285]. هەربۆیە لە نیسانی ١٩٩٥ داو لە شاری لاهایدا یەکەمین پەرلەمانی کورد لە هەندەرانداو لە چوارچێوەی ئاهەنگێکدا دەستی بەکارەکانی کرد. پەرلەمانەکە پێکهاتبوو لە ٦٥ ئەندام کە بەشێوەیەکی گشتی لەرێکخراوەکانی پەیوەست بەپەکەکەو لە بەرەی سیاسیی ERNK ی سەر بەپەکەکەوە هاتبوون. هاوکات هەشت لەبەرپرسانی DEP بوونە ئەندام کە لەناو ئەوانیشدا پێنجیان ئەندام پەرلەمانی پێشووی تورکیا بوون. ئەوەیش نومایانی هەیمەنەی پەکەکەو شەرعییەتدان بەپەکەکە بوو کە پێشتر بەو شێوەیە دان بەو راستییەدا نەنرابوو.

ئەم هەوڵەی کوردان لەدەرێ رەوشەکەی خرابترکرد، چوون تورکیا پێداگر بوو لەسەر ئەوەی کە کێشەی کورد تەنها کێشەی تێرۆرەو ئەوان لەهەوڵی ئەوەدان بەرێگەو رێبازی جیاو توندتر بێنە پێشێ‌و تەنانەت ئەم نەزمی کارکردنەیان وەختە بخزێتە نێو نێزیکترین لە هاوپەیمانەکانییانەوە. دیارە بڕیاری تورکیا بۆ قەدەغەکردنی DEP بووە هۆی دادگایی کردنیی هەشت لەو ئەندام پەرلەمانانەی کە تا ئەو کات لە تورکیا دەرباز نەببوون. ئەو هەشت پەرلەمانتارە لە دێسەمپەری ١٩٩٤ دا، هەریەکەیان ١٥ ساڵ زیندانییان بەسەردا سەپێنرابوو. بڕیارێکی وەهایش زۆرێك لە وڵاتانی ئەورووپی توشی شۆك کردبوو. هاوکات هەوڵێکی لەوجۆرە بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایش شتێکی

---

[285] Birand, Apo ve PKK, 197.

سادەو ئاسایی نەبوو. ئەڵمانیا بەزوویی هاریکارییە سەربازییەکانی بۆ تورکیا هەڵپەسارد، ئەوەیش پاش ئەوە هات کە پارتە سیاسییەکە لە تورکیادا قەدەغەکرا. هاوکات یەکێتی ئەوروپا واژۆکردنی یەکێتی گومرگی لەتەك توکیا دوواخست. هەندێك لە ئەندامانی کۆنگرێسی ئەمریکایش کەوتنە کۆڵینەوەی ورد لە سەر نەزمی فرۆشتنی چەكو چۆڵ بەتورکیاو لەنێزیکەوە باری سەرنجیان دایە خواروخێچییەکانی مافی مرۆڤ لەتورکیا. هەروەها ئەنکەرە داوای کرد بەزوویی پەرلەمان هەڵوەشێتەوە، چوون پێی وابوو هەوڵەکانی تا ئەوکات هیچ نەبوو جگە لەوەی لەبەرەی پەکەکەدا هەڵسوڕاوەو تا ئەوکات هیچ هەنگاوێکی توندی لەهەمبەر تیرۆردا نەگرتووەتە بەر. ئەوە لەکاتێکیشدا بوو کە هەموو ئەوانەی لەپەرلەمان بوون کەسانی ناپەیوەست بە پەکەکە و ئەندامانی سەربەخۆو خەڵکانی بەناوبانگ بوون و تەنها پرۆژەشیان بۆ بەدەمەوەچوونی رەوشەکە پرۆژەیەکی ئاشتیانەو پشتبەستووبوو بەدانوستان. کەواتە لە بیریی ئەنکەرەدا پێویستبوو پەرلەمانێکی وەها هەڵبوەشێتەوە. دیارە سەرزەنشتی یەکێتی ئەوروپا بۆ رێوشوێنەکانی تورکیا لەکاتێکدا بوو کە بۆ هەوەڵجار پەرلەمانتارانی کورد لە لاهای کۆبیبوونەوە. هەربۆیە تورکیایش لەکاردانەوەی ئەوەدا لەرێگەی باڵوێزخانەکانییەوە نیگەرانی خۆی گەیاندە ئەوروپاو بڕیاریدا کڕینی چەكوچۆڵ لەو وڵاتانەدا هەڵپەسێرێت. دیارە کە هەوڵی سەرەکیی بۆ گرتنەبەری رێی ئاشتیی لەرێگەی دانوستانەوە، لەوەدا خۆی دەبینییەوە کە بەهیچ جۆرێك ناتوانێ ئامادەیی خۆی پیشانبدات بۆ بەهەند وەرگرتنی پرسی کوردو لەهیچ دانیشتنێکیشدا ئامادە نییە دەنگۆی میدیایی‌و بڵاوکراوەکان باس لە رەوشی پرۆسەی ئاشتەوایی بکەن. بوڵدان کە ئەندامێکی پەرلەمانی کورد بوو لە مەنفا، لەم بارەیەوە بە بزەیەکەوە دەیوت: "هەرکات کە لە وڵاتێکی دیکەدا گردەبووینەوە، ئەوا گرفتێك لەگەڵ تورکیادا رەچاودەکرا، دیارە ئەمەیش دووبارە دۆزی

کوردیی دەخستەوە سەرنەخشەی نێوچەکە. هەربۆیە سەرەڕای هەموو ئەو ناتوانابیەمان، هێشتا پەرلەمانی کورد لە مەنفادا سەرکەوتووترین هەوڵی کوردان بوو".

بەرپرسانیDEP لەوێ تامەزرۆی زەمینە سازییەك بوون تا سیاسەت بکەن، واشیان دەبینی پێکهاتەیەکی سیاسیی دروست لە ئەورووپادا دروست بووە. کە لەوێدا دەتوانن یاسا دابتاشن‌و پلان دابرێژن‌و هەروەها دارای دەسەلاتێکن تا راستەوخۆ وتوێژی سیاسیی لەهەمبەر دۆزەکەیان بکەن. هەربۆیە لەپاش زەمەنێکی دوورو درێژ ئەوان گەشبین بوون بە بونیادنانی پێکهاتەیەکی نەتەوەیی بەرێگەیەکی سەر ڕاست‌و واقیعیی. زیاتر لەوەیش لەمیانی ئەو ئەنجومەنەدا لە مەنفا هەماهەنگی‌و یەکبوونێك بۆ تێکرای پارچەکانی کوردستان دروست ببوو.

ئۆجەلان وەك هەمیشە لەهەموو شتێکدا قوڵدەبوویەوە. تەنانەت دەسپێکی کارەگرنگەکان لەروویدا وەك هەڕەشەیەك لێکدەدایەوە بۆ سەر رێبەرایەتییە تاکڕەوانەکەی. بوڵدان لەساڵی ١٩٩٥ دا لەسەردانێکیدا بۆ لای ئۆجەلان ئەم بایەخەی ئۆجەلانی بەمجۆرە خستە ڕوو: "ئەو وتی، تەنانەت گەر تەنها نوێنەرێکیش بم لەو پێکهاتە نەتەوەییەدا، ئەوا رازیدەبم پێی". هەروەها بوڵدان دەیوت: "بەدڵنیاییەوە، لەبواری پراکتیکیدا ئۆجەلان هیچ هەماهەنگییەکی لەگەڵ پارتەکانی تردا نەکرد. لەبەر ئەوە وابیردەکەمەوە کە ئۆجەلان پێی وابێت هەرگیز ناتوانین ئەنجومەنێکی نەتەوەیی دروست بکەین".

پەکەکە بەهۆی توانا ئابوورییەکەی‌و بەهۆی ئامادەبوونی زۆرترین ئەندامیی لەپەرلەمانەکەداو بەهۆی راکێشانی سەرنجی زۆرینەو هەیمەنەی بەسەر رایگشتی کۆمەڵگەی کوردیدا، وایلێهاتبوو کە پەرلەمانەکە ئەو چانسەی لەدەستدا نەبێت تا ئەو بەرنامەو بڕیارانەی کە سووربوو لەسەر داڕشتن‌و جێبەجێکردنیان وەك خۆی جێبەجێیان

بکات. لەراستیدا پەکەکە نەیهێڵا برەو بە نێوەرۆکی کاریی پەرلەمانەکە بدرێت، ئەگەرچی تەنها هێزی باڵادەستو سەرداریش بوو لەنێویدا. لەمبارەیەوە حەسەن بەرپرسو وتەبێژی پێشووی پەکەکە لەئەوروپا دەیوت: "پەکەکە پەرلەمانەکەی وەك تاکتیکێك دەبینیو وەك شتێك وابوو تا حکومەتی تورکیا نائارامو نیگەران بکات. ئەگینا پەکەکە بە هیچکات بە خەڵکیی کوردی نەدەگوت کە ئەمانە نوێنەرانی نەتەوەی کوردنو دەبوو ئەوان مشتومڕ لەبارەی دۆزی کوردەوە بکەن".

لە کۆتاییدا پەرلەمانەکە گەلێ سەرکەوتنی بەدەست هانی، بەڵام ئەوە سەختە گەر بوترێت خودی پەرلەمانەکە سەرکەوتوو بوو. چوون لەگەڵ ئەوەی پەکەکە نەزمێکی دیموکراسیی دابوو بە هەوڵەکانی، لەهەمان کاتدا بۆشاییەکی گەورە هەبوو لەنێوان ئەوەدا کە پەرلەمان چی ئەنجامداوە لەگەڵ ئەوەی رێگە بەچی دراوە بیکات. هاوشێوەی رۆژنامە کوردییەکان لە تورکیاو گەلێ لەپارتە سیاسییە کوردییەکان و پەخشیی ئاسمانی کوردیی لە ئەوروپا، ئەندام پەرلەمانەکانیش لەمەنفا دەستیان دایە بەڵێنو پلانو ئەجێنداگەلێکی دیاریکراو. بەڵام دوواجار ملنەدانی ئۆجەلان بۆ دەستبەرداربوونی هەرجۆرە دەسەڵاتێکیو هەوڵەکانی بۆ دەستبەسەراگرتنی دەسەڵاتەکان شتێك نەبوو لەلایەن بیرمەندانو سەربەخۆکانی کوردەوە بەئاسانی هەزمبکرێت.

حەسەن زۆر بە گرژییەوە دەیوت: "لەدەرێی پەکەکەدا شتێکی دیکە نەبوو". هەروەها دەیوت: "گەر پەکەکە نەبووایە پەرلەمان رووی لەکێ دەنا؟ بیناو باڵەخانەی بارەگاکان، تیکتی هاتوچۆو تەنانەت پێنوسەکانیش لەلایەن پەکەکەوە دابیندەکران. پەکەکە لەو جۆرە رێکخستنانەبوو کە هەموو شتێکی ئەنجامدەدا".

## باسی یەکەم:

## پوکانەوە (١٩٩٥ _ ١٩٩٨)

سەعید کوروك کایا، کە خوێندکارێکی کۆلێژی پزیشکی بوو، لە مانگی شەشی ١٩٩٥دا لەچیاکانی باکووری ئێراقدا ببووە گەریلاو بەشداری کۆبوونەوەکانی فەرماندە سەربازییەکانیی پەکەکەی دەکرد. مانەوە لەوێ هێند سانا نەبوو، بەردەوام هێزە ئەرتەشییەکانی تورکو چالاکییەکانی سوپا تیمەکەی ئەو کە ١٧ گەریلا بوون ناچار بە ئالوگۆڕێکی بەردەوامدەکرد لەشوێنەکانیان. بەکارهێنانی کۆگاکانی تفاقو ئازوقەو چەك لەو رەوشەدا ئەستەم بوو. لەگەڵ ئەوەیشدا دێهاتیگەلێکی کەم وەك هاوسۆزی گەریلاکان لەناوچەکەدا مابوونەوە. لەو سەروبەندەدا کوروك کایا خۆی گەیاندە شارۆچکەی سیرت، ئەو شارۆچەیە دروست لەنیمە ڕێی هێڵە سنوورییەکەدا بوو. ناوبراو هیچ هەڵبژاردنێکی لەبەردەمدا نەبوو جگە لەفرسەتی چوونە ناوەوەی نێوەندە شارییەکان تا تەدارەکاتی چالاکییەکانی لەوێندەر بکات.

کوروك کایادەیوت: "لە گەرشتەکە کەنارییەکانی شاردا گەیشتینە دوکانێك. خاوەنەکەی وەختێك سەرو بیچمی ئێمەی بینی توشی شۆك بوو. ئێمە پێمان گوت پارەو پوڵت دەدەینێ، بەڵام کۆڵەپشتیو جانتاکانما هەرچی دەگرن لە ئاردو شەکرو نوقڵو چوکلێت پڕیان بکەو هێندەمان بەرێ کە ١٧ پیاو بتوانن هەڵیبگرن".

هەر لەوکاتەداو چەند میلێکی کەمیی دوور لەوان، پێکدادانێك لەنێوان شۆڕشگێڕانو سەربازەکاندا قەوما.

کوروك کایادەیوت: "گوێم لەدوژمن بوو کە لەرێگەی بێ سیمەوە قسانیاندەکرد، دەمتوانی بەسانایی گوێبیستیان بم، دیاربوو چالاکییەکی سەربازی لەگۆڕێدا هەبوو. وەلێ بەتەواوی دڵنیانەبووم چالاکییەکە لە کوێدایە. ناچار ئێمە دوو شەوی رەبەق لە لێواری رووبارێکدا قەتیس ماین. وەختێ لە رووبارەکەدا پەڕینەوە، لەوێندەر داڵە کەرخۆرەمان

دەبینی، ئیدی زانیمان کە لەودەوروبەرەدا دەبێت تەرمگەلێك بەجێمابن. ئەوەبوو تەرمی سێ گەریلامان دییەوە لەتەك پیاوێك کە هێشتا گیانی تێدا مابوو. پیاوەکە لاقێکی شکابوو، دیاربوو کە ناسۆری لاقەکەی کرمی هەڵهێنابوو. پیاوەکە ماوەی دوو رۆژ بوو بەبێ ئاوو نان‌و هیچ شتێك بە بیماری کەوتبوو. گەرداڵە کەر خۆرەکانم نەدیبایە. هەرگیز ئەو تەرمانە پێیان نەدەزانرا".

تیمەکەی کوروك کایا گەریلا زامدارەکەیان هەڵگرت بۆ نێزیکترین گوند. ئەوان گەڕان بەدووی گوێدرێژێکدا، تابەهۆیەوە تەرمەکان بگوازنەوە، دواجار کۆڵیان نەدا تادانەیەکیان دۆزییەوە، بەڵام خاوەنی گوێدرێژەکە دەستبەرداری گوێدرێژەکەی نەدەبوو. چوونکە لەوەدەترسا سەربازەکان پێی بزانن‌و تۆمەتباری بکەن بەوەی کە بە کەرەکەی دەستگرۆیی گەریلاکانی کردووە.

بەڵام کوروك کایا توانی بابای خاوەن کەر بەمجۆرە رازی بکات: " گەر گوێدرێژەکەیان نەداتێ، ئەوا هەر لەوێ گەریلا زامدارەکەجێدەهێڵن. بەمەش سەربازەکان گەر بێن هەم ئەو هەم خاوەن کەریش لەنێودەبەن، بۆیە رازیمان کرد بەوەی کەرەکەمان بە ٥٠٠ مارك پێ بفرۆشێت‌و بەسەربازەکانیش بڵێت کەرەکەم ونبووە".

بەمجۆرە بریندارەکەیان لەسەر پشتی گوێدرێژەکەوە بەستەوەو خۆیان گەیاندە چیاکانی گابەرو بێسلەر. ئیدی لەوێ بریندارەکەیان لەلای یەکەیەکی تری گەریلاکان جێهێلا. تانکەکانی تورك لەوکاتەدا لە چیاکانی جودی وەستابوون. ئەوێ دووایین خاڵی سنووری بوو بۆ باکووری ئێراق، کەدروست کەمپی زابی پەکەکە هەڵکەوتوو بوو لەو نێوچەیەدا. رەوشی چیای جودی زۆر ناهەموارو سەخت بوو، لەوێ تەواوی ئاواییەکان چۆڵیان کردبوو. شۆڕشێڕەکان تەنها چانسیان لەوەدابوو کە لە ئاواییەجێهێڵراوەکاندا بگەڕێن بەدووی خۆراك‌و میوەو سەوزەی نێو باخچەو باخەکانی ئەوێدا. کورجوك کایا بەتەواوی لەو رەوشە شەکەت‌وماندوو ببوو، ئەو نێزیکەی دوومانگ بوو هەورازو نشێوەکانی ئەوێی تەی دەکرد تاخۆی بگەیەنێتە شوێنی مەبەست.

کورجوك کایادەیوت:" هەمووان بەدەست ئەو گرفتەوەدەماننالآند، لەویٚ نەخواردنی پێویست هەبوو، نە کۆگاکانمان بەشی دەکرد، چوون پێوەندیمان لەتەك خەڵکی ئاواییەکاندا لەدەستدابوو. بەپێچەوانەوە لەئاواییەکانەوە گوندپارێزەکان هێرشیاندەکردە سەرمان. ناوبراو سالآنی پێشوودەنگو رەنگی فرە خەمناکو نائومێد دیاربوو. ئەودەیوت:" نەمدەتوانی بیر لەچارەسەرییەك بکەمەوە، لەبەرئەوە وەلآمەکە لەگەڵ مندا "رۆکردن نەبوو. ئەو باوەڕی وەها بوو کە ئەم ئەزموونەی لەگەڵ ئۆجەلاندا گوزەراندووە.

ئۆجەلان هەمیشە خۆی بە نەزمی جەنگو سەربازییەوە هەڵدەکێشا، هەرچەند کە بۆخۆی فیشەکێکیشی نەتەقاندبوو، بەلآم هەمیشەجەنگی بەلاوە باشتر بوو تا فەرماندە گەلێکی سەربازیی ئەزموونداری کە پێیان باشبوو پەکەکە پێویستە بچێتەوە بە تاکتیکە سەربازییەکانیدا. ئۆجەلان هەموو ئەو پێشنیازانەی سەرکردە سەربازییەکانی پەکەکەی دایەدوواوە کە پەیوەستبوون بە ستراتیژیی نوێی پەکەکەوە لە مەیدانەکەدا، ئەو گوێی نەدەگرت بۆ هیچ کام لەو ناسۆریانەی کە باسدەکران. هەروەها ئامادەش نەبوو ملبدات بۆ بۆچوونی سەرکردەکان لەهەمبەر دژوارییەکانی بەرەکانی جەنگ. ئەو تەنانەت هەر ئاشنایەتییەکیشی لەو بارەیەوە دەدایەدوواوە. هەموو ئەمانە بەئاشکرا لە کۆنگرەی پێنجەمی پەکەکەدا نومایاندەبوون. کۆنگرەکە لە دەستپێکی سەری ساڵی ۱۹۹۵ دا سیٚ رۆژی خایاند. تەوسییەکانی ئۆجەلان لەکاتێکدا بوو کە هەموو نێردراوو نوێنەرەکانی کۆنگرەی بەوە ئاڕاستەکردبوو کە پابەندبن بەنەخشە رێگای کاری کۆنگرەوەو هیچ ئەرزشێك بۆدەنگۆکانی توانا سەربازییەکانی پەکەکە دانەنێن. بەڵکو ئۆجەلان داوای کرد تا خۆیان ئامادەبکەن بۆ راپەڕینێکی سەرتاسەریو هەوڵەکانیان چڕبکەنەوە بۆدەستگرتن بەسەر تەواوی باکووری کوردستاندا.

دیسان وەك کۆنگرەکانی پێشووتری پەکەکە چەند بەرپرسێکی پەکەکە تۆمەتبارکران بە سەرپێچی لەفەرمانەکانی ئۆجەلانو زیانگەیاندن بەجەنگە گەریلاییەکەی پەکەکە. یەکێك لەو فەرماندە سەربازییانە حوسەین تۆپیقدەر بوو، ئەوەی خۆیو گەریلاکانی لە

نێوچەی گارزان، بەتەواوی دوچاری دژوارییەکانی جەنگ ببوونەوەو ئەزموون و ماندوبونێکی فرەی لەپێناو پەکەکەدا بینیبوو.

هەموو ئەو ناوچانەی کە ئەو تێیدا چالاکی کردبوو، سەر بە هێڵەسنوورییەکەی شارەکانی موش و بەدلیس و سیرت و باتمان بوو. کە بەتەواوی لەژێر کۆنترۆڵی سەربازەکانی تورکدا بوون.

لەراستیدا هەڵەگەلێك لەو نێوچانەدا روویدابوو، هەربۆیە ئۆجەلان سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ئەو گەریلایانەی تێوەگلاون لەو هەڵانەدا، گەریلایەکی ترسنۆك و لاوازن و بەڕاست و دروستی نەیانتوانیوە فەرمانەکانی پەکەکە جێبەجێبکەن.

هەربۆیە ئۆجەلان لەو راپۆرتەیدا کە بۆ کۆنگرەی ٥ی پەکەکە ئامادەی کردبوو رایگەیاند: "هیچ شوێنێك بۆ خۆبەکەمزانی لە نەزمی سەربازیدا نییە". کۆنگرەکە لە کەمپی هەفتانینی پەکەکە لە باکووری ئێراقدا هاتبووە گرێدان. ئۆجەلان لەشوێنێکی تردا دەیووت: "دەوترێت بەهۆکاری نێوخۆیی و دەرەکییەوە ناتوانین بگەینە ئامانجەکانمان، یاخۆ رێگریمان لێدەکرێت لەوەی سەرکەوتن بەدەستبهێنن، دیارە کە هەموو ئەو بیانووانە لە فەرهەنگی پەکەکەدا تاوانن، چوون لە نەزمی سەربازیدا، میتۆدو بەرنامەی گونجاو لەپێناو سەرکەوتندایە. بۆخۆم لەپێناو سەرکەوتندا هەموو شتێکم ئەنجامداو سەرکەوتوویش بووم"[٢٨٦].

گەلێك لە سەرکردە سەربازییە مەیدانییەکانی پەکەکە لەو راستییە تێگەیشتبوون کە ئاڕاستەی سەربازیی ئۆجەلان هۆکاری بنچینەیی شکستەکانیانە. دیارە کە رێبەری پەکەکە ١٦ ساڵ بوو نێوخۆی تورکیای نەبینی بوو، هەربۆیە دەبوو کەمێك ئاگاداریی رەوشی نێوخۆو زەمینەی واقیعی تورکیا بووایە. بەتایبەتی کاتێك میریی فشاری دەخستە سەر ئاواییەکان تا زێدی خۆیانجێبهێڵن دەبوو هۆشی لەگۆڕانەکان بێت، کەچی ئۆجەلان پێداگریی لەسەر ئەوەدەکرد کە رێگرییان لێبکەن و هانی دەدان تا خەڵکەکە

[286] PKK 5. Kongresi, 224.

گەڕێننەوە سەر زێدی خۆیان. بەڵام لەڕەوشێکی وەهادا گەریلاکان تەنهادەیانتوانی گیانی خۆیان بپارێزن، نەك بیانپەرژێتە سەر هاوڵاتییە بێ چەکەکان. کەچی بەتالیۆنە گەورەکانی پەکەکە لەنێوچەکەدا هەمیشە رووبەڕووی تانەو تەشەری ئۆجەلان دەبوونەوە، چوون ئۆجەلان لەگەڵ جەنگی هەڵکوتانە سەر شوێنێك نەبوو پاشان بکشێنە دوواوە. ئەو پێی وابوودەبێت شوێنەکە کۆنترۆڵبکەن. دیارە کە ئەمەیش پێویستی بە تفاقو چەكو چۆڵی هێزێکی سەربازیی تەواو ئامادە هەبوو. بەڵام گەریلاکان توانای هەڵگرتنی ئەو هەموو چەكو تفاقەیان نەبوو تا بۆماوەیەکی زۆر بمێننەوە. لەبەرئەوە بەسەختی رووبەڕووی لۆمەی ئۆجەلان ببوونەوەو ئۆجەلان ئەوانی بە ترسنۆكو نەفام بە تاکتیكو تەوژمی نوێی سەربازیی دەزانیی. ساڵێك دوواتر نەوال بەم شێوەیە نائومێدیو رەشبینی خۆی لەسەر رەوشەکە دەردەبڕی:" ئۆجەلان پێی وابوو کە کێشە تاکتیك نییە، بەڵکوو کێشە لەگەڵ تاکەکاندایە.

بەڵام ئێمە چەکوچۆڵی پێویستمان نەبوو، ئەی پێویستە چی لەگەڵ ئەم رەوشەدا بکەین. ئایا خۆمان بە لوغمەکاندا بتەقێنینەوە، خۆ ئەوەیش هیچ لەمەسەلەکە ناگۆڕێت. ئەمە لەجیاتی مشتومڕ لە سەر تاکتیکی سەربازیی دەبوو بەجۆرێك دەست لە نەخشەو نواڕینی حزب بەرنەدەینو قوڵنەبینەوە. چونکە ئۆجەلان هەمیشە دەیوت، هەموشتێك باشە، کێشەکان تەنها ئێوەن".

هەشت مانگ پاش کۆنگرەی پێنجەم، سەعید کوروك کایای فەرماندەی ئامەدی پەکەکە، گەیشتە کەمپی زاپ لە باکووری ئێراق. ئەوە پاش دوومانگ ڕێ ڕۆیشتن هات تا توانی خۆیبگەیەنێتەوە کەمپەکەیان. ئەو پێویست بوو لە کۆمیتەی نێوەندی پەکەکەدا ئامادەبێت تاوەکو گوێبیستی ئەو بڕیارانە بێت کە لە کۆنگرەدا هاتوونەتە دەرکردنو شێوازی جێبەجێکردنی بڕیارەکانیش تێبگات. دیارە کە ناوبراو هەر بەنازناوە کۆنەکەیەوە، بەناوی دکتۆر سولەیمان وەڵامدەدرایەوە، ئەو گۆڕانکارییەکانی کۆگرەی پێنجی بەهەند وەرنەگرتبوون. هەربۆیە کاتێك ئەو و فەرماندە مەیدانییەکانی تر کە بەهەمان شێوە رێگەیەکی زۆردژوارو سەختیان بڕیبوو تا بگەنە کۆبوونەوەکەو

راسپاردەکان وەربگرن. دوواجار کە گەیشتنە ئەویّو راگەیەنراوی کۆتایی کۆنگرەیان بینی توشی شۆك بوون. بەتەواوی لەودەسەلاّتە رەهاو لەو بیّ سنوورییەی کۆنترۆلی ئۆجەلان بەسەر ئیرادەی حزبدا ئەبلّەق بوون.

ئەیهان سیفتسی لەم بارەیەوەدەیوت:"راگەیەنراوەکە وەها بوو کەدنیا وەك ماسی مەییو وایەو هیچ نەگۆڕاوە، بەشێوەیەك بوو کە ئاواییەك چۆڵنەکراوەو هیچ گەریلایەك لەنێونەچووەو هاتنە ناوەوەی ریزەکانی گەریلا هەروا بەردەوامە". ناوبراو دواتر بوویە فەرماندەی ئەرزرۆمی پەکەکە. ئەویش بەهەمان شێوەدەیوت:" بڕیارەکانم خوێندەوەو لەجێی خۆمدا حەپەسام".

هەروەها شەمدین ساکیك یەکیّ لە بەئەزموونترینو دیارترین فەرماندەکانی پەکەکەو بەرپرسی هەرێمی دەرسیم (تونجەلی) ئەویش بەهەمان شێوە راپۆرتەکەی فڕەدایەسەر زەوی‌و وتی:" نابێت ئەمە روویدات".

هاوکات گردبوونەوەکان لە هەرێمی زاب، فرسەتێکی کەمی دایە فەرماندە سەربازییەکانی پەکەکە، تا پێکەوە گردبنەوەو بەتێروتەسەلی قسان بکەن، ئەوانەی تائەوکات لەرێگەی بیّ سیمو گردبوونەوەی پەلەو کتوپڕدا یەکتریان بینیبوو.

هەریەك لە ساکیكو سیفتسی‌و کوروك کایا، ئەوانەی نێوچەکانی دەسەلاّتیان نیوەی تەواوی ئەو نێوچانەی کاروچالاکی پەکەکەی دەگرتەوە لەنێوخۆی تورکیاداو هاوکات نێزیكو پەیوەستبوون بەیەکەوە. ئەمانە بڕوایان وابوو کە کاتی ئەوە هاتووەجارێکی دیکە چاوبخشێنرێتەوە بەخەباتی چەکداری تەڤگەرەکەدا.

سیفتسی بەیەقینەوەدەیگووت:" هەریەك لە ساکیكودوکتۆر سولەیمانو من دارای روانگەیەك بووین، کە ئەویش ئەوەبوو رەوشەکە زۆرجیاواز تربوو لەوەی کە لە جیهانبینی ئۆجەلاندا بوو. ئەویش بەهۆی ئەو رێگەی تاکتیکەوە نەبوو کە ئێمە لەجێبەجێکردنیدا بووین، بەڵکو بەهۆی خودی تاکتیکەکانەوە بوو".

سیّ لەپیاوەکان هەوڵیاندا تا مشتومڕێکی دروست لەبارەی ئەو گرفتانەوە بکەن کە رووبەڕووی پەکەکە ببوونەوە. ئەوان فرە وریابوون و لە هەر سەرزەنشتێکی ئۆجەلانو

لەهەر رقلێبوونەوەیەك خۆیان دەبوارد. لەراستیدا ساكیك وابیرینەدەكردەوە كە ئۆجەلان لە هەڵەدا بێت، ئەو سووربوو لەسەر تۆمەتباركردنی راوێژكارە باڵاكانی ئۆجەلان‌و پێی وابوو ئەوان لەخراپ راڤەكردنی جەنگەكەدا هۆكارن. بەڵام ئەوانیش پێداگرییان لەسەر ئەوەدەكرد كە گروپە شۆڕشگێڕەكە پێویستبوو لەتەكتیكەكەیدا بەخۆدابچێتەوە. ئەمە لەكاتێكدا كە دەستپێشخەرییەكی سەربازیی نوێ بخاتەوە بەرنامەی كارییەوە. كوروك كایا سوربوو لەسەر بۆچوونەكانی و دەیگوت:" ئێمە پێویستبوو چالاكیی لەتەك گروپگەلێكی ئەزموونداروو گچكەتردا چالاكیی ئەنجامبدەین‌و پێویستبوو ئامانجەكانمان فرە بەوریاییەوەدەستنیشان بكەین.

هەندێك لەفەرماندە سەربازییەكان لە كۆبوونەوەكەدا پێشنیازی ئەوەیان كرد كە چالاكییە سەربازییەكانیان ڕوو لە خۆرئاوای توركیا بنێن. بەتایبەت هەرێمە دێهاتییەكانی لێواری دەریای رەش.

سیفتسی بەم شێوەیە رەوشەكەی دە گێڕایەوە:" ئێمە لەخاكی خۆمانداجەنگمان دەكرد، زەوی‌و زاری خۆمان كاول دەكردو دێهاتەكانمان دەسوتان. بۆچی جەنگەكە نەبەینە دەریای رەش، تا بزانین سەربازەكانی تورك بەهەمان شێوە مامەڵە لەگەڵ گوند نشینەكانی ئەوێشدادەكەن؟".

هەروەها بیرۆكەیەكی تریش هەبوو كە تەركیزی دەخستەسەر ئامانجە ئابوورییەكان‌و كۆمپانیاو بەرژەوەندییە گشتییەكان، ئەم بیرۆكە بۆ ئەوەبوو تا بەشێوەیەكی راستەوخۆ لەتمە لە بەرژەوەندییەكانی توركیا بدەن. هەروەها فەرماندە سەربازییەكانیش لەوبارەیەوە مشتومڕیان بوو تاجەنگەكان بەرنە نێوەندەشارییەكانی توركیا، ئیدی شارەكانی هەرێمە كوردییەكان بن یان توركنشینەكان قەیدی نەبوو.

كوروك كایا دەیگوت:" ئەنجامەكە ئەوەبوو كە ئەو رێچكەی جەنگەی كە تا ئەوكات لەئەنجامدانیدا بووین، ئیدی نەماندەتوانی لەسەری بەردەوامبین". هەروەهادەیوت:" ئۆجەلانمان بانگ كردو پێمان گوت كە خەریكین لەسەرچ ئەجێندایەكی جەنگیی نوێ

قساندەکەین.دیارە کە وەلامی ئەویش روون و رەوان بوو، گرفت تاکتیك نییە، گرفت ئێوەن کە هێشتا خۆتان ئاوێتەی حزب نەکردووە.

ئەمە ئەو چەمکە بوو کە ئۆجەلان هەرکات رووبەڕووی گلەو گازاندە ببوایەتەوە بەکاریدەهێنا، مەبەستی ئەوەبوو ئەوانەی کە پلاریان هەبوو بەدروستی لەپەکەکە تێنەگەیشتوونو مەبەستی روونو رەوانیش خۆی لەوەدا دەبینییەوە کە ئەوان رێز بۆ ئۆجەلان دانانێن. هەروەها کوجوك دەیوت:"ئۆجەلان پێی باشبوو هەمووان لەپارتەکە نزیکتربینەوە، پێی باشبوو کە منو سیفتسی بچینە سوریا". هەربۆیە وەك ئەوەی کە ئەوان ئامادەکران تا ڕوو لە سووریا بنێن، پێیان وابوو کە لە کۆنگرەدا پێشنیازی ئەو بڕیارە کراوە، ئیتر لەوکاتەدا پێویستبوو ئامادەی ئەوکارەبن. کوجوك کایا دەیوت:" ئۆجەلان کە بڕیارەکەمی دەرکرد، هەمووان هەمان ئەنجامگیرییان کردبوو، وەختیٚ ئەو قسەی کرد، هەمووان ئیدی دەیانزانی قسەیەکی تر نابێت بکرێت، ئۆجەلان هەرچییەکی بووتایە، هیچ دەرفەتێکی بۆ گۆڕینی بۆچوونەکانی نەدەهێشتەوە".

## دەرچوون قەدەغەیە

کۆنگرەی پێنجەمو کۆنفرانسی زاب هەردوو خۆیان یەکلاکردەوە بۆ نەخشە ڕێگەی جەنگی سەربازیی پەکەکە لە سالانی ئایندەدا. وەلیٚ بێ بەهرە لە هەر ستراتیژێکی جددی جەنگ بەردەوام بوو. خالە لاوازو بەهێزەکانی جەنگی گەریلایی دیارینەکرانو هەروا پەکەکە نەیتوانی سالانی هێزی خۆی زیندو رابگرێتەوە.

هێـزو یەکـە سـەربازییەکانی پەکەکـە هـەروا لەچـیاکان مانـەوەو لـەهاموو شـۆی خالەسنوورییەکانی ئێراقو تورکیە نەکەوتن، وەلیٚ هەر لـە رەوشـی بـەرگریی لەخۆکردنـدا بوون. گۆڕانە سەربازییەکان کە ئۆجەلان کردی، زیاتر قسەکردن بـوو لەسـەر شـکۆمەندی خــودی خــۆی، وەك ئــەوەی مەبەســتو مەوســیمێکی تــری خــەباتبن. جیــا لــە یەکەسەربازییەکانی ژنان کە راستەوخۆ وابەستەبوون بـەخودی خۆیـەوە. هـەروەها هـانی

دەدان تا کردەگەلێکی سنووردارییی خۆکوژیی پێڕەو بکەن. ئەو پێی باشبوو ژنان خۆیان بکوژنەوە لەبری ئەوەی بکەونە ژێردستی دوژمنەکانیانەوە.

لەساڵی ١٩٩٢دا ئەو کیژەی کە بەبێریڤان نێودەبرا، نارنجۆکێکی بەخۆیدا تەقاندەوەو ئامادەنەبوو بەدیلیی بکەوێتەدەستی دوژمن. ئیدی ئەم ناوە وەك قارەمانێك لەنێو ژنانی تازە بوو بە گەریلادا هەمیشە لەسەر زاران بوو. ئەم گرنگیپێدانە بە قوربانیدان لە میتۆدی ئۆجەلاندا فرە برەوی پێدرا. لەساڵی ١٩٩٦ گۆڕان بەرەو ئەم نەزمی خەباتە برەوی پێدرا، لەمانگی شەشی ئەو ساڵەدا کیژە گەریلایەکی دی بەنێوی زەینەب(زیلان) کیناجی بۆمبێکی بەست بەخۆیەوەو لە بۆنەیەکی سەربازیدا خۆی تەقاندەوەو لەئاکامدا خۆیو شەش سەربازی دیکەی کوشت.

سەرنوسەری پێشووی Ozgur Gundemو ئەندامی چەکداریی پەکەکە گوربتلی ئێرسۆز کە هەمان نازناوی زەینەبی لەخۆی نابوو، ئەو لەیاداشتەکانی رۆژانەیدا لەوبارەوە نوسیبووی:" بەشانازییەوە هەمان نازناوی ویم لەخۆم نا، بۆ ئەوەی ببمەکەسێك دروست وەك ئەو بژیم"[٢٨٧].

چەند مانگێکی کەم پاش ئەو، لەیلا کەپلانی گەریلای پەکەکە لەدەروازەی وێستگەیەکی پۆلیسدا خۆی تەقاندەوەو سێ لە پۆلیسەکانی ئەو بنکەیەی کوشت.

پاش سێ ساڵ لەو رووداوە، ١٤ هێرشی دیکەی خۆکوژیی بەشێوەیەکی سەرەکی ژنان تێیدا بەشداربوون ئەنجامدران. ئەم هێرشانە زیاتر لە نێوچەکانی باشووری رۆژهەڵاتو لەنێو خاکی تورکیادا ئەنجامدەدران، ئەمەیش ئاماژەیەك بوو بۆ رەوشی نائارامو تووڕەیی ژنان لەبەرامبەردەسەڵاتی تورکیادا[٢٨٨]. لەهێرشەکاندا بەشێوەیەکی سەرەکیی کەسە سەربازیو ئاسایشییەکانی میریی دەکرانە ئامانج[٢٨٩].

---

[287] Ersoz, Gurbet'in Guncesi, 153.
[288] See the excellent study by Halis, Batman'da Kadinlar, on female suicides in the southeastern city of Batman in 2000.
[289] For an overview of PKK suicide bombing, see Mia Bloom, Dying to Kill: The Allure of Suicide Bombing (New York: Columbia University Press, 2005), 101 – 119; list of attacks taken from Schweitzer, Yoram, "Suicide bombing: the

دیاره ئۆجەلان بەتەواوی ستایشی ئەو کردە خۆکوژیانەی دەکرد، هەرچەند کە ژنان لەنێو پەکەکەدا هەر سەنگو شوێنی خۆیان نەگرت. دیارە کە ژن لەناو پەکەکەدا هەستیانکردبوو ئەوانیش هێزێکن، وەلێ پەنا بردن بۆ خۆکوژیی لەلایەکەوە ئاماژەبوو بۆ لاوازی ئەوان، لەلایەکیی تریشەوە ئاماژە بوو بۆ ئەوەی کە پەکەکە ئەولەویاتی کاری خۆی لەدەستدابوو، ئەوێدەم تەنێ مژوڵ بوون بە هەندێك گۆڕانی تاکتیکی و ستراتیژی و کاری توندوتیژو رەفتاری رەقەوە. هەروەها ناتەوانی ئۆجەلان لەهەمبەر شیکردنەوەو دەستنیشانکردنی خاڵە لاوازو بەهێزەکانی خەباتە چەکدارییەکەی بەپێچەوانەوە ئاماژەیەکی روونو رەوان بوو بۆجەختکردنەوە لە گۆڕانکارییەکانی بواری سیاسەتو بەهەندوەرگرتنی شتانێکی مەتاتی لەنەزمی پەکەکەدا، کە ساڵانێك بوو هێزوو توانایاندابوویە تەڤگەری پەکەکە. بۆنموونە لە کۆنگرەدا نوێنەران لەسەر ئەوە رێککەوتبوون کە ئاڵای چەکوشو داسیی پەکەکە دابگرن. ئەو ئاڵایەی ئاماژەبوو بۆ بیری مارکسیو لینینینی پەکەکە. بەڵام لە زیهنی نەتەوایەتی پەکەکەدا ئەوە تەنها رووکەشێكو ئامرازێك بوو بۆجوڵانەوەکە. چوونکە بەهەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت ئیدی پشتیوانییەکیان بۆ ئەو هزرو هێزە نەدەبینییەوە. بەڵام وەك دەبینرا زۆرێك لەگروپە چەپەکانی تر و هێزە شۆڕشگێڕە مارکسییەکان بەپەرۆشەوە درێژەیان بە بیری مارکسی دەداو هەر لەسەر بەزمە کۆنەکەی خۆیان بوون. ئۆجەلان بەپێچەوانەوە قوڵبوونەوەو قیاسی ئەو بۆ شۆڕشگێڕیی لەپێناودەستکەوتە سیاسییەکان بوو. هەربۆیە لابردنی ئاڵای چەکشوداس ئاماژە یاخۆ هێما نەبوو بۆدەستبەرداربوونی پەکەکە لە شۆڕشگێڕیی و خەباتی چەکداریی. بەڵکو ئاماژەیەك بوو بۆ ئەوەی کە پەکەکە تەرزی تیۆری نایبەستێتەوەو لەسەرووی هەموو ئەو بیرو تیۆرانەوە هێزێکی کارای کردارییە لە مەیدانەکەدا.

---

Ultimate Weapon?" Aug. 7, 2002, at www.ict.org.il.

بەهەمان شێوە ئۆجەلان دەستیدایە قوڵبوونەوەو وردبوونەوە لە ئاینو بەکارهێنانی ئاین لە خەباتەکەیدا. هەربۆیەدەبینین کە پەکەکە سەرەڕای ئەندێشەو ئەجێندای مارکسو لینین لە میتۆدەکەیدا، هیچ کات دژ بەئیسلام نەوەستاوەتەوە. ئەوە سەرەڕای پرۆژەو پەیڕەوی نێوەندگیریی ئۆجەلان لەهەمبەر ئاییندا. هاوکات لە کۆنگرەی پێنجیشدا دووپاتی ئەو راستیەیان لەبەیاننامەیەکدا کردەوە کە ئایینی ئیسلام لەگەڵ خەباتی نەتەوایەتیو دۆزی کورد دا ناتەباو نەیار نییە[٢٩٠].

هەروەها کۆنگرە ئاماژەی دا بەگروپێکی نوێ بەنێوی بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستان، کە بە پشتیوانیو ئیعازی پەکەکە دروستکرابوو. دیارە کە پەکەکە هەرگیز بایەخی بۆ تەڤگری ئیسلامیی دانەناوەو پێی وابووە بەرژەوەندی ئاینیی لەپێش بەرژەوەندی نەتەوەوە تەماشادەکرێت. بەڵام ئەم رەنگو رووە نوێیەی پەکەکە بەشێك بوو لەو هیوایەی کە پەکەکە دەیەویست تەڤگەرە ئیسلامییەکان بەئاڕاستەی خۆیان کێشبکەن. تەڤگەرە نوێیەکە بەتەواوی داکۆکیی لەمافی هەموو گەلانێك دەکرد بۆ سەربەخۆییو پێی وابوو کوردیش دارای مافی سەربەخۆبوونە.

هەربۆیە بڕیارو بەیاننامەگەلێك لەبارەی ئاشتەواییو بەهەند وەرگرتنی ئاینیی ئیسلام لە کۆنگرەی پێنجەمی پەکەکەدا دەرکران. هەموو ئەوانە پێداگرییان لەوبارەیەوەدەکردەوە کەجەنگ دژ بە بندەستیو نادادگەرییە نەك دژ بە ئاینیی ئیسلام.

دیارە کە کاردانەوەی ئەم هوتافو هیوایەی ئۆجەلان بۆ ئیسلام لە بەدەستهێنانی پشتیوانییەکی نوێوە سەرچاوەی گرتبوو، نەوەك خواستی بێت ئیسلام بکاتە رێبازێکی نوێ لە سیاسەتدا.

---

290 A detailed look at Kurdish views toward Islam in general and the Islamic beliefs, practices, and divisions in the Kurdish community in specific is outside the scope of this study. Probably the best and most enlightening studies of Kurds and Islam have been produced by Martin van Bruinessen. Much of his writings are available on his website: http://www.let.uu.nl/~martin.vanbruinessen/personal/publications/.

دوواجار سەرکردایەتی تاکتیکیی‌و سیاسیی ئۆجەلان لەرێگەی دوو هۆکارەوە دیاریکرا. یەکەمیان بریتی بوو لە هەوڵە بەردەوامەکانی بۆ پاراستنی پێگەو سەرۆکایەتییەکەی، بریتی بوو لە زامنکردنی هەیمەنەو هێزی پەکەکە بەسەر چالاکوانە کوردەکاندا، چوون ئەم چالاکوانە کوردانە بەردەوام ململانێیاندەکرد لە هەمبەر موناوەرە سیاسییە گشتییەکاندا. دووەمیان لەلایەن حکومەتی تورکیاوە دانە دوواوەی ئۆجەلان وەك هاوتا نەیاریی تورکیا بۆ دانوستانەکان[291].

هاوکات ئۆجەلان دەستبەرداری هیوای سەربەخۆیی ببوو لەپێناو فیدراڵی یان ئۆتۆنۆمی دا بۆ کوردستان. هەرچەند کە لەلایەن نەیارەکانی‌و لایەنی میرییەوە بەتەواوەتی هەموو خواست‌و خولیایەکی ئۆجەلان پشتگوێخرابوو. چوون رێبەرانی تورکیا، بەتایبەت سەرکردە سەربازییەکان بەهیچ کلۆجێك خۆیان لەقەرەی خواست‌و خولیای نەتەوایەتی کوردیدا نەدەداو لەژێر هیچ ناوێکدا مامەڵەیان لەگەڵ پرسی کورد دا نەدەکرد.

## ئاوڕدانەوە لە ئێراق

لەئازاری ١٩٩٥دا، ئەرتەشی تورکیا ٣٥ هەزار سەربازی نارده بەر سنوورەکانی باکووری ئێراق تا بتوانن کێوماڵی بنکەو بارەگاکانی پەکەکە بکەن لەو نێوچانەدا. تورکیا بەهیوابوو ئیدی بۆدواجار ئەو هێڵە سنووریانەی ئێراق نەبنەوە خاڵی هەڵکوتان‌و هێرشەکانی پەکەکە بۆ نێوخۆی تورکیا[292].

دیارە لە ١٩٩٢ تا ئەوکات تورکیا هێند هێزێکی سەربازی زەبەلاحی نەناردبوویە سنوورەکانی ئێراق. چوون ئەوکات هێزەکانی تورکیا شان بەشانی چەکدارە کوردییەکانی

---

[291] PKK 5. Kongre Kararlari, 98.

[292] This section utilizes Balikci and Durukan, Olumun Iki Yakasinda, 132 – 147; Gunter, Kurdish Predicament in Iraq, 79 – 126; Kirisci and Winrow, Kurdish Question, 161–171; Laizer, Martyrs, 133–138, 149–158; and Ozdag, Turkiye, 126– 206; also, personal observations of the author who reported on the operation for Reuters.

ئێراق بۆ ماوەی چوار حەوتە کەوتبوونە وێزەی پەکەکە، وەلێ لەو هەوڵەدا تورکیا شکستی هێنا لەدەرپەڕاندنی یەکجاریی گەریلاکانی پەکەکەدا. ئەمجارەیان ئەرتەشی تورکیا بەڵێنی دابوو تا بنکەو بارەگاکانی پەکەکە لەباکووری ئێراقدا پاکنەکەنەوە واز لە بەزاندنی سنووریی ئێراق ناهێنن. هێندەی پێنەچوو ئۆپەراسیۆنەکەی تورکیا لەلایەن دەسەڵاتە هەرێمییەکانی رۆژهەڵاتی نێوەڕاستو وڵاتانی خۆرئاوای هاوپەیمانی تورکیاوە نیگرانی سەختی بەدووای خۆدا هێنا.

ترس لە هێزەکانی ئەنکەرە لەباکووری ئێراق لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە تورکیا هێزەکانی خۆی جێگیربکاتو هەرێمێکی پەیوەست بە ئاسایشی خۆی بونیادبنێتو لەو پێناوەدا ئەگەریی ئەوە هەبوو کە تورکیا تورکمانەکان وەك کەمینەیەکی نێزیك بە رەگەزی تورك بەکاربهێنێت. هەربۆیە تورکیا لەهەمبەر نێزیکبوونەوەی زیاتری لەیەکێتی گومرگی ئەورووپا، ئیدی لەو راستییە تێگەیشت کە پێویستە هاوسەنگیی لەنێوان ئامانجە سەربازییەکانو سیاسییەکانیدا رابگرێتو بەوریاییەوە لەسنوورەکانی باکوری ئێراقدا هەنگاو بنێت. هەربۆیە شەش رۆژ پاش ئۆپەراسیۆنەکە دیمێریل ناچارکرا هەڕەشەو گوڕەشەکانی هێور بکاتەوەو ئاماژە بەوە بکات کە ئۆپەراسیۆنەکانی وڵاتەکەی سنووردارەو بۆ ئامانجێکی کاتی سنووریان بەزاندووە. هەربۆیە لەم بارەیەوە رایگەیاند: "دروستکردنی هەرێمێکی ئاسایشی بە چارەسەری دۆزەکە نازانن"[293]. بەمجۆرە تورکیا لەو راستییە تیۆرییە تێگەیشت کە دەستوەردانە جەنگیی پەکەکە هەڵەیەکی گەورەیەودەگدانەوەی مەزن بەدووی خۆیدا دەهێنێت. هاوکات تورکیا لەو راستییە تێگەیشت کە پێش ئەوەی ئۆپەراسیۆنەکان دەستپێبکات بەشێکی گەورەی جەنگاوەرانی پەکەکەو کۆگاکانی چەكو چۆڵیان گوازرابوویەوە بۆ باشوری وڵاتی تورکیا.

لەهەمانکاتدا هێزەکانی تورکیا کەوتنە دڵەخورپە لەمەڕ رەوشی گوماناوی خۆرئاوای وڵاتو ژینگەی دەرێی پێوەندییەکانیان. ئایا پێویستبوو تورکیا چ پاساوێك بۆ ئەم

---

[293] Quoted in Ozdag, Turkiye, 132.

رەوشە بهێنێتەوە، ئایا بیکات بەژێر لێوەوە یاخۆ چۆن مامەڵەبکات. ئەوەی کە روودەدات دروست هەمان رەوشی باکوری ئێراقە، وەلێ ئەمجار لەخاکەکەی خۆیدا روودەدات.

بۆنموونە کوشتن‌و خۆتەقاندنەوەو هەڵکوتانە سەر کەسانی ئامانجدار. هەروەها تورکیا زۆرجار لەرێگەی بۆمبە هەواییەکانەوە بۆردومانی ئاواییەکانی باکووری ئێراقی دەکرد. ئیدی خەڵکی ئاواییەکان بەناچاری هەڵدەهاتن‌و لەلێواری رێگە سەرەکییەکاندا خێوەت‌و خێمەیان هەڵدەدا. کوردانی ئێراق هەمیشەگازەندەو شکایەتیان لەو رەوشەدەکرد کە تێی کەوتبوو. خراپ مامەڵەکردن‌و بۆردومانی لەناکاو و کوشتنی بەئەنقەست ببوویە ژیانی رۆژانەیان. بۆنموونە ٧ شوان بەکوژراوی دۆزرابوونەوە، ئەوان پاش ئەوەی قۆڵبەستکرابوون، ئیدی لەکاتی پرس‌وجۆدا لەلایەن هێزە ئەرتەشییەکانی تورکەوە کوژرابوون. سەربازانی تورك لەدەرێی زاخۆدا خاڵی پشکنینیان دانابوو، ئەوان جۆرێك لەسەر ئێشەو تەنگژەیان بۆ خەڵکەکە دروستکردبوو، بەتایبەت لەپرسیارو وەڵام‌ودۆزینەوەی دوژمن‌و دۆستیاندا. لەبەر ئەوەی شوناسنامەی خەڵکەکە عەرەبی بوو، ئەوانیش تێنەدەگەیشتن، ئیدی زۆرجار هەق‌و ناهەق تێکەڵدەکرا. لەهەمانکاتدا کەمپەکانی هەفتانین‌و کانی ماسی گەریلاکان تەنها کاتژمێرێك بەرێ رۆیشتنی ماشین دوور بوون لە بنکە سەربازییەکانی تورکەوە. ئەمەیش ببوویە هۆیەك کە گەریلاکانی توشی نائارامی کردبوو لەنێوچەکەدا.

بەڵام ئۆپەراسیۆنەکانی تورکیا کەمتر لەدوومانگ لەنێوچەکەدا لەباکووری ئێراق بەردەوامبوون. لەئاکامدا ئەرتەشی تورکیا بانگەشەی سەرکەوتنی مەزنی دەکرد لە پرۆسەی ئۆپەراسیۆنەکانیدا. هەروەها بانگەشەی ئەوەی کرد کە توانیویانە کێومالّی گەریلاکانبکەن‌و ٥٥٥گەریلایش لەنێوبەرن کە لەبەرامبەردا تەنها ١١ سەربازی تورك کوژرابوون.

هاوکات چەندین وێنەی دروستیان لەبارەی کۆگاکانی چەك‌و خۆراك‌ودەرمانی گەریلاکان بلاّوکردبوویەوە کە توانیبوویان دەستیان بەسەردا بگرن. لەگەڵ ئەوەیشدا

تورکیا نەیتوانی بەیەکجاریی بنکەو بارەگاکانی پەکەکە لەنێوچەکەدا بسڕێتەوە، چوون هەر چەند هەفتەیەکی کەم پاش ئەوە سەرلەنوێ گەریلاکان گەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان‌و دیسانەوەدەستیان کردەوە بەهەڵمەت‌و هەڵکوتانە سەر سەربازگەکانی تورکو لە هەوەڵدەستپێکی هەڵمەتەکاندا چەند سەربازێکی تورکیان کوشت.

دیارە هەمیشە پەکەکە توانیویەتی سوود لەبۆشایی هێز وەربگرێت لەنێوچەکەدا، بۆشایی هێزی بەغداد لە ساڵی ١٩٩١دا دەرفەتێکی باشی بۆگەش‌ونمای پەکەکە رەخساند لەباکوری ئێراقدا. پاشان هەڵایسانی جەنگ لەنێوان هێزە کوردییەکانی تاڵەبانی‌و بارزانی دیسانەوە کەلێنێکی دیکەی هێزی لەنێوچەکەدا دروستکردو ئەزموونی حکومەتی هەرێمی کوردستانی لەبواری ئاسایش‌و ئیدارەدا توشی شەلەلکرد. هەربۆیە پەکەکە توانی بەگورجی ئەو کەلێنە بقۆزێتەوە. ململانێکان‌و جەنگەکانی پارتی و یەکێتی لەسەر ناکۆکی و تەنگژەی کۆنترۆڵی نێوچەکان دەستی پێکردو پاشان جەنگەکە تەشەنەی سەند تاوەکو ناکۆکی لەسەر خاڵەگومرگییەکان بووە خاڵی گەرمی ناکۆکییەکان. پارتەکەی بارزانی تاوانباردەکرا بەدەستگرتن بەسەر خاڵی گومرگی سنوورەکانی تورکیاو خاپوور. ئیدی چەکدارەکانی تاڵەبانی توانیان شاری هەولێر بگرن‌و حکومەتی هەرێمی کوردستان‌و ئیدارەی یەکگرتووی نێوانیان هەڵبوەشێننەوە[٢٩٤].

جەنگی نێوان پارتی‌و یەکێتی گەیشتە رادەیەك کە ئەمریکای لەو بارەیەوە توشی نیگەرانی کرد، چوون هەریەك لەو هێزانە لەهەرکاتێکدا ئەگەری پەنابردن بۆ هێزی دەرەکی لەوانە تاران‌و بەغدا دەبرد تاوەکو خۆی لە نیری نەیارەکەی رزگار بکات.

لە مانگی هەشتی ١٩٩٥ واشنتۆن بۆ هەریەك لە پارتە کوردییەکانی ئێراق کۆبوونەوەیەکی لەدبلن رێکخست. ئامانج لە رێکخستنی ئەم کۆبوونەوەیە بۆ چارەکردنی نیگەرانییە ئاسایشییەکانی تورکیا نەبوو، بەڵکو ئەولەویاتی رێککەوتنەکە مەشروعییەتی ئەمنی‌و ئارامی تورکیای لەخۆداجێکردبوویەوە. هەمیشە ئۆجەلان لەپلانی نێونەتەوەیی و

---

[294] See Barkey, "Hemmed in by Circumstances," for a broader overview.

داوی ولآتانی زلهێزدەترسا، هەربۆیە ترسی لەو ڕێککەوتنە خۆی لەوەدا دەبینییەوە کە واشنتۆن وا لەهەردوو پارتە کوردییەکەی ئێراق بکات کە پەلاماری پەکەکە بدەن.

هەربۆیە ٤ ڕۆژ پاش ڕێککەوتنەکەو تەنانەت پێش ئەوەی ڕێککەوتنەکە جێبەجێبکرێت، ئۆجەلان لەلای خۆیەوە خولێکی نوێی جەنگی دژ بە پارتی دێموکراتی کوردستانی ئێراق ڕاگەیاند. بەمەیش پەکەکە فرە بەسانایی توانی ئەو نێوچە سنووریانە کۆنترۆڵبکات کە بنکەو بارەگاکانی خۆی لێبوو. هەر لە سەرەتاوە ئەوە ڕۆشنبوو کە هیچ لایەنێکی کوردیی نەیدەتوانی لەوی تر باشترو ڕاستاڵتر بێت. لەبەرامبەر هێزی چەکداری زۆرو زەبەندی پارتیدا، پەکەکە پشتی دەبەست بە بارەگا سەختو سەنگەرە بەهێزەکانی لەچیاکاندا.

هێرشی بێ پاساوی پەکەکە بۆ سەر هێزە چەکدارەکانی پارتی، کوردانی ئێراقی توشی شۆککرد. خەڵکی کوردستان پەکەکەیان وەك هێزێکی شازو نادردەبینی لەنێوتەڤەری ڕزگاریخوازی کوردیدا. چونکە ئەوان لەجیاتی کارکردن بۆ بونیادی دەوڵەتێکی کوردی بەربرووبوونە گیانی پارتە کوردییەکانی تر، هەر بۆیە پاش ئەوەی ڕەنجو ڕەقییەکی زۆریان لەدژ گروپە کوردییەکانی تورکیا بەهەدەربرد، لەئێستاشدا دژ بە کوردانی ئێراق لەجەنگدان. دیارە کە ئەمەیش هۆکارێکبوو تا پەکەکە پشتیوانییەکی فرەی جەماوەریی لەبەرامبەر خۆیدا لەدەستدابوو.

حوسەین تۆپیقدەر فەرماندەی پێشووی پەکەکە، کە ئەوێ دەم لەباکووری ئێراق بوو، لەم بارەیەوەدەیوت:" هیچکام لەلایەنەکان جەنگەکەیان نەبردەوە، وەلێ ئێمە زیانمان بەرکەوت، زیانێك کە ئیعتباری بۆ نەهێڵاینەوە".

پێکدادانەکان لەنێوان پەکەکەو پارتیدا لەدێسەمبەری ١٩٩٥دا دووماییان هات. هەمیشە وەرزی زستان دەرفەتێکی باش بوو بۆ هەڵپەساردنی جەنگەکان، ئیدی هەردوولا وازۆی ڕێکەوتنێکیان کرد تا ئاگربەست ڕابگەیەنن.

لەڕێککەوتنەکەدا بوار بە پەکەکە درا تا بنکەو بارەگاکانی لەچیاکاندا بهێڵێتەوە، بەڵام پێویستبوو لەجیاتی کاری چەکداریی گرنگی بە کاری ڕامیاریی بدەن لە نێوخۆی

کوردستانی ئێراقدا. دیارە تورکیا ئەم ڕێککەوتنەی وەك خیانەتێك دەبینی لەچاوی کوردانی ئێراقدا بەلاّم مژوڵیی پارتی بەجەنگ لەگەڵ تاڵەبانیدا، وایکرد کە بارزانیی لە نیگەرانییەکانی تورکیا تێنەگەیەنێت.

سامی عەبدورەحمانی بەرپرسی پێوەندییە دەرەکییەکانی پارتی لە میانی پێکدادانەکانیان لەتەك پەکەکەدا بەشانازییەوەدەیگوت: "گەر چەکو چۆڵو ئازوقە ڕێگر نەبوونایە، زۆر بەسانایی دەمانتوانی زاڵبین بەسەر بارەگاو بنکەکانی پەکەکەدا. ئێمە نەماندەویست کۆگاکانمان لەجەنگی پەکەکەدا خاڵی بنەوە، چوون عەتادو تەقەمەنی و کەمبوونەوەی دەبووە خاڵێکی لاوازی پێگەمان لەبەرامبەر هەر هێرشێکی یەکێتیدا"[٢٩٥].

هاوکات ئەمریکایش لەوەدەترسا کەجەنگی نێوان پارتی‌و یەکێتی‌و لایەنە کوردییەکان ببێتە هۆی پشێوی‌و نائارامی لەنێوچەکەداو سەربکێشێت بۆ ناهاوسەنگبوونی تای هێزەکان. ئێران زێدەتر لەتاڵەبانیەوە نێزیك بوو تا لەبارزانی. هەربۆیە لە مانگی حەوتی ١٩٩٦دا پێوەندییەکانی بەکارهێنا تا نێوچەکە بکێشێتە نێوجەنگێکی خێراودژوارەوە. ئامانجی ئێرانییەکان لەسنوور بەزاندن کێومالّو لەتمەدان بوو لەبەرهەڵستکارەکانی وڵاتەکەی لەسنووری ئێراقدا، وەلێ پیاوانی بارزانی نیگەرانییەکانیان بەوجۆرەدەربڕی کە ئێرانییەکان بۆ پشتیوانی تاڵەبانی سنووری ئێراقیان بەزاندووە. ئەم پشتیوانییەی ئێرانییەکان لەدەستێوەردان لەجەنگەکاندا، هێرشی بەغدای لێکەوتەوە، ئەوەبوو بەغدا لە مانگی ئابی هەمان ساڵدا توانی یارمەتی بارزانی بداتو شاری هەولێری پێتەخت جارێکی تر لە چنگی تاڵەبانی دەربهێنێتەوە. سەرلەنوێ تورکیا نیگەرانییەکانی لەهەمبەر ئاشوبەکانی کوردستانی ئێراقدا زیاتر بوون. چوون وا لێکیدەدایەوە ئاژاوەکان هۆیەکن بۆ بەهێزبوونەوەی بنکەو بارەگاکانی پەکەکە لەباکووری ئێراقدا. هەوڵەکانی ئەمریکایش بۆ

---

[295] The statement, which he later repudiated, quoted in Laizer, Martyrs,

158.

هێورکردنەوەی رەوشەکەودامرکانەوەی ناکۆکیی نێوان پارتەکان تا مانگی پێنجی ۱۹۹۷ بێ ئاکام مانەوە. لەوکاتەدا تورکیا ئۆپەراسیۆنێکی بەربلاوی کردەوە سەر بارەگاکانی پەکەکە لەباکووری ئێراق‌و دیسانیش لەدێسەمبەری هەمان ساڵدا سنووری بەزاندەوە.

ئیدی رێبەرانی کورد لەو راستییە تێگەیشتن کە ناکۆکی و ململانێکانیان دوواجار سەردەکێشێت بۆ پەرتبوون‌و دابەشکردنی هەرێمەکەیان لەنێوان هەریەك لە ولاّتانی دراوسێیان کە سووریاو ئێران‌و تورکیای دەگرتەوە. جارێکی تر لە ئۆکتۆبەری هەمان ساڵدا تورکیا هاوکاریی هێزەکانی پارتی کرد دژ بەتاڵەبانی. وەلێ ئەمجار پرسی دانوستان و کۆتایی هاتن بەتەگژەکان هاتەوەگۆڕێ. ئیدی بەدەستێوەردانی ئەمریکاو پاش زنجیرە پێشنیازو کۆبوونەوەیەك، دوواجار لە سێپتەمبەری ۱۹۹۸دا هەردوو لا بارزانی و تاڵەبانی لە واشنتۆندا کۆتاییان هێنا بە ۴ ساڵ جەنگی خوێناویی‌و نێوخۆی ولاّتەکەیان.

تورکیا نیگەرانی خۆی لەم بارەیەوە نەدەشاردەوەو دژ بەهەموو پێکهاتەیەکی شێوەبەڕێوەبەریی بوو لە باکووری ئێراقدا. چونکەدەیزانی ئەمدەسەلاّتە کوردییە ئیدی دەبێتە لەمپەر لەبەردەم پرۆسە سەربازییەکان تورکیادا بۆ باکووری ئێراق. هاوکات ئەم رێککەوتنە بەشێوەیەك تورکیای قەڵسکردبوو کە وەك خیانەتێك دەرهەق بەرۆڵی هەرێمیی خۆی لەنێوچەکەدا لێکیدەدایەوە.

هەر لەوکاتەدا تورکیا تەنگژەکانی خۆی لەگەڵ سوریادا گەیاندبوویە لوتکە، تورکیا گەرەکی بوو سوریا هەرچی زووترە رێبەری پەکەکە ناچار بەدەرکردن بکات لە ولاّتەکەیدا. لەرەوشێکی وەهادا تورکیا هەڕەشەی داگیرکاریی دەکرد بۆسەر سوریا. هەربۆیە ئیدی ژینگەی مانەوە بۆ ئۆجەلان بەتەواوی تەنگی پێهەڵچنرابوو[۲۹٦]. چوون ئەو

---

[296] Estimates on the cost of the war for the years 1993–1995 vary between

a low of $6 billion to a high of around $11 billion.

هەلومەرجە بەسەرچوو کە ئۆجەلان تەنها پشت بەهەڕەشەو هاتوهاواری فەنتازی ببەستێت، بەڵکو ئەوە واقیعێکی جددی بوو کە ڕووبەڕووی ئۆجەلان ببوویەوە.

## دۆزی کورد وەك خۆی دەمێنێتەوە

بەهاتنی ساڵی ١٩٩٥، دەوڵەتی تورکیا ساڵانە ١١ بلیۆن دۆلاری لەبواری بونیادی یەکەی سەربازییو خەرجیی سەربازیدا پەیوەست بەجەنگی پەکەکە بەهەدەردەدا. سەرەڕای ئەوەی کە نێزیکەی ٢٢٠٠٠٠ سەربازو پۆلیسو پاسەوانی گوندی لەنێوچەکەدا جێگیرکردبوون. ئەمەیش دروست بەستنەوەی یەك لەسەرچواری دووەم هێزی بەرفراوانی ناتۆبوو کەگیرۆدەی جەنگی نێوخۆیی وڵاتەکەی ببوو[٢٩٧].

لەراستیدا ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانو پرسیاربوو کە سەرەڕای ئەو هێزە زەبەلاحەی تورکو ئەو هەموو تاکتیکە هەڵەو خەوشاوییانەی ئۆجەلان، هێشتا تورك نەیتوانی گروپێکی وەك پەکەکە بنبڕبکات. هەرچەند کە ژمارەی گەریلاکان لەنێوان ساڵانی ١٩٩٤ تا ١٩٩٦ بەشێوەیەکی زۆربەرچاو پوکابوونەوەو دواتر ژمارەی تەواوی گەریلاکانی پەکەکە لە نێوان ٥٠٠٠ بۆ ٦٠٠٠گەریلاجێگیرببوون. نیوەی ئەو هێزە چەکدارەی پەکەکە بنکەو بارەگاکانیان لەنێوخاکی تورکیادا جێگیرببوون. لەبەرئەوە دەبوو ئیتر پەکەکە بۆ بەرقەرارکردنەوەی هەیمەنەو هێزی سیاسی خۆی پشت ببەستێت بە هاوسۆزو پشتیوانەکانی لەنێوپارتە سیاسییە کوردییەکەی نێوخۆدا HADEPو لەرێگەی رۆژنامە رۆژانەکەی وانەوە برەو بەچالاکییەکانی خۆی بدات. ناتەوانی دەوڵەت بۆ ریشەکێشکردنی پەکەکەو لاوازکردنی ئەو راستییەی لای نوسەرو بیرمەندو چالاکوانانی کورد سەلماند کە بەڵێ لەتورکیادا گرفتی شوناسو ناسنامەی کورد هەیە نەك گرفتی

---

[297] This section utilizes information primarily from Barkey and Fuller, Turkey's Kurdish; Human Rights Watch, World Report 1998, at http://www.hrw .org/worldreport/; Sabri Sayari, "Turkey's Islamist challenge," Middle East Quarterly (Sept. 1996); Tirman, Spoils of War, 215–229; and Kurdish-focused institute TOSAM's information page, www.tosam.org.

تێرۆریزم. هەر ئەو فشارو رەقیی‌و توندییانەی میریی بوو کە هۆیەکبوون بۆ بەهێزبوون‌و نەسرەوتنی پەکەکە. هەروەك چۆن کە یەکێك لە رۆژنامەنوسەکانی تورك زۆر بە بوێرانە نوسیبووی، کە گرفتی پەکەکە زیاتر گرفتێکی لۆجیکییە نەك گرفتی تێرۆریزم. ئەحمەد ئاڵتانی رۆژنامەنووس لەرۆژنامەی رۆژانەی میلییەت لە نوسینێکیدا کە ساڵی ١٩٩٥ بلاوکرابوویەوە نوسیبووی:"گەر موستەفا کەمال لەبری ئەوەی لەسالۆنیك لەدایك بووایە، لە هەرێمێکی کوردیی (موسڵ) لەدایك بووایە، ئەوا لەجیاتی کۆماری تورکیا، کۆمارێکی کوردیی دروستدەکرد".

بەئاماژە بە ئەفسانەیەك کەدەیانوت کوردەکان تورکی چیایین‌و زمان‌و کەلتوری راستەقینەی خۆیان فەرامۆشکردووە، ئەدی تورك رازی دەبوون گەر کوردەکان بیانوتایە:" چی دەبوو گەر بوترایە کوردەکان تورك نین‌و هەموویان کوردن. لەراستیدا ئەوانەی وابیردەکەنەوە کە تورکن، ئەوە کوردی دەریان". یاخۆگەر بوترایە:" پێویستە شوناس‌و کەلتورو فەرهەنگتان ون کەن‌و لەچوارچێوەی فەرهەنگی کوردیدا بتوێنەوەو رازیبن بە هاولاتی کۆمارێکی کوردیی. دیارە ئەمە لەنەزمی دیموکراسیدا یەکناگرێتەوەو ئەمە دروست ئەو خۆسەپاندنەیە کە ئەمرۆ تورك لەبەرامبەر کوردا جێبەجێی دەکات"[٢٩٨].

ئەحمەد ئاڵتان بەهیوای ئەوە نوسینەکانی بلاودەکردەوە کە بەڵکو جۆرێك لەبیرکردنەوە لەبەرامبەر نەتەوەکان لە تورکیادا بلاوبێتەوە. کەچی بەپێچەوانەوە ئاڵتان دەستگیرکراو دادگایی کرا بەتۆمەتی هێرشکردن بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی تورك‌و زیانگەیاندن بەیەکپارچەیی (یەکێتی خاکی تورکیا بریتیبوو لەو هەولانەی کار لەسەر بندەستکردنی کورد دەکەن) هاوکات لەسەر کارەکەیشی دەرکرا. ئەو رۆژنامانە وابەستەبوون بە میتۆدی میرییەوەو نوسەرانێکیان دەویست کە کاربکەن لەسەر زیاتر بندەستکردن‌و چەوسانەوەی نەتەوەکانی تر.

---

298 Milliyet, April 17, 1995.

ئالکان هاکالۆغلو وەزیری دەوڵەت بۆ کاروباری مافی مرۆڤ بەم شێوەیە لە ڕەوشەکەی دەڕوانی:" هێشتا پەکەکە خەریکی ئەندامگرتن و فراوانبوونە". ناوبراو لەساڵی ١٩٩٥دا ئەندامی مونتەدای سۆسیال دیموکرات بوو لە حکومەتدا. ئەو سەبارەت بەدەستنیشانکردنی هۆکارەکانی پەرەگرتنی پەکەکە دەیگوت:"لێرە پەرێزخستنێکی بەربلاو لەگۆڕێدایە، سەرەڕای مشتومڕو هەوڵەکانی میریی، هێشتا بەرەو پێشچوونی جددی لەمەڕ مافەدیموکراسییەکان ڕوویندداوەد"[٢٩٩].

بەشێك لەو هۆکارانە بەتایبەت لەنێو شەقامی تورکییدا وابەستەبوو بەتێچوونی لەڕادەبەریی جەنگەکانەوە، بەجۆرێك کە لەتوانای حکومەتدا نەبوو ئەو تێچوونە هەڵسوڕێنێت. لەم پێنا وەدا میریی سەرمایەگوزارییەکی ئێجگار زۆری لەدەستدابوو. هاوکات گەشتیاران لەهەر سەردانیکردنێکی تورکیادەسڵەمینەوە، چوون پەکەکە هۆشداری پێشوەختی دابوویە هەموو گەشتیارە غەوارەکان کە خۆیان بەدوور بگرن لەتورکیاو لەوانەبوو لەهەرکاتێکدا تەقینەوە لەنێو ئاپۆراو نێوچە گەشتیارییەکاندا ڕوویدات.

بەمجۆرە وێنەی دەرێی تورکیا کەوتبووە بەر لەکەو عاریی بیانییەکان. هەروەها ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە وا باوبوو بەهێزترین هاوپەیمانیی تورکیەیە، ڕووبەڕووی مشتومڕو بەدگومانییەکی نێوخۆیی ببوویەوە سەبارەت بە فرۆشتنی چەك وچۆڵی سەربازیی و هاریکارییەکانی بۆ تورکیا. کانی خولام وەك چالاکوانێکی کوردی تورکیا ڕاپۆرتگەلێکی پەیوەست بە خراپیی ڕەوشی مافی مرۆڤ و چەوساندنەوەی کورد لەتورکیادا بەهەماهەنگی لەتەك واشنتۆندیسی بڵاوکردەوە. بەمجۆرە لە ساڵی ١٩٩٤ ئەمریکا چاویخشاندەوە بەپەیوەندییەکانداو ١٠٪ هاریکارییەکانی بۆ تورکیا ڕاگرت تا ئەو کاتەی بەدوواداچوونی ورد لەهەمبەر ڕەوشی مافی مرۆڤی ئەو وڵاتەدا بکرێت.

هاوکات لەو میانەدا فرۆشتنی بۆمبی دەستەیی و هەلیکۆپتەری کۆبرا ڕاگیرا. لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵەکانی تورکیا بۆ نزیکتربوونەوەی لە ئەورووپا کەوتە بەر مەترسییەوە، چوون ئەورووپییەکان نیگەرانبوو لە زیندانیکردنی پەرلەمانتارە کوردەکان. بۆ ئەم

---

[299] Reuters, June 9, 1995, quoted in Amnesty International, Turkey: No Se-curity Without Human Rights, 7.

مەبەستە واژۆی سەندیکای پیشەگەرانی تورکیا بۆ ئەورووپادوواخرا، ئەم واژۆیە واچاوەڕواندەکرا لەدیسەمبەری ١٩٩٤دا تەواوبێت. لەهەمانکاتدا ئەنجومەنی ئەورووپ هەڕەشەی هەڵپەساردنی تورکیای کرد گەر بێتو گۆڕان لە نەزمی دیموکراسییدا نەهێنێتە ئاراوە. لێرەوە هەڕەشەی جددی لەسەر وتوێژەکانی بوون بەئەندامی تورکیا لەیەکێتی ئەورووپادا هاتەگۆڕێ. هەروەها توێژی سەرمایەدارو بازرگانانی تورکیا لە ساڵی ١٩٩٥دا ڕاپۆرتگەلێکیان لەسەر ڕەوشەکە بەرزکردەوەو داوایانکردبوو هەرچی زووترە تەشقەڵەی کوردان بێتە چارەسەرکردن‌و لەو پێناوەدا میتۆدێکی نوێ بگیرێتە بەر.

یەك لەو ڕاپۆرتانە داوای کردبوو کە ئەنکەرە پێویستە سود لەئەزموونی ئیسپانیاو ئیتاڵیاو بەریتانیا لەمامەڵەکردن لەتەك کەمایەتییەکاندا وەربگرێت. شتێکی دیکە کە پێشنیازکرابوو بریتی بوو لە ئازادی کەلتوریی‌و فێربوونی زمانی کوردی کەوەك چارەسەرییەکی باش جەختی لەسەرکرابوویەوە[300]. لەڕاستیدا تورکیا ئامادەنەبوو پرسەکە هێند بەجددی وەربگرێت‌و بیروبۆچوونی بوێرو ڕاست گوێ لێبگرێت. لەهەمانکاتدا هەندێ لەگۆڕانکاریی لەپێشچاوگرتبوون، چوون تورکیا یەکێتی گومرگیی ئەورووپای فرە بەلاوە مەبەست بوو. تورکیا چەکی تریشی لەمەڕ نارەزایەتیەکانی ئەورووپا بەکاردەهێنا، لەوانە سەرۆك وەزیرانی تورکیا بەرەشبینییەوەداوای لەئەورووپاکردو گوتی گەر ڕێ لە ڕێککەوتنی بازرگانی بگرن ئەوا بەدڵنیاییەوە وڵاتانی ئیسلامی لەنێوچەکەدا بەهێزدەبن. بەڕێوبەرایەتی ئەمریکایش جەختی لەسەر ئەم هۆشدارییەی تورکیادەکردەوە. ریتشارد هۆڵدبرۆکی یاریدەدەری سکرتێری دەوڵەت بۆ کاروباری ئەورووپا هەموو هەوڵەکانی لەو پێناوەدا خستبووەگەڕ تا تورکیا بتوانێت لەوبارەوە دەنگی پێویست بهێنێت[301]. لەگەڵ ئەوەیشدا تورکیا بۆدەست ڕاگەیشتن بەیەکێتی گومرگی ئەورووپا ئامادەی هەندێك لەگۆڕانکاریی ئیجابی دەبوو. تانسۆچیلەری سەرۆك وەزیران کە تازە بەتازە تێکەڵ بە سەرئێشەی سیاسیی وڵاتەکەی ببوو، ئەوداهاتووی پێگەو ئەزموونی سەرکەوتنی دوساڵی خۆی لەوەدا دەبینییەوە کە ڕێککەوتنی بازگانی بەهێزو تۆکمەبکات. لەم بارەیەوە بایەخەکەی تەنها لەو سۆنگەیەوە بوو. هاوکات فشارو

---

[300] This survey, released in August 1995 by the influential Turkish Union of Chambers and Commodity Exchanges (TOBB), was authored by Dogu Ergil.
[301] Tirman, Spoils of War, 229.

تینی زۆریشی بۆ چالاکوانانی کورد هێنابوو. ئەو بەپێی برگەی هەشتی یاسای دژە تیرۆری ولاتەکەی ١٠٠ نوسەرو چالاکوانو بلاوکەرەوەی کوردی ئاخاندبوویە زیندان. لەم رێگەیەوەدەیەویست پروپاگەندەی جیاخوازیی لەولاتدا نەهێلێتو هۆیەکیش بێت بۆ قازانجی سیاسیی لە پێگەو دەسەلاتیدا.

هەموو ئەوانەی ئەوگرتبوونی خەڵکانی مەدەنیو خوازیارانی ناتوندوتیژ چارەسەرکردنی رەوشی کورد بوون. ئەوێ دەم ٢٠٠٠دۆسییە لەحاڵی کۆڵینەوەدابوون لەدادگاکاندا. وەلێ چێلەر هەوڵی دەدا کارێك بکات کە ورووژێنەرو پڕ هەرا بێت لەمیدیادا. بەشەش هەفتە پێش دەنگدان لەگومرگی ئەوروپادا. چێلەر چەند رێو شوێنێکی سەبارەت بەیاسا توندەکان گۆڕییو ٨٠ کەسی لەزینداندا ئازادکردو داوایشی کرد چاو بەدۆسیەی ئەوانی تردا بخشێنرێت. ئەو لەومیانەدا وانیشانی دەدا کە لەهەوڵی چارەسەریی دۆسیەی کوردیدایەو چەند گۆڕانێکی لەیاسای دژە تیرۆردا کردووە. هەموو ئەم گۆڕانکارییانە لەیاسای دژە تێرۆردا بریتی بوو لە سیمایەکی نەرمو نیانتر لەسیاسەتی پەرێزخستنو پایماڵکردنی سیاسەتوانانو چالاکوانانی تورەو تەیار دژ بە سیستەمی تورکیا.

هێشتا تورکیا چەندین یاسای هێشتبوویەوە بۆدرێژەدان بەسەرکوبی چالاکوانانو بانگەشەکارانی دۆزی کوردو پایماڵکردنی مافی مرۆڤ لەتورکیا. بەکار هێنانی ئەویاسایانە بەردەوام پشت بەستووبوون بە پێداگریی چێلەر بۆگۆڕانکاریی لە یاسای هەشتی دژە تیرۆر. هەموو ئەو یاسایانە هێشتاداکۆکی بوون لە سزادانی ئەو کەسانەی کەلە بواری نوسینو قسەو بانگەشەدا تەحەدای نەزمی سیاسی میریی دەکەن. لەناوەندی کانوونی یەکەم دا ئەوروپا رازی بوو بە هاتنە ناوەوەی تورکیا بۆ ناو یەکێتی گومرگی ئەوروپا. بەلام چێلەر نەیتوانی سەرکەوتووبێتو گەلێ لەگرفتەکانی ولات هەرمابوون. لەوانە خەڵکی کەیفخۆش نەبوون بە رێگەی گەندەڵیو چارەسەرکردنی دامەزراوەگەندەڵەکان. کوردانیش هیچ هەستیان بەچارەسەرکردنی دۆزوگرفتەکانی خۆیان نەدەکرد.دوواجار هەڵبژاردنەکانی کۆتایی دیسەمبەر پارتی رەفای ئیسلامیی کردە پێشەنگی پارتەکانو توانییان ٪٢٠دەنگەکانی ولات بەدەستبهێنن. هاوکات پارتەکەی چیلەر پلەی دووەمی بەدەستهانی کە تێیدا ٪١٩دەنگەکانی مسۆگەرکرد.

HADEP وەك پارتێکی کوردیی لەگۆڕەپانەکەدا نەیتوانی ٪١٠ی کەمترین دەنگی پێویست بەدەستبهێنێت تاوەکو بچێتە نێو پەرلەمانی تورکیاوە. هەرچەندیش کە ئەم پارتە ئەویَ دەم لە باشوری ڕۆژهەلاّتی تورکیادا شوێنی تایبەتی لەنێوجەماوەری کورد دا هەبوو. دیارە کە پارتەکە تەنها توانی ٪٥٠دەنگەکانی باشوری ڕۆژهەلاّت تێیاندا هەیفەنەی هەبێت، بەمجۆرە تەواوی کورسییەکانی چوون بۆ پارتەکانی تر.

پاش ساڵو نیوێك ئیدی سیاسییەکانی شەقامی تورکیاو بیرمەندانی ولاّت ڕوویان کردە هەڵسەنگاندنی پارتی ڕەفای ئیسلامیی، ئەوان مژوڵی ئەوەبوون بزانن ئایا ئەم پارتە کار لەسەر لاوازکردنی پایەکانی دەوڵەتە سیکۆلارەکە دەکات یان نا؟ پاش ئەوەی کەمینە شکستی هێنا لەوەی بتوانێت حکومەت پێکبهێنێت. ئیدی سەرۆکی پارتی ڕەفا، نەجمەدین ئەربەکان توانی لەگەڵ ڕکابەرەدێرینەکەی تانسۆچیلەر یەك حکومەتی پێکەوەیی پێکبهێنن. دیارە کە پارتی ڕەفا لە ڕووی تیۆرییەوە زێدەتر لەباربوو بۆ سوککردنی یاسا توندەکانی سەرشوناسی کورد. چونکە لەنێو پرەنسیپەکانی دەوڵەتی سیکۆلاری ئەتاتورکدا ئەو نەرمی نواندنە نەدەبینرا[302].

بەلاّم بەشێوەیەکی سەرەکی لەبەرئەوەی ئەربەکان کەسێکی ئیسلامگەرا بوو، ئیدی زیاد لە سیاسییەکانی تر لەژێرتین‌و تاوی دامەزراوەی سەربازیدا بوو، لەبەرئەوەدەرفەتی گۆڕانکارییو هەلی ئەنجامدانی هەرشتێك لەبەردەمیدا لەوانەبوو ببێتە هۆی خەشمگینکردنی دامەزراوەی سەربازیی، چوون ئەو لەهەوەڵەوە بەگومانەوە لە ئەدای دەڕوانراو پێیان وابوو لەهەوڵی لاوازکردنی پایەکانی دەوڵەتی سیکۆلاری تورکیادایە.

دواجار لەمانگی دووی ١٩٩٧ لەلایەن ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ژێر هەیمەنەی سەربازانی تورکیا هۆشداری پێدرا تا ڕێوشوێنی پێویست لەبەرامبەر چالاکی ئیسلامگەراکان دابنێت‌و ئازادی زیاتر لە ولاّتدا شوێنبکاتەوە. ئەوەبوو لە مانگی شەشی هەمان ساڵدا بەفشارو تین‌و تاوی سەربازەکان ناچارکرادەست لەکار بکێشێتەوە. پاشان حکومەتێکی ئیئتلافی و پێکهاتوو لەسیَ پارتی سیاسی بە ڕێبەرایەتی مەسعود یەڵماز لەپارتی نیشتیمانی دایك ڕاگەیەنرا. ناوبراو هەر لەدەستپێکی کاریدا ئەوەی نەشاردەوە کە لەبەرامبەر نیگەرانییەکانی کوردا هیچ هەنگاوێکی جیاوازی پیَ نییە. بەمجۆرە

---

[302] See especially the excellent analysis in Barkey and Fuller, Turkey's Kurdish, 99–108.

هاوپەیمانییەکە لە کابینەی نوێدا پرۆتۆکۆڵەکەی خۆیان لەوەدا خستە ڕوو کەگرفتێك بەنێوی گرفتی شوناسی نەتەوەییەوە لەباشووری ڕۆژهەڵاتدا بوونی نییە، بەڵکوگرفتەکە بە سروشتی حاڵ وابەستەیە بە ڕەوشی جوگرافیو ئابووریو کۆمەڵایەتییەوە. هەربۆیە ڕەنگبوو پەڵماز بەهۆی تورەنەکردنی دامەزراوەی سەربازییەوە ئەم شوناسە نەتەوەییەی بەگوتارە نەتەوەییەکانی دابێت، چونکە تازە ئەربەکان بەو پاساوە بەرکەنارکرابوو، وەیا بەو هۆیەوە بوو کەجەنگی گەریلایی پەکەکە لەپوکانەوەدابوو. بەمجۆرە تورکیا لە کۆتایی نەوەدەکاندا دارای نەزمێکی سیاسیی نەگۆڕبوو سەبارەت بەدۆزی کوردو هیچ ئاسۆیەکی گۆڕانکاری لەگۆڕێدا نەبوو. کۆتو بەندە یاساییەکان لەسەر شوناسی کوردیی هەر درێژەیان هەبوو. وەلێ جێبەجێکردنی یاسا توندەکان ئاستەنگی فرەی لەپێشێدا قوتببوویەوە، چونکەجەنگی گەریلایی پەکەکە چاووگوێی کوردانی کردبوویەوە. ئەمەیش نەتەنها هاوسۆزانی پەکەکە بەڵکو چالاکوانانی کوردو خەڵکی کورد بایەخدار ببوون بەشوناسی نەتەوەییانو لەو پێناوەدا بۆشاییەکی گەورە لە نەزمی چالاکییدا بۆ چالاکوانانی کورد چێببوو.

پارتە یاساییەکەی کوردHADEP نەیتوانی بچێتە نێو ئەنجومەنی نەتەوەیی تورکەوە، بەڵام لەهەڵبژاردنە شارەوانییەکانی ١٩٩٩دا پارتەکە توانی زۆرێك لە کورسیی شارەوانییەکانی نێوچەکە بەرێتەوە.دیارە کە ئەم سەرکەوتنە کاریگەرییەکی فرەی لای پارتە کوردییەکە بەرجەستەکردو وەك هێزێکی سەرەکیو کارا لەناوچەکەدا ناسێنرا، ئەوە لەکاتێکدا بوو کە پەکەکە لە سنوورەکەدا توانا سەربازییەکانی بەشێوەیەکی بەرچاو لەدەستدابوو. هەرچەند کە لەنیوەی دووەمی نەوەدەکانەوە دووخاڵ پێویستبوو لەمەیدانەکەدا ڕەچاوبکرێن: ئۆجەلان دەستبەرداری شیکارە ناواقعییەکانی نەببوو لەمەڕ هێزی سەربازی پەکەکەو لاوازیی دەوڵەتی تورکیایش لەڕووی سەربازییەوە بەئاشکرا هەستی پێدەکرا. تەنانەت ئەوە نەدەشارایەوە کە ڕژێم لە لاوازبوونی هێزوو هەرەکەتیدایە، وەلێ تا ئەو کاتیش ئامادەنەبوو هیچگۆڕانێك لە میتۆدی ناواقیعی خۆیدا لەمەڕدۆزی کورد ئەنجامبدات. تەنانەت گەر پەکەکە بیتوانایەدەست بەسەر نێوچەکەشدا بگرێت، ئەوان نەیاندەتوانی ڕووبەڕوویان بوەستن.

### باسی دووەم:

## گەڕان بەدووی ڕێگەیەکی نوێدا (١٩٩٥ ١٩٩٨)

دکتۆر سولەیمان و کوچوك زەکیو نیزیکەی ١٢ گەریلای دیکە لە کۆتایی ١٩٩٥دا کەمپی زاپیان بەرەو سوریا جێهێڵا. لەراستیدا تێپەڕبوون لەسنوور فرە دژوارترو ناسۆرتربوو لەوەی کە پێشبینیکرابوو. چوون سەربازانی سوریا، ئەوانەی زۆرترینجار لەهاموشۆی سنوورەکاندا کەتەرخەمبوون، دەستە گەریلاییەکەیان دابوویە بەر دەسترێژی گوللە، وەلێ ئەوان بەسانایی توانییان لەسنوورەکەدا گوزەربکەن. گەریلاکان بەهیوای ئەوەبوون بتوانن ڕووبەڕوو لەگەڵ ئۆجەلاندا ڕەوشی ناهەمواری سەربازیی پەکەکە تاوتوێ بکەن. بۆماوەی ٥ ساڵ بوو هیچکام لەوانە ئۆجەلانیان ڕووبەڕوو نەدیتبوو، وەلێ ئۆجەلان ئەوەی نەشاردەوە کە ئەو بەهیچ جۆرێك ئامادە نییە ڕێگە بەکەسێك بدات بۆچونێکی جیا لە تێڕوانینی ئەو بخاتە ڕوو.

دکتۆر سولەیمان دەیگوت: "ئەوەی من بینیم ئەو ئاپۆیە نەبوو کە پێشتر بینیبووم". هەروەها دەیگوت: "دەمووچاوی ڕاستەقینەیم زیاتر بینی، ئەو کاتێك پێشوازی دەکردین بەردەوامبوو لەوەی کە دەیوت: ئایا دەبینن، من چۆن بەهێزبووم، گەر ئێوە ئەمڕۆ زیندوون، ئەوا لەسایەی سەری منەوەیە. ئالەم کاتەدا عەلی ك. هاتە لای ئۆجەلان، ئۆجەلان سوێندی بۆخواردین کە ئەم پیاوە هیچ شتێکی باشی تێدانییەو تەوەزەلە. ئیدی کابرا جۆرێك لە پەژموردەیی لەبەرامبەر ئێمەدا گرتی. دیارە ئۆجەلان بەم پەیامەی خەریك بوو بە ئێمە بڵێت کە ئێوە پلەیەکی ترن لەئاستی مندا".

ئەوێ دەم چالاکییە سەرەکییەکانی پەکەکە لەسووریا، لەنێو دوو دیواری بەرزی دوو کەمپی لێواری دیمەشقی پایتەختدا بەڕێوەدەچوون. هەریەك لەو کەمپانە نێزیکەی ٢٠٠ کەسێکی تێدابوو، دەبوو ئەوانە بۆ ساڵێك لەوێدا ڕاهێنانی سیاسیی پەیوەست بە میتۆدی پەکەکە وەربگرن.

یەکێك لەو کەمپانە تایبەت بوو بەو گەریلا کوردانەی کە لە ئێراق‌و سوریاوە ببوونە ئەندامی پەکەکە، ئەویتریشیان تایبەت بوو بە کوردانی تورکیا. کەمپەکان کەم تازۆر هەمان شێوازو شێوەی یەکتر بوون. هەریەك لەوانە بیناگەلێکی تێدابوو کە پەیوەستبوون بە شوێنی خەوی گەریلاکان کە بەشێوەی جیا کچ‌و کورەکان شوێنیان بۆکرابوویەوە، هاوکات گۆرەپانی وەرزشی بالەو تێنس‌و دوگۆڵی‌و حەوزی مەلەوانی تێدابوون. ئەو حەوزانەی هەرگیز پڕ لەئاو نەدەکران، هاوکات وەرزشەکانی پەیوەست بەحەزی ئۆجەلان لەگەڵ باخچەیەکی بەرفراوانیان تێدابوو کە ئۆجەلان لەنێویاندا وانەکانی دەوتەوە. هەریەك لە دکتۆر سولەیمان و کوچوك زەکی کە دەستنیشانکرابوون تا بۆماوەی شەش مانگ یان زیاتر لەوێندەر بمێننەوە. پێیان گوترابوو تا لەکەمپی کوردانی تورکیا دا پرۆگرامی پەروەردەیی بلێینەوە.

دکتۆر سولەیمان دەیگوت: "راهێنانەکان تەنها بریتی بوون لە خوێندنەوەی نوسین‌و شرۆڤەکانی ئۆجەلان‌و گوێگرتن بۆ کاسێتەکانی‌و وتارەکانی". هەروەها دەیگوت: "هەندێك کات ئۆجەلان دەهاتە نێو کۆرسەکان‌و قسەی دەکرد، پاشان پێویست بوو ئێمە دڵنیای بکەینەوە کە هەمووان ئامادەی کۆرسەکە بووین یان نا".

کاتێك رێبەری پەکەکە موحازەرەی دەدا دەبوو هیچ کەس نە پێبکەنێت، نە بپژمێت‌و بکۆکێت، دەبوو هەمووان پابەندبن‌و هۆشداربیان پێدرابوو جددی بن، گەرنا حسابی سەرپێچی‌و نیازی پابەندنەبوونیان بۆ دەکرا. ئەوانەیش کە پرسیارێکیان لا گەلاڵەبووایە، تا ئۆجەلان وەڵامیان بدایەتەوە دەبوو پێش کردنی پرسیارەکە پێیان بەرزبکەنەوەو پاشان پرسیارەکەیان بکەن.

شتێکی دیکە کە فرە نائاسایی بوو، ئەویش ئەوەبوو کە ئەوانە لەپاش پرسیارەکانیان، ئاماژەیان بۆنەدەکرا دابنیشنەوە، ئیتر دەبوو بەپێوەبن تا ئۆجەلان موحازەرەکەی تەواو بکات، کە جاری واهەبوو یەکبین شەش بۆ حەوت سەعات قسانی دەکرد.

نەوال گەریلای دێرینی پەکەکە دەیوت: "هەموو ئەم رێوشوێنانە لەپێش دەستدا روونکرابوونەوە". ناوبراو ساڵی ١٩٩٥ بانگهێشتکرابوو بۆ دیمەشق تا راپۆرتی خۆی لەمەڕ ژنانی نێو کۆنگرە بگەیەنێتە ئۆجەلان لە هەمان ساڵدا. پاش ئەوەی لەدەستپێکی قسەکانی ئۆجەلاندا، نەوال قسەی کرد، ئۆجەلان پێداگریی کرد کە ئەو دیسان دابنیشێتەوە، بەڵام نەوال واحاڵی بوو کە ئۆجەلان رەفزی قسەکانی دەکات. نەوال بۆخۆی بەم جۆرە رەوشەکەی گێڕایەوە: "بەردەوامبووم لە وتنی نەخێر نەخێرو وتم هەڵدەستمەوەو ئەویش وەڵامی دامەوەو وتی تۆ جارێ گەنجیت. ئیدی بۆماوەی ٧ کاتژمێر بەپێوە هێشتمیەوە".

دیارە کە وانەکانی ئۆجەلان وەك فرسەتێك لێکدرابوونەوە تا گەریلاکان لە ئۆجەلان زیاتر تێ بگەن، بە روانگەی وانیش تێگەیشتن لە ئۆجەلان دروست تێگەیشتنبوو لەپەکەکە. ئۆجەلان وتاربێژێکی ماندوو نەناس بوو، فرە جار کاردانەوە مێژووییەکانو یادەوەری منداڵیو مێژووی پەکەکەی پێکەوە ئاوێتە دەکرد. ئۆجەلان فرە بەباشی نێوی خەڵکەکەی لەبەردەکردو دەیوتنەوەو بەهرەیەکی باشی لە سۆراخی بنجو بنەوانو ژیانی ئەو کەسانە دەکرد، ئەمە دووای ئەوەی پێوەندییان دەکرد بەپەکەکەوە. ئەو لە موحازەرەکانیدا ژیانو ئەزموونی خۆی دەهۆنییەوەو دەیکردە ئاماژەی ئامانجەکانی. گەریلاکان زۆرجار ئاماژەیان بەوە دەکرد کە لەمیانی ئامادەبوونیان لە پرۆگرامو میتۆدی کەمپەکاندا هەستی ئازایەتیو وروژاندنیان لەلا بەرجەستە دەبوو و هەستیان دەکرد بیرو هزریان جوڵاوەو جیهانبینیان کراوەتر بووە. وەلێ نەوال بە بیستنی وتارەکانی ئۆجەلان ناگەهان دوچاری رەوشێکی سەیر ئامێزدەبوو.

ناوبراو بەم جۆرە زیاتر هەستی خۆی لەبارەی ئۆجەلان شرۆڤەدەکرد:

ئۆجەلان دەیتوانی بۆ ٣ تا٤ کاتژمێر بەبێ وەستان قسە بکات. ئەو باسی زەمەنی زارۆیی خۆی دەکرد، باسی ئەوەی دەکرد چۆن وەك کوڕێك پاسەوانی میوەی باخچەکەیان بووە. پاش تەواو بوونی موحازەرەکەیشی، ئیدی بەدەوریدا ئاپۆرەیان دەبەستو راڤەی ئەو شتانەیان دەکرد. ئەو وەختێ لەبارەی باخچەیەك قسان دەکات،

قسەکردنێکی واقعییە دەربارەی سۆشیالیزم. بەنیسبەت منەوە، واتێگەیشتم، ئەو لەقسەکردندابوو لەبارەی باخچەیەك. وابیرم دەکردەوە کە هەموان تێگەیشتوون، وەلێ من نەمتوانیوە ئاشنابم بەوە کە هەڵەکە لەچیدایە. نەکەسێکی گەمژەبوومو نەیش بەکرێگیراو بووم. لە کۆتایدا بڕیارمدا هەڵەکە لەودابوو. هەموو ئەوانی تر خۆیان فریودەدا، وایان نیشان دەدا تێگەیشتوونو هیچیش حاڵی نەببوون. هەربۆیە بڕیارمدا لە کۆتا ترین ماوەدا بگەڕێمەوە بۆ شاخو بۆ نێو جەنگەکانو لەو بگرەو بەردەیەی هزرو گرێدەرونیانە رزگارمبێت.

ئەو ئەنجامگیرییە بۆ نەوال چەند مانگێکی کەمی خایاند. ئەو زانی کە ناتوانێت ئەمە بەهەرکەسێکی تر بڵێت. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەوەی ئەوی هاندا بۆ بەدوواداچوونو چاودێریی خەباتو نەبەردیی پەکەکە تەنها لەپێناو خاکی کورداندابوو نەك لەپێناو رێبەری پەکەکە. نەوال لەم بارەیەوە دەیگوت:"ئۆجەلان رێبەری فەرمی پەکەکە بوو، رێگەدرابوو بەو رێبەر بێت. ئەوەی بەلای منەوە گرنگبوو خەباتکردنو جەنگان بوو، ئەوە ئەو شتە بوو کە پێویست بوو من ئەنجامی بدەم".

ئەم تێڕوانینەی، کە پێی وابوو جەنگی پەکەکە گرنگتربوو لە رێبەرایەتی ئۆجەلان. بەشێوەیەکی فرە بەرچاو لەنیوەی دووەمی نەوەدەکانەوە پەرەی گرت. بەتایبەتی لەنێو فەرماندەو بەرپرسە شۆڕشگێڕەکانی پەکەکەدا. ئەوان باش دەیانزانی کە کۆڵینەوەو راڤەکانی ئۆجەلان گرفتو کێشەن. وەلێ رێگەی تر نەبوو. سولەیمانو کوچوك زەکی هاتبوونە دیمەشق تا ڕوانگەی ئۆجەلان لەمەڕ تاکتیکی سەربازیو نەزمی نەبەردییەکان بگۆڕن، بەڵام بەچەند مانگێك مانەوە لەوێدا ئەو راستیەیان لاگەڵاڵە بوو کە گۆڕانکاریی لە هزری ئۆجەلاندا شتێکی ئەستەمو سەختە.

دکتۆر سولەیمان دەیگوت:"پێمان دەگوت کە گەریلاکان ناتوانن خۆراکی پێویستیان چنگ بکەوێت، وەلێ ئەو ملی بۆ ئەو راستییە نەدەداو ئامادە نەبوو گوێ لە قسەگەلێکی وەها بگرێت".

هەروەها دەیگوت:"کەسێك زاتی ئەوەی نەبوو رەوشە راستەقینەکە بۆ ئەو نومایان بکات". سەرەرای ئەوەیش ئۆجەلان داوای بەستنی کۆنفرانسێکی تری دەکرد لە دەستپێکی ١٩٩٦دا. مەبەستیشی لەم کۆنگرەیە راگەیاندنی دەستپێکی نوێو قۆناغێکی نوێ بوو بۆ داهاتووی نەبەردییەکان.

سەرکردە مەیدانییەکانی پەکەکە دیسان هەوڵیان دەدا لەم کۆنفرانسەدا بۆچوونەکانی خۆیان لەرووی نەزمی رەخنەو گازاندەیان لە رەوشی جەنگەکانەوە بخەنەوە ڕوو.

کوچوك زەکی دەیگوت:"سنورەکان تەنها بۆ رەخنەگرتن لە کەسایەتی ئەو نەبوون". ئۆجەلان لەوەدا ملی نەدەدا که گوایا جەنگ گەریلاکانی گەڕاندبێتە دوواوەو بەزیانی وان شکابێتەوە، لەجیاتی ئەوە ئۆجەلان پێداگریی لەوەکرد کە بارەگای یەکەی سەربازیی فراوان لەچیاکاندا دامەزرێنن‌و سەنگەر لێبدەن‌و چاوەڕێبکەن تا دوژمن هەڵبکوتێتە سەریان‌و پاشان بەڕوویاندا هەڵشاخێن".

کوچوك زەکی لە بارەی ئاکامی کۆبوونەوەکەوە هەڵوێستەی دەکردوو دەیگوت : "ئێمە بڕوامان وابوو ئەم کۆبوونەوە هیچی لێسەوز نابێت‌و ئەستەمە روانگەی ئۆجەلان گۆڕانکاری بەسەردا بێت".

## کەسێك هەوڵی کوشتنی ئۆجەلان دەدات

لە ئەپرێلی ١٩٩٦ دا کوچوك زەکی لە کەمپی کوردانی تورکیا دا دانیشتبوو، ئەو مژوڵی نوسینەوەی کاری کۆنفرانس بوو، لەپڕ گوێبیستی تەقینەوەی بۆمبێك بوو لەنێو دەروازەی هاتنەناوەوەی کەمپەکەدا. تەقینەوەکە هیچ زیانێکی بەدوودا نەهات. تەنها لەسەر رێگەکەدا هێندەی چاڵاوێك چاڵی دروستکردبوو. راستەوخۆ ئۆجەلان ئەوەی بەپلانێکی دەست کیسەی تورکیا لەقەڵەمدا، بەڵام گەر وایش بێتن ئەوە پلانێکی فرە لاواز دارێژراو دەهاتە پێشچاو.

دیارە کە هەوڵی تەقینەوەو کوشتنی ئۆجەلان و هەر گەریلایەکی تر لەو کەمپانە دا ئێجگار لاواز بوو، چوونکە ئۆجەلان فرە بەکەمی بەشەواندا دەردەکەوت یاخۆ دیواری

کەمپەکان زۆر پارێزەرو پتەو و دوور لەهەر زیانێکی دەرەکی بوون. هەوڵێکی لەو جۆرە کەدرا زیاتر بۆنی دەستکیسەی دەزگای موخابەراتی سوریی دەداو وەك هۆشدارییەك بوو تا ئۆجەلان لەسەر خەتو رامیاری سوریا بهێڵێتەوە. هەرچەند کە تەقینەوەکە زیاتر لە سودو بەرژەوەندی ئۆجەلاندا شکایەوە.

کوچوك زەکی دەیگوت:"پاش رووداوەکە ئۆجەلان هاتو پێی گوتین، تەماشاکەن، ئێوە نەتانتوانی فەرمانەکانم جێبەجێبکەن، گەرواتان بکردایە، چلۆن میریی دەتوانێ کارێکی لەو جۆرە دەرهەق بە من بکات". هەروەها دەیگوت:"ئۆجەلان سەیری دەوروبەری خۆی دەکردو ئەو قسانەی دەکردن( یانی های دیوار گوێبگرەو پاسار لەگەڵ تۆمە)".

کوچوك زەکی و دکتۆر سولەیمان وەك خوێندکارێکی لاوی زانکۆیی پێوەندیان کردبوو بەپەکەکەوەو تامەزرۆی بەشداریکردن بوون لەخەباتی نەتەوەیی دا. بۆیە پاش ٤ ساڵ ئەوانە بوونە فەرماندەی بەئەزموون‌و دیاری کایەی جەنگە گەریلاییەکە. وەلێ ئەوان لەو مەیدانەدا تەنها لە گوللەی سەربازانی تورك قوتار نەبببوون. بەڵکوو کەوتبوونە بەر نەشتەری موئامەرەو رق‌و گومانی گەریلاکانی تری پەکەکەوەو دەخوازرا لەلایەن خودی پەکەکەوە لەسێدارە بدرێن. ئەوان پاش شەش مانگ مانەوەیان لەلای ئۆجەلان ئیتر تێگەیشتن کە پەکەکە لە چ مەئزەقێکدا بوو. کوچوك زەکی دەیگوت:"ئۆجەلان بۆخۆی دەچووە سەر شاشەی مێد تی ڤی و هەموو شتێکی دەوتو قسەی بۆ Ozgur Gundem دەکرد، ئەو رۆژنامە کوردیەی کە لە تورکیادا دەردەچوو. قسەکانی دەربارەی هەموو شت بوون‌و لەهەموو شتێك دەدوا کە خەریکی ئەنجامدانی بوو. ئەو وابیری دەکردەوە کە هەموو ئەو شتانەی ئەنجامی دەدات دروستو بێ هەڵەو پەڵەن، لەکاتێکدا وەهایش نەبوو".

هەر لە هاوینی ئەو ساڵەدا کوچوك زەکی ئەوێی جێهێڵاو گەڕایەوە بۆ نێو تورکیا. سەبارەت بەوقۆناغە بارودۆخەکەی بەم شێوازە شرۆڤە دەکرد:

نەمدەویست لەپەكەكە دوور بكەومەوە، وەلێ باشترین رێگە بۆ من دووركەوتنەوەم بوو لە ئۆجەلان. لەسەرەتادا چوومە زابو پاشان لە مانگی شەشدا چوومە سنووری كوكوركا. ئەوكات لەگەڵ نێزیكەی ٧٠ كەسێكدا دەربازی سنوور بووم، ٧٠ دیكەیش لە شوێنێكی دیكەوە پەڕینەوە. ئەوە لەكاتێكدا بوو كە پێكدادانەكان هەڵگیرسابوون. ئێمە برسیو تینوو بووینو دارای هیچ شتێك نەبووین. وەك ئەوەی لەسنوورەكەدا بۆخۆم دەربازبووم، تێكڕای رەوشەكەم بەچاوی خۆم دی. بەجۆرێك لەبۆتان بۆ ماوەی ٣ مانگ گەریلاكان نەیانتوانی نان ببینن، لەكارزانیش بەهەمان شێوە، لەشوێنەكانی تریش خەڵكەكە گەر چەند سەر مەڕێكیشی هەبووایە ئەوا دەیانبردن بۆ گوند پارێزەكانی سەر بەمیریی.

بەمجۆرە شتەكان بەرەو خراپی دەچوون. چونكە چۆڵبوونی ئاواییەكان مانای وابوو ئیدی گەریلاكان دەستیان نەدەگەیشت بە هیچ جۆرە پێوەندییەك لەگەڵ خەڵكیداو نەیاندەتوانی ئازوقەو خۆراك چنگبخەن بۆ خەباتو جەنگە تولانییەكەیان.

پێڕەكەی كوچوك زەكی لە هەرێمی ئەرزڕۆمدا بنكەو بارەگایان خستبوو. ئەوان لەرێگەی باترییەوە تاڕادەیەك پێوەندییە بێ سیمەكانیان پاراستبوو، وەلێ بۆ هاموشۆو گەڕان تەنانەت پێڵاوی پێویستیان نەبوو، گەر ئەوەی هەیان بووایە بدڕایە یان بڕزایە ئیدی نەیانبوو تا پێڵاوێكی تر شوێنیان بگرێتەوە. هاوكات كۆگاكانی داو و دەرمانیان هەموو تەواو ببوو. هەندێك كات كە كوچوك زەكی پێوەندیی بەسەركردایەتییەوە دەكرد لە زاب دا، لەباكووری ئێراق، هەوڵی دەدا تێیان بگەیەنێت كە چ گرفتێك لە گۆڕێدایە، چوون لەوێ رەوشەكەیان هێمنتربوو، بەسانایی دەیانتوانی كۆگاو مەخزەنەكانیان تێر رابگرن. كەچی ئەوان وەها وەڵامیان دەدانەوە كە هەوڵەكانیان چڕتر بكەنو زیاتر كاروانەكانی سوپای توركیا بخەنە مەتەرێزو مەیدانی جەنگەكانی خۆیانەوە. ئیتر بەوجۆرە دەستكەوتو تفاقی خۆیان دابین بكەن.

كوچوك زەكی دەیگوت: "ئێمە موشەكو ساروخمان نەبوو، دارای هێزی پێویستیش نەبووین". لەوەیش خراپتر ئەوەبوو كە خەڵكی نێوچەكەیش دەستیان دابوویە بۆڵەو

نارەزایی، ئەوان نامەیان ئاراستەی فەرماندەکانی گەریلاکردبوو لەشاخێداو پرسیاری ئەوەیانکردبوو لێیان، کە تاکەی ئەم رەوشە بەردەوام دەبێت؟ چوون هەروەك چۆن ئەرتەشی تورکیایش خەڵکەکەیان چروستاندبوویەوە، گەریلاکانیش خەڵکیان تەنگەتاو کردبوو.

دکتۆر سولەیمان دەیگوت: "هێرشی لەناکاو لەگۆرێدابوو، ئێمە پێویستبوو بەرگری لەخۆمان بکەین". ناوبراو ئەوکات گەرابوویەوە بۆ هەرێمی ئامەد. زیاتر لەو بارەیەوە دەدواو دەیگوت: "بەڵێ چەند پێکدادانێك روویان دا، وەك هەمیشە ئێمە تێماندەسرەواندن‌و خۆمان قوتاردەکرد، ئیدی ئەوە موبادەرەی ئێمەبوو". گەریلاکانی پەکەکە لەنێوخۆیاندا لەکێشمەکێشی ئەوەدابوون، کە پێویستە چی بکەن. کوچوك زەکی دەیوت: "پرسیارەکە ئەوە بوو کە ئەوە کێیە دەتوانێت زەنگەکە بخاتە ملی ". ئەو بەهێنانەوەی ئەو پەندە دێرینە دەیویست بڵێت ئەوە کێیە کە زاتی ئەوەی هەیە راستییەکان لای ئۆجەلان بخاتە روو، دەیەویست بەخەڵکەکە بڵێت ئەوەی کە روودەدات لەئەستۆی من دا نییە، من تەنانەت بەهاتنی ۱۹۹۸ ئیدی بۆخۆیشم کارەکانم لا سەختببوون، خەڵکیش لەدژواریدابوون‌و بەدەست میرییەوە دەیانناڵاند.

## نۆبەتی شەمدین ساکیك

کەرەتێکیان نەوال پێشنیازی ئەوەی کرد کە گەریلاکان پێویستییان بە ۳ شت هەیە تا لەو رەوشەدا رزگاربن: خوێن سەردیی، چونکە ئەوە پێویستبوو تا بتوانن بەئارامی لەژێر رەحمەتی ئاگرو بۆمبەکاندا خۆرابگرن. بەخت، لەبەر ئەوەی هەندێك کات ئەوە تەنها شتێکە کە لە کوشتن رزگارت دەکات. توانای جەستەیی، ئەوەیش بۆ پیادەرەوی بەنێو کەندەلان‌و چیا دژوارەکانی کوردستان هەمیشە ئاتاجیان پێی هەبوو.

وەلێ ئەوان تەنها یەك شتیان هەبوو، ئەوەی نەوال ئاماژەی پێنەدابوو. ئەویش ئەوەبوو کە ئۆجەلان لەوە دڵنیابکەنەوە کە شتێکیان نەکردووە پێچەوانەی فەرمانەکانی ئەوە. ئەوە راستییەك بوو کە هەموو کەسێك لەنێو پەکەکەدا دەرکی پێکردبوو. هەر لە

نوێترین گەریلاوە تا مەزنترین فەرماندەی بەئەزموونی نێو پەکەکە. بۆنموونە دکتۆر سولەیمان کە لە ساڵی ۱۹۹۶ دا بەتەواوی گازەندەو رەخنەکان زۆریان بۆ هێنابوو، ئەو نیگەران بوو لە رەوشی رێگە جەنگیەکەی ئۆجەلان، وەلێ فرە وریاو هۆشیاربوو لەهەمبەر ئەوپرسەی کە چۆن‌و بەچ شێوەیەك ئەو نیگەرانیەی بۆ ئۆجەلان دەربېڕێت. ئەو دەیوت: "گەر تۆ بە ئازادانە قسەبکەیت، ئەوا یان دەردەکرێیت یان دەکوژرێیت".

کوچوك زەکی، کە هاوڕێ‌و فەرماندەیەکی نێزیك بە هەرێمەکەی سولەیمان بوو، دەیزانی کە سولەیمان چەند دوور رۆیشتبوو تا ئۆجەلان بەوە رازیبکات، وەك پێویستییەکی هەنوکەیی. پێویستە گۆڕان لە تاکتیکی چەکداریدا بکەن.

کوچوك زەکی دەیگوت:"جۆرێك لەدەرفەتی دابوومێ بۆ قسەکردنن وەلێ سنووری دانابوو. دەمزانی سنوورەکە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە رەخنەی شەخسی لێنەگرم".

باتوفاش بەهەمان شێوە، ئەو وەختێ پێوەندیی کرد بەپەکەکەوە لەساڵەی ۱۹۹۳دا قوتابییەکی ئامادەیی تەمەن ۱۵ ساڵ بوو. ئەو زۆر بەپەلە بڕیاری خۆی داو پێگەیشت، وەلێ ئەویش هیچ رێگەیەکی پێنەدەدرا. لیستێك نێو هەبوون کە لەهەوڵداندابوون تا لەو رەوشە قوتاربن، ئەوانە نێویان بەوە زڕابوو کە پێوەندی سێکسییان لەتەك رەگەزی بەرامبەر هەیە، یاخۆ بەجۆرێك لەجۆرەکان کەوتبوونە بەر خەشمی فەرماندەیەکی سەربازییەوە. یان هەبوو دوورخرابوویەوە. فەرماندەکان بەئاشکرا دەیانوت ناردوومانە بۆ پاریس. باتوفا دەیوت: "مەبەستیان لەوە ئەوەبوو کە کشتوومانە".

وەلێ لەهەندێك ئاماژەدا، بەئەزموونترین فەرماندەی سەربازی پەکەکە، شەمدین ساکیك فەرامۆشی ئەو خاڵەی کردبوو، ناوبراو پیاوێکی هەژارو شەرمن‌و هێمن بوو، ساڵی ۱۹۷۹ بۆ یەکەمجار پێوەندیی کردبوو بەرێزەکانی پەکەکەوە. بۆخۆی دەڵێت کە پاش ئەوەی داوای لەبابی کردووە پارەی پێبدات تا ژیانی هاوسەرگیریی پێکەوەنێت، بابیشی داواکەی داوەتە دوواوە، ئیدی یاخی دەبێت‌و روولەشاخ دەنێت. ئەو لەچەندین پێکداداان‌و رووداوی خوێناویدا قوتاربیوو، بۆنموونە اەهەموو ئەوجەنگانەی ئەرتەشی تورك

رووبەڕووی کردبوونەوە[٣٠٣] و هاوکات لە پلانو دەسیسەگەلێکی سیاسیی‌و نێوخۆیی خودی ئۆجەلان رزگاری ببوو. ئەو پلانو پەلپانەی کە ئۆجەلان بۆ بەهێزکردنی هەیمەنەی خۆی بە شۆڕشگێڕو فەرماندە سەربازییەکانی دەگێڕا. هەروەها لەو گومانو وەسوەسانەی پەکەکەیش خۆی پەڕاندبوویەوە کە زۆرجار گەریلاکانی تر بەهۆیەوە هەڵدەهاتنو پەراوێزدەخران یاخۆ لەنێودەبران.

نێوبراو توانیبووی لەو هەرێمەی کە تێیدا بالادەستو فەرماندەیە تۆڕێکی بەهێزی لۆجستیکی دروستبکات، هاوکات هێزێکی مەزنی گەریلایی‌و شەرکەری پێکەوەنابوو. ئەو توانیبووی خۆی بسەلمێنێت، ئەمەیش نە لەڕێگەی ئازایەتی‌و توانایەوە، بەڵکو لەڕێگەی شانس‌و ئیقباڵ‌و دەرفەتەوە کە بۆی رەخسابوو. ساکیك ببوویە رەمزێکی جەنگە گەریلاییەکەو پێگەیەکی جەماوەریی سەنگینی هەبوو لەباشووری رۆژهەلاتی تورکیادا. ئەو بەنازناوی شەمۆ ناسرابوو. ئەوە ناوێکی کەمێك خودسەرو خۆشەویستو بەڕێزبوو لەنێو ئەندامانی خانەوادەکاندا. ساکیك، لەنێوەندی نەوەدەکانداو بەلایەنی کەمەوە لەو دەساڵەی خەباتی چەکداریدا، وەك تەواوی فەرماندە سەربازییەکانی تر بەتەواوی نائومێدببوو لەبەرامبەر نەزمی چارەسەریی سەربازی بۆ پرسی کورد. ناوبراو دوواجار خەشمو قینی بەسەر چوار لەئەندامە بالاکانی پەکەکەدا ڕشت، ئەوان فەرماندەی ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکانی پەکەکەبوون لەناوچەکەدا. ئەوەبوو لەماوەی بەستنی کۆنفرانسی زابی ١٩٩٥ دا، ساکیك بەتەواوی لایەنگرانی خۆیشی توشی شۆك‌و سەرسوڕمانکرد. دکتۆر سولەیمان بەم جۆرە وتەکانی ساکیکی دەگێڕایەوە: "ساکیك هەستایە سەرپێ‌و سەرزەنشتی فەرماندە بالاکانی هامکاریی ئۆجەلانی کرد. لەوانە دوران

---

[303] This retelling of Sakik's history in the PKK relies on interviews with PKK militants who knew him and draws on Celik, Agri, 116– 117, 399 – 409; also useful were the diaries of two militants: Ersoz, Gurbet'in Guncesi and Zinarin'in Guncesi.

قالْقان‌و موراد قەرەیلان‌و  موستەفا قەرەسو و خەلیل ئاتاج(جەبو بەکر). بەبیٚ پەردە پێی گوتن کە ئاشنا بەجەنگی گەریلایی نین. دووا تر بە ساکیکم وت، ئەوە تۆ خەریکی چی دەڵێیت؟ کێشەکە پەیوەندیدار نییە بەو کەسانەوە، گەر جەنگەکە بەنەزمێکی خراپ بەڕێوە دەچێت، ئەوە هەڵەی ئەوان نییە. ئەوە هەمووی لەگەردنی ئاپۆدایە. بەهەرحاڵ ئەو گردبوونەوەیە کۆتایی ساکیك بوو. چوونکە ئەو بەڕاشکاوانە قسەی کردوو چەند کەسێکی بەتۆمەت دەستنیشانکرد.دەبوو چی رووبدات؟ ئەوکەسانە راپۆرتێکیان بۆ ئۆجەلان بەرزکردەوەو نوسیان کە ساکیك گەرەکیەتی دەستبگرێت بەسەر رێکخراوەکەدا".

ئۆجەلان شارەزابوو لەخەملاندنی هەڕەشەکاندا، هەروەکچۆن باشتر دەیتوانی هەڕەشەگەلێك ئاڕاستەبکات. ئەو تاکتیکی دەگرتە بەر تا بیانووی هەبێت بۆ پەرێزخست‌و پاکبوونەوە لەکەسێك کە بە موزاحمی دەبینی. بەتایبەتی لەو تاکتیکانەدا کاری دەکرد دژ بە فەرماندە سەربازییەکان. بەسانایی دەیتوانی بەتێرۆریست بیاندات لەقەڵەم‌و لەنێویانبەرێت، بیانوو زۆربوون تا تێیانبگلێنێت لەپرسی دەستبردن بۆ رێبەرایەتییەکەی. جیا لەوەیش رەوشێکی دەهێنایە گۆڕیٚ کە خودی هەڵسوکەوتی کەسەکە دەبووە هۆی سزادان‌و لەنێوبردنی. لەوانەیە دیارترینی ئەوانە گێچەڵگێڕانبێت بەخودی براکەی خۆی کە عوسمان ئۆجەلان بوو. ئەو بۆ نیشاندانی ئەمەك‌و وەفاداریی خۆی، هەوڵی خۆی لەچارەسەریی ئەو جەنگەدا خستبووە گەڕ، کە ئەرتەشی تورکیا بەهاوکاری کوردانی ئێراق ساڵی ١٩٩٢ دژ بە پەکەکە دەستیان دابوویە. ئۆجەلان براکەی خۆی تاوانبارکرد بە دەستبردن بۆ چارەسەرییەکی هەڵەو ئاگربەستێکی هەڵە لەبەڕێوەچوونی دانوستانەکاندا. ئەوە لەکاتێکدا بوو کە براکەی بەرپرسایەتی کارێکی گرنگی گرتبووە ئەستۆ. وەلیٚ بەپێچەوانەی پاداشتەوە بڕیاردرا کۆنفرانسێکی تەواو ببەسترێت تا بتوانن هەڵە و کورتییەکانی براکەی دەستنیشانبکەن[٣٠٤]. دیارە ئامانج لەمە

[304] Osman Ocalan's problems were discussed at the 5th Congress, see PKK . Kongre Kararlari, 271–274. Former PKK militants described Osman's flight.

ئەوەبوو تا متمانەو بڕوابوون بە عوسمان ئۆجەلان دامالّن، چونکە پاش ئەو رووداوە عوسمان بە نائومێدیی هەڵهاتبوو بۆ ئێران. دوواتر ناچارکرابوو بەتۆبزی لەلایەن ئەندامانی پەکەکەوە بگەڕێتەوە و لێپێچینەوەی لەتەك بکرێت. کەواتە گەڕانەوەی عوسمان بەتۆپزیی بوو نەك بە دەربڕینی دڵسۆزیو دلگەرمی خۆی بۆ گروپەکە. دووا بەدووای ئەوە عوسمان ئۆجەلان رووبەڕووی سزای لەسێدارەدان بوویەوە، دیارە ئەو سزایە کە بڕیاری لەسەردرا بەهۆی ئەو تۆمەتە نادیارو تەمومژاویانەوە بوو کە لەبەرامبەر نادڵسۆزبوونو غەیابنوونی بۆ پارتەکەی نواندبووی. بەلاّم عوسمان توانی خۆی لەتۆمەتەکانی ببوێرێتو قوتاربێت. ئەویش پاش ئەو خۆزەلیلکردنو خۆتەسلیمکردنە هات کە لە دوتوێی بلاّوکراوەیەکی ١٠٦ پەڕەییدا هەڵەی خۆی بەرامبەر بە پارتەکەی پیشاندابوو. عوسمان ئۆجەلان پاش ئەوە لەکۆنگرەی پێنجەمی ١٩٩٥دا داوای لێبوردنی بۆ دەرکرا. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو بۆماوەیەکی کەم لە پۆستو پلەکەی دوورخرایەوەو پەراوێزخرا، ئیدی بەلەبەرچاوگرتنی پێوەندییەکانی لەتەك رێبەری پارتەکەدا و بەرگریلێکردنی، هەرزوو لەساڵی ١٩٩٦دا گەڕێنرایەوە بۆ پێگەکەی پێشووتریو کرایە بەرپرسی کەمپی هاکورك.

## کەوتنی ساکیك

ئیدی نۆبەتی ساکیك هاتبوو، لەسەرەتاوە ئۆجەلان ستایشی ئەوی کرد وەك فەرماندەیەکی بەئەزموونو چەلەنگ. دووابەدووای کۆنفرانسی زاب لەساڵی ١٩٩٥دا، ساکیك نێردرایە نێو ئەنجومەنێکی جێبەجێکاریی سێ کەسییەوە. ئەوان وادەستنیشانکرابوون کە بەرپرسی چالاکییە سەربازییەکانی بارەگای سەرکردایەتی زاب بن. ئەندامانی ئەنجومەنە تەنفیزییەکە بەبەردەوامی لە کێشمەکێشدابوون. لەو ئەنجومەنەدا نەوال بەرپرسی چالاکییەکانی ژنان بوو. ئەو نەیدەتوانی شان بدات لەشانی ساکیك، ساکیك پێی وابوو کە ئەزموونە مەیدانییە بەربلاّوەکەی قسەی هەوەڵو کۆتایی دەداتە پاڵ خۆی. سێهەم ئەندامی ئەنجومەنەکە عەلی حەیدەر(فوئاد قەیتان) بوو. ئەو

هیچ ئەزموونێکی مەیدانی نەبوو، وەلێ بۆ ماوەیەکی درێژبوو کە کەسێکی جێ متمانەوە دڵسۆزی ئۆجەلان بوو. ئەویش بەهەمان شێوە لە رقەبەرایەتیدا بوو لەگەڵ ساکیکدا. بەشێك لە گرفتەکان لەوەوە سەرچاوەیان گرتبوو کە دەسەلاتی ئەنجومەنەکە رۆشن نەکرابوویەوە، ئۆجەلان بۆخۆی بەدەستی ئەنقەستو بەو جۆرە ئەنجومەنەکەی بارهانی بوو. هەربۆیە ئەم کێشمە کێشە هەموو کارەکانی ئەنجومەنەکەی بەهەڵپەسراوی دەهێشتەوەو ناچار ئەندامەکانی ئەنجومەنیش بۆ شەفاعەت و چارەسەر روویان لە ئۆجەلان دەنا.

نەوال دەیگوت:"هەموو رۆژێك بەتەلەفۆن قسەمان لەتەك ئۆجەلان دەکرد، بەردەوام باسمان لەگرفتەکانمان دەکرد بۆی". لەزمستانی ١٩٩٥، ١٩٩٦ دا دژوارترین بارودۆخ روو بەرووی گەریلاکان ببوویەوە، نێزیکەی ٥٠٠ شۆڕگێڕ جگە لەچاوەڕوانی دەرێ هەروا بەدەستبەتاڵی مابوونەوە. نەوال دەیگوت: " زۆر ساردبوو. لەئەشکەوتەکاندا مابووینەوە، هەندێك کات هێند سەرماو سۆڵەبوو نەماندەتوانی قسانیش بکەین". هەروەها دەیگوت: "ئێمە هەر شۆربای نیسکمان دەخوارد، نەسەوزە هەبوو نەمیوە. ساکیك دەیەویست ئێمەیش وەك گەریلاکانی نێو تورکیە بژین، ئەو تەنانەت نەیدەهێلا سۆپاکانیش داگیرسێنین تا خێوەتەکان یان ئەشکەوتەکان گەرمکەنەوە". ناوبراو بەدەم گێڕانەوە سەری نەفرەتی دەلەقاندو دەیوت: "هەرچۆنێك بێت گوزەراندمان".

زۆری نەکێشا پێوەندییەکانی نێوان سێ ئەندامەکەی ئەنجومەن بەتەواوی تێکچوو. لە لۆجیکی پەکەکەدا، جێبەجێنەکردنی بەرپرسایەتییەکان وەك خۆی، ئاماژە بوو بۆ نەبوونی دڵسۆزی پێویست بۆ پەکەکە یاخۆ ئاماژەیەك بوو بۆ غەیانبوون بە پرسی پەکەکەو میتۆدی رێکخراوەکە. لە نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٩٦دا هەرسێکیان خرانە ژێر پرسو جۆو لێپێچینەوەوە. تەنانەت چەکەکانیشیان لێسەندنەوە، هاوکات خراپترین سوکایەتیی بە ساکیك لەوەدا خۆی بینیەوە کە فەرمانی پێکرا ببرێتەوە بەرەو دیمەشق. ئیدی پێویستبوو ساکیك وەك نەوال راپۆرتێکی تێروتەسەلی رەخنە ئامێز لەسەر هەڵسوکەوتەکانی بنوسێتو لەدادگاداو لەپێشچاو ئەوانی دیکە دانبنێت بەهەموو راستیو

باس‌و خواسه هه‌ڵبه‌ستراوه‌کانداو ملبدات بۆ هه‌ڵه‌کانی. وه‌لێ ئه‌و پێچه‌وانه‌ی ئه‌وانی دیکه خاوه‌ن که‌سایه‌تییه‌کی سه‌نگین بوو، هه‌ربۆیه به‌سانایی ملی بۆ پرۆسه‌یه‌کی له‌و جۆره نه‌ده‌دا.

له‌راستیدا ئه‌زموونه سه‌ربازییه‌که‌ی نه‌ده‌کرا به‌هه‌ند وه‌رنه‌گیرێت‌و له‌که‌داربکرێتن، نه‌یش ده‌کرا قسه‌وباسێ له‌سه‌ر ئازایه‌تییه‌که‌ی بکرێت، هه‌رچه‌ند ده‌کرا ره‌قی‌و رق ئه‌ستووری ئۆجه‌لان کاریبکردایه‌ته سه‌ر که‌سایه‌تییه تایبه‌تییه‌که‌ی. له کۆتایی ۱۹۹۷ دا ئۆجه‌لان جۆرێك له چاره‌سه‌ریی پێشنیازکرد. ئۆجه‌لان فه‌رمانی کرد به‌ساکیك که بچێته‌وه به‌ره‌کانی جه‌نگ. ئیدی نێردرا بۆ هه‌رێمێك که نێوده‌برا به باشوور_رۆژئاوا، ئه‌وێ سنووری خۆرئاوای دووری ولاتبوو که نێوچه‌ی هاتای له‌خۆ ده‌گرت. هاتای هه‌رێمێك بوو که سوریا بانگه‌شه‌ی گه‌ڕانه‌وه‌ی ده‌کرد بۆ سه‌ر خاکه‌که‌ی. هه‌رچه‌ند که ماوه‌یه‌کی دوورو درێژ بوو ئه‌وێ خرابوویه سه‌ر تورکیا، وه‌ڵێ ئه‌وه هه‌لێکی باش بوو تاوه‌کوو په‌که‌که له‌و قوڵه‌وه هێرشگه‌لێك کاته سه‌ر تورکیا، که ئه‌گه‌ری فره‌هه‌بوو سوریا له‌پشت ئه‌م بیره نوێیه‌ی په‌که‌که‌وه بێت.

په‌که‌که تا ئه‌وکات چه‌ند هێرشێکی گچکه‌ی کردبوویه سه‌ر ئه‌وێ، هه‌رچه‌ند که هیچ هێزێکی دامه‌زراوی له‌و سنووره‌دا نه‌بوو. هۆکاره‌که‌یش خۆی له‌وه‌دا ده‌بینییه‌وه که خه‌ڵکه‌که‌ی ئه‌وێ کورد نه‌بوون، به‌ڵکو پێك هاتبوون له تورك و عه‌ره‌ب و ژماره‌یه‌کی که‌م له ئه‌رمه‌ن. به‌ڵام هۆکاری سه‌ره‌کیی بریتی بوو له شێوه‌ی خاکه‌که‌ی، چونکه ئه‌وێ زۆرتر ده‌شتایی بوو تا چیاو چۆڵ، ئه‌مه‌یش خۆحه‌شاردانی گه‌ریلاکانی ئه‌سته‌مکردبوو. هاوکات په‌که‌که له نێوچه‌کانی باشووری رۆژئاوادا هیچ بنچینه‌یه‌کی پشتیوانی بۆخۆی دانه‌تاشی بوو تاوه‌کو لێیه‌وه ده‌ستپێبکات. تاکۆتایی نه‌وه‌ده‌کان یه‌کێك له گه‌ریلاکان تێکڕای ئه‌و خه‌ڵکانه‌ی که له‌و ده‌ڤه‌ره‌دا سه‌ربه‌په‌که‌که بوون به ٥٠ تا ٦٠ ئه‌ندامی ده‌خه‌ملاندن. نه‌وال وه‌ك مه‌سخه‌ره‌یه‌ك به پلانه‌که‌ی ئۆجه‌لان ده‌یگوت: "ئه‌وانه‌یش هه‌مان ئه‌و ئه‌ندامه شه‌ڕکه‌رانه بوون که ساکیك بۆ پاراستنی خودی شه‌خسی خۆی به‌کاری ده‌بردن".

هەروەها دەیگوت: "ئۆجەلان ساکیکی نارده ئەویّ بەچەند گەریلایەکی کەم‌و بیّ ئەزموونەوە".

ساکیك لەگەلیّ لەنەبەردییەکاندا گیانی بە سلامەتی بەر بردبوو. وەلیّ ئەمجارەیان لەو راستیە گەیشتبوو کە ناتوانێت چیدی سەرکەوتوو بێت. رەنگە بەوهۆیە بێت کە ئەو رووبەڕووی ئۆپەراسیۆنێکی زەبەلاحی ئەرتەشی تورکیە وەستابێت‌و یان دەکرێت تا ئێستا هێند دوور بۆ ئامانجەکانی نەچووبێت.

نەوال دەیگوت: " ساکیك لەبری پەڕینەوە بەرەو باشوری خۆرئاوا، دروست لەسەر سنووردا خێوەتەکەی هەلّدا". نەوال چەند هەفتەیەك پاش ئەوە ساکیکی لەوێندەر بینی بوو. هەربۆیە نەوال دەیگوت: "خێرا ساکیك بانگکرایەوە بۆ دیمەشق‌و قۆلّبەستیانکرد". ئۆجەلان ئەوی بە پاککراوی هاتە بەردەست، چیدی پێویست بەپاساو و بەلگەی ناروون بۆ تێوەگلانی نەبوو، چوون ئەو فەرمانی راستەخۆی شکاندبوو، ئەو ئەوەی دابوویە دوواوە کە جەنگ بکات، هەر بۆیە بە دەست‌و پا بەستراوی نێردرا بۆ ئۆردوگای غار لە باکوری ئێراق. بەڕێککەوت نەوالیش لەویّ بوو. ئەویّ کەمپێکی پەکەکە بوو کە سەر بە پارێزگای کوردنشینی دهۆك بوو لەباکووری ئێراق. ئەویش بەهۆی رەخنەو هەلّسوکەوتییەوە لەدیمەشق نێردرابوویە ئەویّ. لەوێندەر کزو لاوازو نا ئومێد بەرچاودەکەوت، پێی وابوو کە خراوەتە داوەوەو بەهۆی ئۆجەلانەوە بەو رۆژە گەیشتووە. بەلّام حالّو رۆژی لە ساکیك باشتر بوو، چوون ئەو هەم قۆلّبەستنەکرابوو، هەمیش بۆی هەبوو چەك هەلّبگرێت.

نەوال دەیگوت: "شەمدین هات بۆ گارە، ئەو بەجۆریّ لاواز ببوو کە هەرگیز لە شەمدینی پێشووی نەدەکرد".

نەوال نەیدەتوانی هیچ دەستگرۆییەکی بکات، بەلّام ئەسەفی دەخوارد، کە سەرکردەیەکی سەربازی وەها مەزن لەو رەوش‌و رووەدا دەبینیّ. نەوال پێی وابوو کە ئیدی ساکیك کۆتایی پێهێنراوە. وەلیّ پێی وانەبوو ساکیك بکوژرێت، چوون گەر بکوژرایە، ئەوا لەوانەبوو کاردانەوەی توندی لەنێو پەکەکەدا دروستبکردایە، هاوکات پێی

وابوو کە ساکیك هێند کەنەفت و زەبوون کراوە کە ئیدی پێویست ناکات لەنێوبدرێت. لەنێوەندی مارسی ١٩٩٨ ڕۆژێك پاش ئەم دیدارەی نەوال لەگەڵ ساکیکدا، ساکیك هەڵهات و ریزەکانی پەکەکەی جێهێلا. نەوال لەم بارەیەوە دەیوت:" هەواڵەکەم لەجەمیل بایك بیست، ئەو دلاوەرێکی دێرین و دڵسۆزیی پەکەکە بوو، ناوبراو بەرپرس بوو لە هێشتنەوەی ساکیك، هەربۆیە لەوە نیگەران بوو کە چۆن هەڵهاتنی ساکیك بۆ ئۆجەلان روونبکاتەوە". جەمیل بایك لەوبارەیەوە دەیگوت: " هەمووان لەتەرەفی منەوە هەڵدێن، مەهمەد سینەر هەڵهات، وا ساکیکیش هەڵهات، نازانم چی بڵێم بە ئۆجەلان".

ساکیك پێش ئەوەی پەنابەرێتە بەر هێزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان، بۆ چەند ڕۆژێك خۆی لەچیاکاندا شاردەوە. پارتی لەمێژ بوو ببوویە مەئوای پاراستنی گەریلاو فەرماندە هەڵهاتووەکانی پەکەکە، مەسعوبارزانی ڕێبەری پارتەکە بۆخۆی گرەنتی سەلامەتی ژیانی ساکیکی دابینکردبوو[٣٠٥].

لە ١٣ ی مانگی ئەپریلی هەمان ساڵدا، چوار هەلیکۆپتەری تورکیی لەماوەی چەند دەقیقەیەکدا نێزیکبوونەوە لەو ماشێنەی کە ساکیك و عارفی برای هەڵگرتبوون، هاوڕا لەگەڵ چەند پاسەوانێکی کوردیی ئێراقیش. کۆپتەرەکان توانیان عارف و ساکیك هەڵبگرن و بیانگوازنەوە بۆ شاری دیاربەکر، دیارە کە براکەی ساکیکیش لە گەریلاکانی پەکەکە هەڵهاتبوو. بەمجۆرە ئەو پیاوەی کە بەدووەم پیاوی گرنگی نێو پەکەکە دەبینرا، بەسانایی توانرا دەستبەسەربکرێت و کۆتایی بێت. دواجار چیرۆکی شکستی ساکیك خەمی ئۆجەلانی رەواندەوە، ئۆجەلان بێباك بوو لەوەی کە شکستی فەرماندەیەکی کارای وا دەکرا زیان بە جەنگە گەریلاییەکە بگەیەنێت وەلێ گرنگ بەلای ئۆجەلانەوە نەمانی سەرئێشە بوو بۆ ڕێبەرایەتییەکەی .

---

305 For Barzani's statement and his response when Sakik was cap" tured, see the bulletin issued by the independent Paris"based Kurdish Insti" tute, March"April 1998, at http://www.institutkurde.org/en/publications/bulletins/bulletins.php?bul=156#2.

دیاره پاش دەستگیرکردنی ساکیك و رووداوەکانی دووابەدووای ئەو، فرە لەبارەی ناتەوانی دەوڵەتی تورکیا دەوترا لەبەرامبەر رووبەروو بوونەوەی واقیعی کێشەی کوردیی. هەروەها دەستگیرکردنی ساکیك دەیتوانی ببێتە هۆیەك تا کۆڵینەوە لەبارەی پەکەکەوە بکرێت، ئایا ئەم هێزە دەیەوێت چی بکات. بۆچی خەریکە تەڤگەرەکە لەسەرکەوتن دوور بکەوێتەوە، ئایا ئەو هەنگاوە سیاسییانە چین کە دەکرێت بگیرێنە بەر بۆ ئەوەی پشتیوانی کوردان لە گروپەکە دابڕن؟. هاوکات دەستیرکردنی ساکیك وەك هەلێك دەبینرا تا بتوانن لێیەوە ئەوانی تری گروپەکەیش بەدناو و سەرکوتبکەن.

هەروەها لەم رەوشەدا زۆربەی تورکیش لەگەڵ ئەوەدابوون کە پرس و جۆی سیاسەتی دەوڵەت لەبەرامبەر کورداندا بەپێی پێویست نییەو پێویستە هەنگاوی توندتر بۆ بندەستکردنی تەڤگەرەکەیان بگیرێتەبەر. لەمیانی دوو هەفتەدا پاش دەستگیرکردنی ساکیك، دەنگۆی قۆڵبەستکردنەکەو درکاندنی زانیارییەکانیو نهێنییەکانی پەکەکە دزەیان کردە نێو میدیای تورکییەوە. ئاکین بیردالّ بەرپرسی تۆڕی ئاحکومی مافی مرۆڤ لەتورکیا بەجۆرێك لەجۆرەکان هەموو ئەو بانگەشەو بلاّوکراوە نوێیانەی لەمەڕ ساکیك دەوروژێنرا بەوە پێناسەکرد کە دەسەلاّتدارانی تورکیا جۆرێك لە هاوپەیمانییان لەگەڵ پەکەکەدا هەیەو بەجۆرێك کە بەرپرسانی تورکیا راستەوخۆ تێوەگلاون لەپێوەندییان لەگەڵ ئۆجەلاندا . هەر لەو میانەداو بۆ پشتڕاسکردنەوەی ئەو بانگەشەیە، نموونەی دوو پارتی ئاڕاستەداری هزری ئیسلامیی بەهەوانتە نەبوو کە پەیمانیان دابوو هیچ رەخنەیەك لەپەکەکە نەگرن، لەکاتێکدا ئەو پارتانە جێگە متمانەی ئەرتەشی تورکیا بوون. هاوکات لە میتینگە هەفتانەکاندا، چەندین پارتی سەرەکی و چەندین سیاسەتمەداریی کوردی هەمەچەشن و بەشێوەیەکی گشتی ئەو ژنانەی کە هاوسەرەکانیان لەجەنگی دژ بەپەکەکەدا دیارنەمابوون، پشتیوانیان بۆ پەکەکە بەئاشکرا دەردەبڕیی.

هاوکات ئەوەی کە بەنیسبەت رایگشتییەوە شۆك ئامێز بوو بریتی بوو لەوەی کە ئۆجەلان بابەتەکانی دەدایە چەند رۆژنامەیەکی تورکی و ئەوانیش بلاّویاندەکردنەوە، لەکاتێکدا نوسینەکان لەبەرژەوەندی خودی پەکەکەدا نوسرابوون. بەهەموو ئەم

دیاردانەدا ئەو راستییە دەردەکەوت کە گومانەکانی پێوەندیی پەکەکەو بەرپرسانی تورکیا سەریان بەرەو راستی رادەکێشا[٣٠٦]. ئۆکتای ئکسی نوسەری رۆژنامەی حورییەتی تورکی بە لەخۆباییبوونەوە دەیوت کە پەکەکە هیچ رازێکی چەپگەریی لەخۆیدا نەهێشتۆتەوە. هەروەها دەیگوت خەڵکی تورکیا نازانێ، وەلێ دەوڵەتی تورکیا باش دەزانێت کە جۆری پەیوەندیی و پشتیوانی پەکەکە لە کوێوەیەو کێن ئەو ئاراستەیەیان گرتووە. ناوبراو بەرپرسی ئەنجومەنی رۆژنامەگەریی و چاپەمەنی تورکیا بو. ئەو هۆشداریی دا لەبارەی ئەو رۆژنامەو نوسەرانەی کە کەوتوونەتە داوی جۆری پەیوەندییەکانیان لەتەك پەکەکەداو پێشی وابوو کە میریی ئاگاداریی ئەو رەوشەیە[٣٠٧].

ئەوەی جێی سەرسوڕمان بوو جەنگیز کاندیر و موحەمەد عەلی بیراندبوون، کە لەگەڵ بواریی پەیوەست بە پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان و گرفتی تورکیاو قوبرس و دۆزی کوردو یەکیەتی ئەوروپا لەرۆژنامەی سەباحدا نوسیبوویان، کە چی هەموو ئەو بڵاوکراوەو رۆژنامانەو ئەو نوسەرانە لەلایەن ساکیکەوە نێویان هاتبوو.

بەمجۆرە ساکیك گەلێ زانیاریی نهێنی خزاندە نێو دەنگۆ میدیاییەکانەوە کە پێشتر نەزانرابوون. حەسەن جەمالی هاورێی ئەو دوو رۆژنامەنوسە دەیوت: "باوەڕ بەوەناکەم". ناوبراو دواتر لەکتێبێکدا چەندین راپۆرت و بەڵگەی تێرو تەسەلی لەسەر رەوشی کوردو چاودێرییەکانی سیاسەتی رەوشەکە کۆکردبوویەوەو پاراستنیی. بەڵام ئەو رێگەی نەدرا لە رۆژنامەی سەباحدا بەتەواوی وەك خۆی دەیوت ئەوەی بیری لێدەکردەوە بۆ رای گشتی ئاشکرا بکات[٣٠٨].

---

[306] See Hurriyet newspaper (Internet edition), April 26, 1998, and Sabah newspaper (Internet edition), April 25, 26, 1998, for list of Sakik's purported claims.

[307] Hurriyet, April 25, 1998; Eksi has complained that those who quote this column by him do not note that he later admitted he unwittingly had been used by "official offices" to spread lies. See his columns in Hurriyet, December 12, 1998, and February 28, 1999 (Internet editions).

[308] Cemal, Kurtler, 425–426.

دوواتر رۆژنامەکە بیراندی دەرکردو جۆرێك لە روخسەتی دەستبەرداربوونیشی دایە جەنگیز. چەند رۆژێك پاش ئەوەیش، جێگری سەرۆکی ئەرکانی گشتی جێفیك بیر نیگەرانی و تورەیی خۆی لەسەر بیراند دەربڕیو پێی وابوو ئێستایش لەپرۆگرامی تەلەفزیۆنیدا بەردەوامە، هەربۆیە داوای کرد هەموو چالاکییەکانی ئەویش رابگرن[309].

لەهەمانکاتدا ئاکین بیردالْ بەسەختی بریندارکرا، ئەوە پاش ئەوە هات کە دوو پیاویی چەکدار لە بینایەی ئۆفیسی مافی مرۆڤی ئەنکەرەدا خۆیان تەقاندەوە. پاش هەموو ئەو رووداوانە ساکیك لەدادگا دەرکەوت و هەموو ئەو لێدوان و راپۆرتانەی دایە دوواوە، وەلێ ئیدی وادیاربوو هیچ کاریگەریی نەبێت، چوون زەرەرو زیانی خۆی گەیاندبوو. دوواجار ساکیك بە سزای مردن حوکمدرا، بەلاّم سزاکەی کەمکرایەوە بۆ زیندانی هەتا هەتایی. ئەو ئیدی سەردانکەرەکانی ئێجگارکەمبوون لەزینداندا، چوون کوردان ئامادەنەبوون خۆیان بخەنە مەترسییەوە تا سەردانی کەسێکی خائین بکەن، تەنانەت ئەوانەیش کە یەکەکەیان نەدەویست هاموشۆیان نەدەکرد.

## ئیکۆ هۆمۆ

ئۆجەلان بۆ چەند ساڵێك لەسوریادا ژیانێکی ئارامی گوزەراند  کاتەکانی ژیانی خۆی لەنێوان دوو ڤێللادا بەسەردەبرد، یەکێك لەوانە لە نێزیك حەلەب و ئەوی دیکە لە لێواری دیمەشقدا بوو، هەریەك لەو ڤێللایانە دارای هۆڵی گەورەو مەلەوانگەو باخچەو گۆرەپانی یاریی ڤالیبالْبوون. ڤێللاکان لەلایەن گەریلا کچەکانەوە چاودێریدەکران. هاوکات ئەو خانمانە کاری پاکوخاوێنی و خواردن ئامادەکردن و نوسینەوەی وتارەکانی ئۆجەلانیان لەئەستۆدابوو. لەگەلْ ئەوەشدا ئۆجەلان ژمارەیەکی جۆراوجۆر یەکەی نیشتەجێبوونی

[309] For Birand’s personal, painful recollection of this event, plus an excel" lent analysis of what was dubbed the “Memorandum Affair," named for the alleged military memo planning the operation against these journalists and

هەبوو کە تێیدا دیدارو میتینگەکانی ئەنجامدەدا، بەڵام ڤێللاکان تەنیٚ پەیوەستبوون بە شوێنی حەوانەوەی ئۆجەلان.

بۆنموونە لەوەی حەلەبدا ئۆجەلان کەیفی بە پیٚ ڕۆیشتن‌و پیاسەی دەهات بەناو باخچە گەورەکەیدا. ناوی ئەو ڤێللایەی ناوبووulke، ئەم ناوەیش بەزمانی تورکی بەواتای وڵات دەهات. هەمان وشە کوردەکان بە نیشتیمان نێوزەدیاندەکرد. هاوکات لەویٚ هەڵۆیەکی ڕاگرتبوو کە نێوی نابوو مەهابات. مەهابات نێوی کۆماری تەمەنکورتی کوردانی ئێران بوو. ئۆجەلان لەکاتی پێدانی گۆشتی خامی گوێرەکە بە هەڵۆکەی، عادەتیکردبوو بەدەستهێنان بەسەریداو قسەکردن بۆی.

هەرچەند بەلایەنی کەمەوە وەك ژیانێکی ستانداری خۆرئاوایانە نەدەژیا، وەلیٚ وەختیٚ هەندیٚ لە گەریلاکان دەیاندی چۆن دەژی توشی سەرسوڕمان دەبوون، بەتایبەتی پاش ئەوەی دوچاری ئەو ئاستەنگ‌و دژواریانە ببوونەوە لە ژیانی شاخدا.

هێلین دەیگوت:"شتگەلێکی ناهەموارم لەنێوان ساڵانی ۱۹۹۲ بۆ ۱۹۹۵ بینی لە ئێراقدا". ناوبراو لەیەکیٚ لە ڤێللاکانی ئۆجەلاندا دەمایەوە لەساڵی ۱۹۹۵ دا. ئەو دەیگوت: "لەشاخدا خەڵکی جل و بەرگی گونجاو و خۆراکی پێویست و تەنانەت پێڵاویان بەگوێرەی پێویست نەبوو. وەلیٚ لە دیمەشق ماڵی قەشەنگ‌و ڕازاوەم دەبینی، ئیدی هەندیٚ نابەرابەریی‌و غایەلەی جیاوازیی‌و چینایەتی هاتن بەمێشکمدا. چونکە هەمیشە ئۆجەلان لەقسەکانیدا جەختی لەوە دەکردەوە کە هەموو شتێك ئەنجام دەدات، ئەدی چی دەربارەی ئەو خەڵکە دەڵیٚ کە لەچیادا بەو شێوە ژیان دەکەن".

ئۆجەلان هەمیشە جیهانێکی لەخەیاڵدانی خۆیدا دروستکردبوو کە لەدەورو خولی خۆیدا دەسوڕایەوە، ئەو نەیدەتوانی یاخۆ سەختبوو بۆی بتوانێت وێنای ژیانی ئەوانی دیکە بکێشێت. وەختیٚ قسانی دەکرد هەمووان چەپڵەیان لێدەدا، وەختی دەهاتە ژووریٚ هەمووان بەپێوە دەوەستان، وەختی بڕیارێکی گەلاڵە دەکرد، کەسێك لامو جیمی یاخۆ پرسیاری لێنەدەکرد، تەواوی وتارەکانی تایپدەکران و دەنوسرانەوەو دابەشدەکران بۆ ئەوەی وەك وانە بخوێنرێن. تەنانەت پێوەندییە تەلەفۆنییەکانی کە زیاد لەکاتژمێرێکیان

دەخایاندو ئاراستەی فەرماندە سەربازییەکان دەکرا، دەبوو بنوسرێنەوەو دوواتر کەڵکیان لێوەربگیرێت. خۆپەرستییەکەی شۆڕببوویەوە بۆنێو تەواوی چالاکییەکان. وەختێ لەگەڵ گەریلاکاندا یاری تۆپتۆپێنی دەکرد، بەتایبەت ئەو گەریلایانەی لە کەمپی دیمەشقدا زۆرجار پێکەوە گەمەیاندەکرد، ئیدی دەبوو هەمووان هۆشیان بەوەوە بێتو تۆپی بدەنێ، هێندەیش گروپی بەرامبەر دەبوو هۆشداربن و نەبنە ئاستەنگ لەبەرامبەر گۆڵکردنەکانیدا. ئەو کەسێکی راسپاردبوو تا پێگیریی گۆڵەکانی بکات وەختێ گۆڵێك دەکات و تۆماریی بکات. کەڕەتێکیان کەسێك کە راسپێردرابوو گۆڵەکانی ئۆجەلان بوو، ٤ لە گۆڵەکانی لەیاد چووبوو. ئیدی ئۆجەلان هەڵشاخا بەو کەسەدا، هەرچەند کابرا شەرکەرێکی بەئەزموونی گەلێ لە تاڵو ترشییەکانی جەنگی هەرێمی بۆتانیشی چەشتبوو.

نەوال بۆخۆی تەماشای گەمەکەی دەکرد، بەجۆرێك دەیگێڕایەوە کە هاتوو هاواری ئۆجەلان بەسەر گەریلاکەدا نەدەبڕایەوە. بەم شێوەیە رووداوەکەی باس دەکرد:"ئۆجەلان پرسیاری لە موحەمەد کرد، ئایا من چەند گۆڵم تۆمارکردووە، ئەویش لەوەڵامدا وتی ١٢، دیسانەوە دەستی کردەوە بەهاتوو هاوار. ئەو هاواری دەکرد تۆ تەوەزەلیت، چۆن ٤ لە گۆڵەکانی منت فەرامۆشکردوون. موحەمەدیش بەداوای لێبوردنەوە دەیگوت تەنها ١٢ گۆڵم حسابکردووە، ئۆجەلانیش بەسەریدا هاواری دەکرد. پاش ئەو رۆژە وەختێ ئۆجەلان هات بۆ ئەوەی وانەکەی بڵێتەوە، هەوەڵ شتێك کە باسی کرد ئەمە بوو: ژیانی نەوی لەکوێیە؟ ئەو چۆن توانی ٤ لە گۆڵەکانی من لەیادکات؟ لەیادکردنی ٤ گۆڵ واتا لەیادکردنی ٤ جەنگاوەر، ئەوەیش واتە لەیادکردنی کوشتنی ٤ سەربازی تورك، ئەوەیش بەواتای لەیادکردنی شۆڕشو فەرامۆشکردنی کوردستان دێت. پاش ئەوە وام زانی ئیتر تەواو و بڕایەوە، وەلێ ئەو شەوە ئۆجەلان لە کەناڵی مێد تیڤی دەرکەوتەوەو دیسان هەڵیدایە، ئەو تەوەزەلە، ئەو فەرماندە گەمژەیە چۆن توانی ٤ لە گۆڵەکانی من فەرامۆش بکات".

ئۆجەلان خۆی وەك نێوەندی رووداوەکانی جیهان دەبینی، ئۆجەلان وا باوەڕی لا بەرجەستەکرابوو کە هێزی ئەو یەکسانە بەهێزی پەکەکە، ئەو باوەڕەی لا گەلاڵە ببوو

کە چالاکییەکانیی پەکەکە لەپشت گەلێ لە رووداوە جیهانییەکانەوەیە. نەوال کە مانگێك لە ڤێللاکەی ئۆجەلان لە حەلەب مایەوە (ئۆجەلان ئەوی بانگکردبوو تا چیرۆکێك لەسەر کەمپی زابی پەکەکە بنوسێت، ئەو چیرۆکەی کە تا ئێستایش تەواو نەکراوە)، هەمووکات نەوال راهاتبوو بە گوێبیستبوونی بیرکردنەوەو بۆچوونەکانی ئۆجەلان، نەوال دەیگوت: "گەر وەزیرێك لەهەرکوێیەکی دونیا لەئەڵمانیا یان لەئەمریکا لەسەر تەلەفزیۆن لێدوانی بدایە یان وتارێکی بخوێندایەوە، ئەوا ئۆجەلان دەیگوت ئەو وتارەی لەژێر کاریگەریی وتارەکەی مندایە. ئەو پێی وانەبوو زیادەڕەوی دەکات، بەتەواوی باوەڕی وەها بوو. بەدڵنیاییەوە شتانێك هەبوون لەژێر کاریگەریی ئەوەدابوون کە پەکەکە ئەنجامی دەدا.

لەراستیدا ڕێیەك نەبوو تا ئۆجەلان بەو کاریگەرییە سنووردارانەیش بزانێت. ئەو وای دادەنا هەموو شتێك لەرێی ئەو و بەهۆی ئەوەوە ئەنجامدراوە، ئەو پیاوێك بوو لە خۆشەویستیدا بوو لەگەڵ خودی خۆیدا. باوەڕی وابوو لەسەروبەندی شۆڕشێکدا یە بۆ جیهان‌و تەنها لەپێناو کوردا خەبات ناکات، ئەو پێی وابوو هەرچی ئەمریکاو ئەڵمانیا پێویستیان بەوەوە هەیە بە کاریگەریی و نەهجی ئەوەوە هەنگاو هەڵنێن لەناوچەکەدا".

باوەڕی ئۆجەلان بە خۆی، زیاتر لەو هاندان و هێمایەوە سەرچاوەی گرتبوو کە زۆرێك لە ئەندامانی پەکەکە بەمەزنییەوە تەماشایان دەکرد. لەهەمان کاتدا هەندێك لەوانە دوچاری رەشبینی دەبوونەوە، بەتایبەت ئەوانەی پاش ساڵانێك لە جەنگ لەنێو تورکیادا دەهاتنە سوریاو لە نێزیکەوە ئۆجەلانیان دەبینی. هەموو ئەوانە ئاشنابوون بە هەموو ئەو گرفت و تەگەرانەی کە لەنێو چیادا پێوەی دەتلانەوە، پێیان وابوو بە بینینی ئۆجەلان سورتر دەبن لەسەر کێشانی ناسۆرییەکان لەپێناو خەباتە رەواکەیاندا.

لەگەڵ ئەوەیشدا ئۆجەلان رێبەری گەورەترین و بەهێزترین تەڤگەری نەتەوەیی کوردی تورکیا بوو، بزوتنەوەیەك توانیبووی کێشەی کوردان بناسێنێت‌و بەلایەنی کەمەوە وا لە تورکیا بکات کە هیچ نەبێت دان بەو راستییەدا بنێت کە لە هەرێمەکەیاندا گرفتێك لە گۆڕێدایە.

زینارین، خانمە گەریلایەکی باهۆش‌و سەوادی پەکەکە کە لەدەستپێکی بیستەکانی تەمەنیدا بوو، لەیاداشتەکانیداو چەند مانگێکی کەم پێش ئەوەی لەیەکێ لەپێکدادانەکانی نێوخۆی تورکیادا لە سێپتەمبەری ١٩٩٧ دابکوژرێت نوسی بووی: "دووا شەو لەخەونمدا رێبەری پارتەکەمم بینی". ناوبراو چەند ساڵێکی لە دیمەشقدا گوزەراندبوو. لەوێنەکاندا دەردەکەوێت کە پێش ئەوەی بچێت بۆ جەنگ چلۆن فرمێسکەکانی بۆ ئۆجەلان دەرێژێت. ئەو لەیاداشتەکانیدا نوسیبووی: "ئەوە خەونێکی جوان بوو، دەبوو بزانن چەندە بیری ئۆجەلانم دەکرد. هەموو ئەو شتانەی کە ئەو دەیگوتن، سەدان جار لە مەژگمدا دەزرنگانەوە. ئەوانە تۆنێکبوون لە دەنگیدا کە سۆراخی دڵی منیان دەکرد"[310].

گوربەتلی ئەرسۆز، بۆ کەرتێك سەرنوسەری رۆژنامەی کوردی Ozgur Gundem بوو. ئەو خانمە لە گیانی خۆی وەرِس ببوو، هەربۆیە نەیدەشاردەوە کە دەیهەوێت چیدی زەمینەی یاسایی جێبهێڵێت و بەشداربێت لە جەنگی گەریلاییدا(سەرەڕای گرفتە جەستەییەکەی کە رێ رۆیشتنی بۆ ئاستەمکردبوو). ناوبراو پاش ئەوەی لە دەستپێکی ١٩٩٥دا گەیشتە دیمەشق، فرە بە توندی لەلایەن ئۆجەلانەوە رووبەڕووی رەخنە بوویەوە.لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو هێند بەسنگفراوانییەوە ئەو رەخنانەی وەردەگرت، کە دەیخواست هۆیەك بن تا ئەو بکەنە گەریلایەکی چاپوك و چالاکتر لە خەباتەکەیدا.

ناوبراو پێش ئەوەی بنێردرێت بۆ کەمپێکی گەریلایی لە باکووری ئێراقدا، لەیاداشتەکانیدا، کەتێیاندا تەواوی گفتوگۆ تەلەفونییەکانی لەگەڵ ئۆجەلان نوسیبوویەوە نووسیبووی:"رێبەری پەکەکە جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە، کە هەرگیز نابێت لە رووبەڕوو بوونەوەی رێگە گەلێك بترسم، کە تێیدا بەهۆی روانگە ئازادیخوازەکانمەوە تانەو تەشەرم لێ دەدەن. ئەو رەخنانە زۆر گران بوون لەسەردڵم، بەڵام بەهۆی ئەمەوە خۆڕاگرو بەهێزکرابووم، واهەستم دەکرد بەو رەخنانە جارێکی تر لەدایك بوومەتەوە، ئیدی هەموو ناسۆرییەکانی رابردووم دەخستنە پشتگوێ‌و گەیشتبوومە وەڵامی کۆی پرسیارەکانم"[311].

---

[310] Zinarin'in Guncesi, 34.
[311] Ersoz, Gurbet'in Guncesi, 212.

## باسی سێهەم:

## لەناکاوێکدا، ئۆجەلان دەگیرێت (١٩٩٨ ١٩٩٩)

لەهاوینی ١٩٩٨ دا ئۆجەلان بەرەو راڕایی‌و سەختگیریی وەرچەرخا، ئەو فەرمانی دا بە دووان لە ئۆردوگا راهێنراوەکانی گەریلا کە ئیدی هەڵبوەشێنەوەو تەواوی چەکدارەکانی نارده بەر سنوورەکانی باکووری ئێراق‌و بەشەکانی تری ولاتەکەی. باتوفا، هەڤاڵێکی شۆڕشگێڕ بوو لە یەکێ لە ڤێللاکانی ئۆجەلان لەحەلەب، ئەو فەرمانی پێکرا کە رێوشوێن بگرێتەبەر بۆ داخستنی کەمپەکان .

ناوبراو دەیگوت: "سوریا بە ئۆجەلانیان راگەیاندبوو، کە لەلایەن تورکیاوە فشارێکی زۆرمان کراوەتە سەرو پێویستە شوێنەکانمان بگۆڕین". ئەوە یەکەمجار نەبوو کە سوریا دەستووری دەدا بە ئۆجەلان تا چالاکییەکانیان و بزووتنەوەکەیان لەسوریادا سنووردرابکەن‌و کۆتایی بە مەشق‌و کەمپەکانیان بهێنن. بەگوێرەی راپۆرتەکان ئۆجەلان لەساڵی ١٩٩١دا، پاش دیداری لەتەك نوێنەرانی کوردی ئێراقی بۆ ماوەیەکی کەم دەستبەسەرکراوە.

لەساڵی ١٩٩٢ دا سوریا راهێنانە سەربازییەکانی پەکەکەی لە بیقاعدا هەڵپەسارد. لەساڵی ١٩٩٧ یشدا ئۆجەلان بە ئاشکرا داوای لێکرا کە تەواوی ئەو ماڵانەی کە لە گوندی (بر ئەلیاس) بۆ گردبوونەوەکانی بەکاریاندەهێنێت دابخات. بەڵام ئەمە یەکەمجار بوو کە تورکیا بەشێوەیەکی جددی فشارەکانی بۆسەر سوریا لەبارەی لەخۆنەگرتنی پەکەکە تێن بۆ بهێنێت. لەگەڵ کۆتاهاتنی وەرزی هاوینێدا، بەرپرسانی تورکیا ئەوەیان خستە روو کە ئەگەر پێویست بێت هێزی سەربازی بەکاردەهێنن بۆ هەڵکەندنی رێبەری پەکەکە و دەرپەراندنی.

دەستگیرکردنی شەمدین ساکیك نەك هەر تورکیای بەرچاو روونترکرد، بەڵکو رێگەیەکی نوێی‌و سەرکەوتووی لەمامەڵە لەتەك پەکەکەدا بەخشیە تورکیا. لەو شێوازەدا

سەرزەنشتی پشتیوانیی سوریا بۆ پەنادانی گروپەکە خرابوویە بەرنامەی کارەوە. لەهەمانکاتدا تورکیا چەند سەرەداوێکی نەزمی سەربازیی لە باشووری رۆژهەلاتی ولاتەکەی بۆ ڕوونببوویەوە کە لەو راستییە تێگەیشتبوو هەمووی بە پشتیوانی سوریا گەریلاکان توانای سەربازییان خراوەتە گەڕ.

بە هاتنی فەرماندەیەکی نوێی تورك لە مانگی هەشتی هەمان ساڵدا، ئیدی وانومایان دەبوو کە دەمو دووی سەربازی تورکیا ئێجگار جددیەو بۆ یەکەمجارە تورکیا دەیهەوێ فرە بەجددیش پەیگیریی پەکەکە بکات لە سنوورەکاندا. سوریا دەبوو لەهەمبەر ئەو رەوشەدا نیگەران بووایە، چوون رێبەری پەکەکە لە کۆتایی هاوینی ئەو ساڵەدا دژ بە زنجیرە پلانێکی نێوخۆیی‌و نێونەتەوەیی وەستابوویەوە کە قەسدیان بوو ئەو لە پێگەو پێناوەکەی لادەنە لاوە. ئۆجەلان لەو باوەڕەدا نەبوو کە لەلایەن پشتیوانە دێرینەکەیەوە بەرکەناربکرێت‌و دەستبەرداربیێت. تا ئەو کاتەیش لەسەر ئەوە سوور بوو کە گرفتی واقعیی تەڤگەرەکەی خۆی لەو کەسانەی نێوپەکەکە دەبینێتەوە کە گەرەکیانە ئۆجەلان تێکبشکێنن‌و رکەبەرایەتی دەکەن. هەر لەو دەمەدا بانگەشەی ئەوەی کرد کە رۆژنامەنوسێکی نێوبانگی کورد لە ئەڵمانیا، بەکرێگیراوی ولاتی ئەڵمانیایەو کاردەکات تا لەگەڵ دووژمنانی ئەو لەنێوپەکەکەدا خۆی بسازێنێت.

لەراستیدا ئەو بەباتوفاو هەموو ئەوانی تر کە لە ڤێللاکەی حەلەب بوون ئەوەی خستە روو، کە پێویستە تەواوی ئەنجومەنی ئەورووپای پەکەکە راپێچی لێپرسینەوەو دادگا بکرێن، چوون ئیدی ئەوان بەتەواوی سەرگەرمو دڵسۆزیی کارەکەیان نین. باتوفا بەمجۆرە رەوشەکە رووندەکاتەوە: "بەتایبەت لەم سۆنگەیەوە هەلومەرجەکە بەتەواوی رووی لە رەشبینی نا بوو".

لەنێوەندی مانگی سێپتەمبەردا، ئەتیلا ئەتیس فەرماندەی هێزە زەمینییەکانی تورکیا، خۆی گەیاندە بنکەی سەربازی تورکیا لە سنووری نێزیك بە سووریاو تورکیای تۆمەتبارکرد بە قۆستنەوەی نیازباشی ولاتەکەی لەهەمبەر پێوەندییەکانیان. ئەو لەم

ڕوانگەیەوە دەیوت: "ئیدی لەبەرامبەر ئەم ڕەوشەدا سەبر ناگرین"[٣١٢]. چەند ڕۆژێك دوواتر سەرۆکی ئەرکانی گشتیی جەنەراڵ حوسەین کیڤریقۆغلو سەبارەت بەو جەنگە ڕانەگەیەنراوە لێدوانی داو لەوبارەیەوە یادئاوەریی ئەوەی کرد کە پێویستە ئەنکەرە بەرگری لەخۆی بکات. لەهەمانکاتدا بانگەشەی ئەوە بڵاوبووەوە کە تورکیا نێزیکەی ١٠٠٠٠٠ لە هێزە زەمینییەکانی ڕووەو سنوورەکانی سوریا جوڵاندووە[٣١٣]. ئەندامانی ئەنجومەنی ئۆروپای پەکەکە کە بەشێوەیەکی فەرمی بە ERNK ناسرابوون. ئەوان هاتنە سوریا تا لەنێزیکەوە دەربارەی ڕەوشەکە لەگەڵ ئۆجەلاندا قسە بکەن. ئاکیف حەسەنی وتەبێژی سەرەکی پەکەکە لە ئەوروپا، بۆخۆی لە دیمەشقدا هۆشداری دایە ئۆجەلان کە پێ ناچێت سوریا بتوانێت لەبەرامبەر ئەو فشارو تینەی تورکیادا خۆیڕابگرێت. یەکێك لە گرفتەکان خۆی لەوەدا دەبینییەوە تا ئەوکات هیچ وڵاتێکی عەرەبی ئەوەی لێچاوەڕێنەدەکرا کە لەسەر وڵاتێکی عەرەبی دیکە بێتە دەنگو هاوکات ئەوان لەبەرامبەر پشتیوانیی کردنی سوریا بۆ ڕێبەری شۆڕشی کوردانی تورکیە ناکۆكو ناتەبابوون.

ئاکیف حەسەن لەم بارەیەوە وتی: "ئۆجەلان سووربوو لەسەر مانەوەی بنکە سەربازییەکان، ئەو تەدارەکی پێش وەختەی کردبوو، لەبەر ئەوە پێی وابوو هیچ کەسێ ناتوانێت ئەو دەربپەڕێنێت". ئاکیف حەسەن پێی وابوو گەر بێت ئۆجەلان دەربپەڕێنرێت، ئەوا پەکەکە خۆی لەرەوشێکی خراپدا دەبینێتەوەو بەدڵنیاییەوە کەسێکی تر لەپاش ئەو واز لەو نیگەرانییەی ئۆجەلان دەهێنێت. حەسەن بەم جۆرە هەڵو مەرجەکە دەگێڕێتەوە: "ئۆجەلان وەك ئەوەی بۆ یەکێك لەخانمەکانی دەگێڕایەوە پێی وابوو ئەوان هەمیشە دێنە سەر سنوورەکانو هەڕەشە دەکەن، ئەوانە شتێك نین". هەروەها دەیوت: "گرفتی ئۆجەلان لەوەدا بوو هیچ ڕێو شوێنێکی پێشبینی کراوی نەدەگرتە بەر، پێویست بوو ئۆجەلان سیناریۆکانی سەردەمەکەی بخوێنێتەوە". حەسەن بەهۆی ئەوەی

[312] Quoted in Cemal, Kurtler, 445.
[313] See Makovsky, "Defusing the Turkish"Syrian Crisis."

ئینگلیزییەکی باشی دەزانی بەباشی لە مەشهەدە سیاسییەکانی ڕۆژ گەیشتبوو، ئەو دەیزانی خەریکە لەنێوچەکەدا چی ڕوودەدات.

ئۆجەلان نەیەویست بڕوا بەوە بێنێت کە بۆچوونێکی گرنگتر لەبۆچوونی ئەو دەکرێت لە گۆڕێدا بێت. هاوکات ئەو وێنای ئەوەی نەدەکرد کە دەکرێت ڕۆژێك بێتە پێشێ هاوکارە دێرینەکەی وەدەری نێت. چونکە ئەو بۆ نێزیکەی دوو دەیە بوو لە سوریادا دایکوتی بوو. ئەوە بۆ دروستکردنی فشار لەسەر تورکیا ئێجگار بەسود بوو. هەروەها وەك ڕێگەیەك چاوی لێدەکرا تا کوردانی سوریە بەدوور بگرێت لە پشێوی و پەلپگرتن لە ولاتەکەی خۆیان. هەر دوور نەڕۆین هێرشەکانی پەکەکە بۆ سەر کوردانی ئێراق، هۆیەکی سودبەخشبوو بۆ ولاتەکان تا ئەویێ بە ناثارامی بهێلنەوە. ئەوە هۆیەك بوو کە بۆ کوردانی ئێراقی دژوارکردبوو بەدەم خواستی بوون بەدەولەتەوە کارێك بکەن و کاریگەرییەکانی ئەمەریکای لەسەر ڕەوشەکەی کەمتر هێشتبوویەوە.

دیارە کە ئەوانەیش دوو شتی بایەخداربوون لەلای سیاسەتەکانی سوریا. دیمەشق پشتیوانیکردنی بۆ گروپێکی چەکداریی لەمجۆرە زۆر لۆژیکی بوو، ئەو لەو ڕوانگەیەوە پشتیوانی دەکرد کە گروپگەلێکی لەو جۆرە نابنە سەرئێشەو هەڕەشە بۆ کیانی نەتەوەیی سوریا. وەلێ ئیتر کاتی ئەوە هاتبوو کە سوریا چاوبخشێنێتەوە بە هەڕەشە جددییەکانی تورکیادا. لەگەلێ هەموو ئەمانەیشدا حافز ئەسەدی سەرۆکی سوریا وابیردەکردەوە کە کردنی ئۆجەلان بەقوربانی پەیوەندییەکانی لەتەك تورکیا، ڕەوشەکە زیاتر هەستیاردەکات. لە دەستپێکی ئۆکتۆبەرد، میسر هۆشداری دایە سوریا دەربارەی هەڕەشەو گوڕەشەکانی تورکیا. ئیدی بەرپرسانی تورکیا بە ئۆجەلانیان وت، ئەوان ڕووبەڕووی هەلبژاردنێکی نابەدلکراونەتەوە، هەربۆیە باشترین ڕێگە ئەوەیە کە ئەو سوریا جێبهێلێت. دوواتر ئۆجەلان بەم جۆرە خواستەکەی بەرپرسانی سوریا کەپێیان وتبوو

گێڕایەوە: "یان دەستگیرت دەکەین‌و رادەستی تورکانت دەکەین، یاخۆ جەنگ لەنێوان ئێمەو تورکیادا هەڵدەگیرسێت، ئیدی هەڵبژاردنی ئەوە لەدەستی تۆدایە"[٣١٤].

لە نۆی ئۆکتۆبەری ١٩٩٨ دا، بەهەمان شێوەی کە نۆزدە ساڵ پێشتر بەخشپەیی هاتە نێوسوریا، بەوجۆرەیش بە هێوری سوریای جێهێلا. چەند رۆژێکی خایاند تا تورکیا بەتەواوی باوەڕ بە وەدەرنانی ئۆجەلان بهێنێت. شۆفێرەکەی ئۆجەلان بە گشتی بەنێو سنوورەکانی باکووری سوریادا، لێرەو لەوێ ئەو راستییەی درکاند. باتوفا گوتی: "شۆفێرەکەی ئۆجەلان هاتوو گوتی ئۆجەلان رۆیشتووە، دیارە کە ئەوە روویدابوو". وەلێ شۆفێرەکەی ئۆجەلان هیچ زانیارییەکی زێدەتری نەدا بەدەستەوە.

ئازمان گوتی: "لەقامیشلۆدا بووم، وەختێ گوێبیستی هەواڵەکە بووم، ئێمە لەوێ نەمانزانیبوو کەوا ئۆجەلان دەرباز بووە. ئیدی پاش پانزە رۆژ گروپێك لە گەریلاکان رێکخران تا دەربازی سوریابن بەرەو باکووری ئێراق". بەهۆی ئەوەی تازە بەتازە جەنگ لەنێوان پەکەکەو هێزەکانی سەر بە بارزانی روویدابوو، هەربۆیە گروپەکەی ئازمان نەیانتوانی هەروا بەسانایی لەسنوورەکەوە دەربازبن. لەبەرئەوە ئەوان لەرێگەی موسڵەوە قەد برپیانکرد، ئەوێ دەم ئەو دەڤەرە لەژێر دەسەڵاتدارێتی سەدام حسەیندا بوو. ئازمان دەیگێڕایەوە کە سەربازە ئێراقییەکان وا هەڵسووکەوتیان دەکرد کە گوایا ئێمە نابینن. وەختێ ئێمە بەنێزیك بارەگاکانیاندا دەچووین، ئەوان دەگەڕانەوەو دەچوونە نێو ماشێنەکانیان. بەمجۆرەو بەکاوەخۆ چەکدارەکانی پەکەکە لە کەمپی هاکورك لەباکووری ئێراق گردبوونەوە. ئەوێ بنکەیەکی سەرەکی بوو، کەنێزیك بوو بە سێگۆشەی سنووریی بەیەکگەیشتنی ئێراق‌و تورکیاو ئێران. ئیدی لەوێ ئەوان‌و ئەو گەریلایانەی تازە بەتازە بەمەبەستی ئامادەکاری بۆ کۆنگرەی شەشەمی ١٩٩٩ هاتبوون، پێگەیشتن. زۆربەی ئەوانە لەبارەی دیارنەمانی ئۆجەلان شتێکیان بیستبوو، وەك هەموو ئەوانی تر ئەوانیش لەمانای ئەوە سەریان دەرنەدەکردو نەیانزانی ئەو لەکوێیە. یەکێ لەوانەی کەهاتبووە

---

[314] Ozkan, Operasyon, 69.

کەمپی هاکورک، ئەیهان سیفتسی بوو. ناوبراو لەوە دڵنیابوو کە بەم هاتنەوەی لەلایەن پەکەکەوە لێپێچینەوەی لەتەکدا دەکرێت لەبارەی شکستەکانی پەکەکەوە. سیفتسی دەیوت: "بڕیارمدابوو بچم، چوون بەپێچەوانەی ئەو هەڵبژاردنەوەم، گروپی جەنگاوەران دەستبەرداردەبوون و دەگیران، هەروەها نەمدەتوانی زیاتر لەوە بمێنمەوەو چالاکی بکەم". ناوبراو کە زۆرجار پێی دەوترا کوچوك زەکی، بۆ تاوێك وەستاو پاشان وتی: "وابڕمدەکردەوە کە لەوانەیە بکوژرێم یان تەنها سەرزەنشتبکرێم، ئەوان پێویستبوو سەرزەنشتی کەسێك بکەن کە لە رێگەی جەنگو خەباتدا شکستی هانیبێت".

گەشتەکەی کوچوك زەکی بۆ دەربازبوون لەنێوخۆی تورکیا، لەسەرەتاوە ئەوی گەیاندە کەمپی زاپ، لەوێ گەیشتنەکەی وادانرا، کە بگەیەنرێتە ئۆجەلان لەدیمەشق. دورهان(عەباس)کاڵکان، یەکێ لەهامکارو باوەڕپێکراوەکانی ئۆجەلان، ژمارە تەلەفۆنێکی داپێی تا لەرێیەوە تەلەفۆن بکات. کوچوك زەکی دەڵێ: "ژمارەکەم لێداو قسەم لەگەڵ ئۆجەلان کرد، ئەو لە رووسیا بوو".

**ئۆجەلان دیسان دوچاری سەرسوڕمان دەبێت**

هەرلەوکاتەی کە ئۆجەلان دەربازی سوریا بوو، ئیدی ئاکیف حەسەنیش گەڕایەوە ئەوروپا. لە ١٠ی نۆڤەمبەری ١٩٩٨ دا ژمارە تەلەفۆنێکی بۆهات. لەوێ پێی راگەیەنرا کە میوانێکی ها لەرێگەیە، میوانەکەیشی ئۆجەلان بوو، ئەو نیازی بوو بێتە ئیتاڵیا.

ئاکیف حەسەن لەم بارەیەوە دەیوت:"کاتی یەلمازی وتەبێژی ئەورووپای پەکەکە پێمی وت، میوانەکەی خەریك بوو لە رێگەدابوو، ئێمە پێویستە چارەیەك بدۆزینەوە، پێویست بوو شتێك بکەین". چوون ئۆجەلان لەرەوشێکی دژواردابوو[٣١٥].

[315] This section, including the reconstruction of Ocalan's flight from Italy and afterward, incorporates information from Celik, Agri, 409 – 436; Ozkan, Operasyon; Ocalan's court statement in Inanc and Polat, Apo, PKK, 29 – 33; BBC and CNN news reports covering the relevant period; and a variety of other news reports collected by the online news"gathering security source, www .globalsecurity.org, specifically at http://www.globalsecurity.org/military/

شەش هەفتە پێشتر لەسوریاوە قوتار ببوو، ئەو لەوکاتەوە بەردەوام لەهەوڵدابوو تا وڵاتێك وەدۆزێتو مافی پەنابەری پێبدات، بەڵام تا ئەوکات نەیتوانیبوو. لەسەرەتاوە وادیاربوو لە یۆناندا دەتوانێت مافی پەنابەرێتی وەربگرێت، چوون لەوێندەر پەکەکە دارای تەرەفدارو هاوسۆزێکی بەرفراوان بوو. ئەوەبوو لە ٩ ی ئۆکتۆبەردا راستەوخۆ لەرێگەی فرۆکەیەکی بازرگانیی دەرێی دیمەشقەوە خۆی گەیاندبووە ئەسینا. بەڵام وەختێ گەیشتبووە ئەسینا، هەروەك ئۆجەلان دواتر بۆخۆی دەیگوت:"یۆنان رووی درێوی خۆی پیشاندام"[٣١٦]. چونکە یۆنانییەکان تەنها ٣ کاتژمێریان دانابوو بۆئەوەی وڵاتەکەیان بەجێبهێڵێت. ئیتر هەر ئەو شەوە بەدابینکردنی رێوشوێنی پێویست لەلایەن سەرکردەی نەتەوەگەرای توندڕەو ڤلادیمیر زیرۆنۆڤسکیی کار ئاسانی بۆکرا تا خۆی بگەیەنێتە مۆسکۆ. بەڵام سەرەڕای پشتیوانییەکی مەزنی ئۆجەلان لەلایەن پەرلەمانی ئەو وڵاتەوە تا مافی پەنابەرێتی بدرێتێ. کەچی دەسەڵاتدارانی حکومەتی روسیا نەیانویست مافی مانەوە بدەنە ئۆجەلان. لەوکاتەوە تورکیا بەهەماهەنگی دەزگای هەواڵگری ئەمەریکا توانیبووی پێگیریی شوێنی ئۆجەلان بکات. بەڵام روسیا سوربوو لەسەر ئەوەی نەبوونی ئۆجەلان لەوڵاتەکەیدا پشتڕاست بکاتەوە. هاوکات بە گەرمیی گەرەکیشیان بوو خۆیان لەجەنگی تورکیا بەدوور بگرن، هەربۆیە کردیانە سەر پەکەکەو پێیان راگەیاندن کە پێویستە روسیا جێبهێڵن. ئەوکات حەسەن و هەڤاڵەکانی لەتەك سیاسییە چەپگەرا ئیتاڵییەکاندا فرە بەگەرمو گوڕییەوە کاریان کردو مژوڵی دۆزینەوەی رێگەچارەیەك بوون. پەیوەندییەکانیان لەتەك پارتی دامەزراندنەوەی کۆمۆنیستدا بوو، ئەم پارتە لقێکی پارتی کۆمۆنیستی پێشوو بوو، لەوێدا پێشنیازیان بۆکرا تا دەربارەی پرسەکە لەتەك سەرۆکی پارتەکەدا قسەبکەن.[٣١٧]

---

library/news/1998/11/index.html.

[316] Ozkan, Operasyon, 71.

[317] Italy's foreknowledge of Ocalan's arrival is described in detail in Top Secret: il caso Ocalan, by La Reppublica journalist Marco Ansaldo. See Turkish news coverage of this at http://www.ntv.com.tr/news/133072.asp.

دوو ڕۆژ پێش ئەوەی ئۆجەلان پێ بنێتە فڕۆکەخانەی ڕۆماوە، حەسەن بەمجۆرە باسی لە زەمینە سازییەکان دەکرد :"ئێمە چووینە ماڵی ڕێبەری پارتە کۆمۆنیستییەکە، ئەو پیاوێکی فرە ڕووخۆشبوو، پرسیاری کرد لەبارەی ئەوەی دەتوانێت چی بۆ ئێمە بکات، ئەو پێمانی گوت، ئایا پێویست دەکات تەلەفۆن بکات بۆ سەرۆك وەزیران؟ ئێمەیش لەوەڵامدا گوتمان گەر کارێکی وەها بکەیت، ئەوا ئێمە فرە پێی کەیفخۆش دەبین"[318].

کۆمۆنیستەکان پێیان گوتین چۆنە گەر لەتەك سەرۆکی پارتە دامەزراوەکەدا قسان بکەین لەوبارەیەوە، ئەو هاوڕێی نێزیکی سەرۆك وەزیرانی ئیتاڵیایە".

بەمجۆرە ڕێبەری پارتە کۆمۆنیستەکە تەلەفۆنی هەڵگرتو پێوەندی کرد بە سەرۆك وەزیرانی ئیتاڵیا Massimo D'Alema، ئەو بۆخۆی بەفەرمی سەر بە پارتی کۆمۆنیست بوو. حەسەن گوێبیستی بەشێك لە وتووێژەکان بوو، دووا بەدووای ئەوە کابرا هەموو گفتوگۆکانی وتەوە. حەسەن بەمجۆرە دەقی وتووێژەکەی نێوان سەرۆك وەزیرانو پارتە کۆمۆنیستییەکەی باسدەکرد:"

سەرۆکی پارتە کۆمۆنیستییەکە بەتەلەفۆن گوتی: گوێبگرە، عەبدوڵلا ئۆجەلان، ڕێبەری پەکەکە یە، ئەوڕۆ یان سبەینێ دەگاتە ئیتاڵیا. هاوکات Massimo D'Alema وەڵامی بەمجۆرە دایەوە: ئەم عەبدوڵایە کێیە؟ ئەویش گوتی: ئەو ڕێبەری پەکەکە یە. پاشان سەرۆك وەزیران گوتی: چ جۆرە پاسپۆرتێکی پێیە؟ ئەو بەجۆرێك دەدوا وەك ئەوەی نەزانێت ئۆجەلان کێیە. هەربۆیە وەڵامی دایەوە کە نازانم چ پاسپۆرتێکی پێیە، وەلێ دوور نییە ساختە بێت. لێرەدا هەردووکیان دایانە پێکەنین. دوواجار سەرۆك وەزایران وتی، قەیدی نییە با بێت، وەلێ تکایە با کەسێك لە ئێوە هەماهەنگ و هاوکارییێت".

---

318 Hurriyet, November 14, 1998, see http://arsiv.hurriyetim.com.tr/hur/turk/98/11/14/.

لە ١٩ نۆڤەمبەردا ئۆجەلان بەرەو رۆما کەوتە رێ، ناوبراو بە ناسنامەی راستەقینەی خۆیەوە داوای مافی پەنابەرێتی کرد لەو ولاتەدا. رۆژنامەیLe Soir بروکسلی پێتەختی سیاسیی ئەوروپا، ئاماژەی دا بەوەی کە هەماهەنگیی پێویستە بگیرێتە بەر تا هاوسەنگییەکی سیاسی و نەتەوەیی گونجاو سەبارەت بە کۆتاهاتنی ئەم پرسە بگیرێتە بەر[٣١٩] . تورکەکانیش هەموو دەستی بەدەستیکردنێکیان بۆ مانەوەی ئۆجەلان لە ئەوروپا دەدایە دوواوەو لەبەرامبەر خواستێکی لەو جۆرە ئێجگار خەشمگیر بوون. هاوکات خۆپیشاندانیان لەبەردەم بالۆێزی ئیتالیا لە ئەنکەرە سازدا. هاوکات تورکیا هەموو قازانجو قەراردادەکانی ئیتالیای خستە بەر هەرەشەی وەستاندن.

رۆژنامەنوسێکی تورکیایش نوسی کە ئۆجەلان لەلایەن باندێکی ئیتالییەوە پارێزگاریی لێدەکرێت. هاوکات رۆژنامەیەکی دی نوسیبووی: گەر ئەو ولاتە تێبگا لەوەی کە ئەو پیاوە چ مرۆڤێکی مندال کوژە، ئەوا بریارێکی راستو دروست دەدات. دیارە ئەوە جێی سەرسورمان نەبوو کە بۆچی تورکەکان سەبارەت بە دیپۆرتکردنەوەی ئۆجەلان نائومێدن. چونکە یاسای ئیتالیا جیا لەهەموو شتێکی تر رێگر بوو لەرادەستکردنەوەی هەر گومانلێکراوێك بۆ ولاتێك کە یاسای لەسێدارەدانی تێدا بێت.

دیارە کە لەتورکیادا ئەو یاسایە هەبوو. دیارە شوێنکردنەوەی ئۆجەلانیش لەلایەن ئیتالییەکانەوە پەیوەست بوو بە هاوسۆزییەکی کاتییەوەو تەنێ لەوکاتەدا بوو، ئەگین روون نەبوو بۆ رۆژی دواتر چی بەسەر ئەو پیاوەدا گوزەرێت. هاوکات ئیتالیا داوای کرد لە ئەلمانیا کە ئۆجەلان بگرێتە خۆ، چوون بە گەرانەوە بۆ هەشت سالی تر پێویست بووە دادگاکانی ئەلمانیا ئۆجەلان دادگایی بکەن، هەربۆیە ئیتالیا دەیەویست لەم رێیەوە ئەو گێچەلە لەکۆلخۆی بکاتەوە. وەلی ئەلمانیا رایگەیاند کە ئامادە نییە دادگایی ئۆجەلان بکات. ئەلمانیا بەباشی هۆشی بەوەوە بو کە هێنانی ئۆجەلان بۆ دادگاکانی پەلدەکێشێت بۆ توندوتیژی لەنێوان دوو ملیۆن و نیو تورك و کورد لەخاکەکەیدا، هەر بۆیە راشکاوانە

---

[319] Le Soir, November 25, 1998, cited in www.globalsecurity.org.

ترسی خۆیان لە تۆڕەکانی ڕێکخراوی پەکەکە لە خاکەکەیاندا نەدەشاردەوە. بەرپرسانی ئیتاڵی ئۆجەلانیان خستبووە ژێر چاودێرییەکی وردو ئیقامەیەکی جەبرییەوە، ئەویان بردبووە باڵەخانەیەکی سێ نهۆمی کە تایبەت بوو بەهەوادارانی پەکەکە لەبەشێکیاندا پۆلیس و لەوانی دیدا ئۆجەلان و میوانە هەمەچەشنەکانی دەمانەوە.

لەگەڵ رووەوە رۆما دڵگیربوو بۆ ئۆجەلان، ئەو لە ئاپارتمانێکی باشدا هێڵرا بوویەوە. دیارە کە ئۆجەلان ئازاد نەبوو، بەڵام ئازاد بوو لەوەدا کە پەیوەندی لەگەڵ کێدا بکات گەر بیهەوێت. ئەو لەرێی تەلەفۆنەوە پەکەکەی دەبرد بەرێوە، لەوێوە تەلەفۆنی بۆ سوریاو بۆ باکوری ئێراق دەکرد.

لەوێوە فەرمانی دەردەکردو بڕیاری دەدا لەمیتینگو کۆبوونەوەکاندا کێ ئامادە بێت و کێ ئامادە نەبێت. هەر لەوێو لەشوێنی دەستبەسەرییدا ئۆجەلان مژوڵی هەموو ئەو میوانانە بوو کە دەهاتنە سەردانیی. لەوێ بەرپرسانی پەکەکەی ئەوروپا دەهاتن و مشتومرشیان لەبارەی داهاتووی رێبەرەکەیان دەکرد. هاوکات رۆژنامەنوسان دەهاتن و سەرنج و روانینی خۆیان لەمەڕ رەوشەکە دەدا. هەروەها دەستە بەدەستە کەسایەتی کوردیی و غەوارەکان دەهاتن و هاوسۆزییان بۆ رێبەری دەستبەسەر دوپاتدەکردەوە. ئۆجەلان بەباشی دەستی رادەگەیشت بە میدیاو راگەیاندنەکان. بەجۆرێك کێشەی کورد لەو رەوشەدا ببویە نێوەندی باسو خواستێکی گەرمو بەشێك لە کۆڵەرەوانی سیاسی تورك بە نیگەرانییەوە دەیانڕوانییە ئەو گرنگیپێدانە میدیایەی ئۆجەلان و پێشنیازیان ئەوەبوو کە باشتر وابوو ئۆجەلان هەر لەسوریادا بمایەتەوە، چوون هیچ نەبێت لەدنیای دەرێ پەرێزو دوورە دەست دەبوو.

حەسەن دەیگوت:"پشتیوانییەکی ئێجگار مەزن بۆ ئۆجەلان لە گۆڕێدا بوو". هەروەها دەیگوت:"لەماڵەکانی ئیتاڵییەکاندا دروشم و وێنەگەلێك هەبوون کە نوسرابوون، ئۆجەلان بەخێر بێت بۆ وڵاتەکەمان. ئاڵاو وێنەکانی پەکەکەو ئۆجەلان دەبینران و خەڵکیی پرسیاریان لەبارەیەوە دەکرد".

وەلێ دەستپی بەدەستپێکردنی ئیتاڵیا بۆ کۆڵینەوە لە داواکەی ئۆجەلان لە مافی پەنابەرێتیدا ببوویە مایەی نیگەرانی و نائارامیی.ئۆجەلان وا بیریدەکردەوە بۆ ئیتاڵییەکان ئەوە کارێکی سانایەو سەیری لە دواخستنی داواکەی دەهات. هاوکات دەیپرسیی بۆچی لەجیاتی ئەوەی وەك رێبەرێکی سیاسیی مامەڵەی لەگەڵدا بکەن، وەك تاوانبارێك لەتەکیدا دەجوڵانەوە. راستییەکە ئەوەیە کە ئەو لە ئەوروپادا بوو، هەموسەرنجەکانیش کە لەسەر پرسی کورد چڕکرابوونەوە ئاماژە نەبوون بە دڵنەوایی ئەو. هاوکات تەواوی کوردانیش لەتك بۆچوونی ئەودا نەبوون و پەکەکە تەنێ لەلایەن هاوسۆزان و هەڤاڵانی خۆیانەوە پشتیوانیان لێدەکراو دۆزەکەیان وەك دۆزی کورد بەگشتی لێکنەدەدایەوە. حەسەن دەیوت: "هەندێك رۆژ حاڵی باش بوو، هەندێك جاریش بەتەواوی دادەتەپا". هەروەها دەیگوت: "ئۆجەلان لە زۆر رووەوە نیگەران بوو، دەترسا زیندانیی بکرێت، دەترسا بکوژرێت، لەوەیش نیگەرانبوو کە سەرۆکایەتییەکەی لەدەستبدات، یاخۆ کۆنترۆڵی حزبەکەی لەدەست دەربچێت و ئیدی دەسەڵاتی بەسەریاندا نەشکێت". هاوکات حەسەن وابیری دەکردەوە کە ئۆجەلان لە ولاتێکی دیموکراسیدا ئارام نابێت. هەربۆیە ناوبراو لەم بارەیەوە دەیوت: "وابیرم دەکردەوە کە ئۆجەلان لە هێزو دیموکراسیەتی ئەوروپییەکان دەترسا، چوون لە ئەوروپادا هەموو شتێك بەیاساوە پەیوەستە نەك بە ویست و وەسییەتی کەسەکان". ئۆجەلان بەشێوەیەکی بەرچاو لێدوان و سەرنجە هەڵەکانی بوونە مایەی سەرئێشەو رەشبینی بۆیو ئیدی هەستی کرد لە رەوشێکی تێکسمڕاودا خۆی دەبینێتەوە. ئەو بەشێوەیەکی رەشبین و رووگرژانە ئاماژەی بە پیلانە نێونەتەوەییەکان دەدا لەسەر پەکەکەو ئەمەیشی لە رۆژنامەی پارتی سەربەخۆبوونی پەکەکە دا خستبووە روو، پێیشی وابوو پلانەکە لەلایەن ئیسرائیل و ئەمریکاوە لە دژیان بەڕێوەدەبرێت. ئۆجەلان لە خولەکێکدا بڕیاریدا بێتە ئیتاڵیاو پاشان بمێنێتەوەو حزبەکەی بکاتە بزووتنەوەیەکی راست و رەوانی سیاسیی.

هاوکات هۆشداری ئەوەی دا کە واز لەپەکەکە بێنێت و پاشان بۆی دانیشێت. هەروەها بانگشەی کۆتاییهێنانی خەباتی چەکداریی پەکەکەی کرد، وەلێ هیچ رێیەکی

نوێی نەخستە روو بۆ چالاکی و خەباتی پەکەکە. لە گفتوگۆکانیدا لەگەڵ چەکدارانی پەکەکە لەباکوری ئێراق، سوێندی دەخوارد کە دەربەدەربوونی لەسوریاوە گوناهو تاوانەکەی لەئەستۆی هەڵەو پەلەکانی واندایە. بەرە بەرە چەند حەوتوویەك تێپەڕین. ئۆجەلان زۆر زیاد کەوتبووە هەڵەداوان بۆ گەیشتن یان دۆزینەوەی وڵاتێك تا پەزیرایی لە ئامادەبوونی بکات. کوردانی ترو کەسایەتییە سیاسییەکان لەوانە کەمال بۆرقای رکابەریی، کە ئۆجەلان لەهەموو ئەوانی دی بەهەندو جددی سەیریی دەکرد. هاتن بەپیریی چارەنووس‌و کێشەکەی ئۆجەلانەوە. بۆرکای لەرێگەی تەلەفۆنەوە زۆری هێنابوو بۆ ئۆجەلان تا ئەوروپا لەپێناو بەرژەوەندی خۆیدا بەکاربهێنێت. بۆرکای بەمجۆرە هەوڵەکانی خۆی دەگێڕایەوە: "پێم دەگوت، رۆما دەرفەتێکی گەورەیە بۆئەو، لەئەوروپادا بیت باشە بۆت". هەروەها دەیگوت: "بەلاَم کێشەی ئەم پیاوە ئەوەبوو، گەرەکیی بوو دەمو دەس مافی پەنابەرێتی سیاسی بەدەستبهێنێت، وەلێ وەختێ هەلومەرجەکەی بۆدەرکەوت، ئیدی زانی ئەوەی کە روودەدا جیاوازە لەوەی کە پێشبینی دەکرد".

پشتیوانیی بەرفراوانی کوردان بۆ ئۆجەلان لەسەر ئاستە جیاوازەکان، بەجۆرێك لە جۆرەکان ئۆجەلانی توشی دڵە راوکێ کردبوو. بیرۆکەی ئۆجەلان لەوەدابوو کە پشتیوانیی بەرفراوانی جولانەوەی نەتەوەیی بەو بەربلاَویەو بێ بەرنامە مایەی لەدەستدانی هەیمەنەو جڵەوی بزوتنەوەکەیە لەدەست خۆیدا. لەرابردویشدا هەرکات پێشنیازی یەکێتیو جولانەوەی لەوجۆرە کرابێت، ئەوا ئۆجەلان بەوردی کاری کردووە لەسەر لاوازکردن و بەلارێدابردنی، پێش ئەوەی تەحەدای هێزو هەرەکەت و نواڕینی پەکەکە بکات. وەلێ ئێستا خەریکە بەکاوە خۆ بزووتنەوەیەك چێ دەبێتو هیچ رێگرییەکیشی لەبەردەمدا نییە، ئەوەیش مانای لێسەندنی هێزو قسەی هەوەڵی پەکەکەو ترسی ئۆجەلانیش لەو روانگەیەوە دەرهێنانی بەرەکە بوو لەژێر پێی خۆیدا.

ئۆجەلان سوربوو لەسەر ئەوەی کە نوێنەرایەتییەکەی لەئەوروپا وڵاتێکی میوان دۆستتری بۆ بدۆزنەوە. دیارە کە نوێنەرانی پەکەکە لەئەوروپا یان دەترسان واقیعی

ڕەوشەکە بەئۆجەلان بڵێن یاخۆ ئەوانیش بەهەڵە لە کۆمەکی نێونەتەوەیی تێگەیشتبوون و پێیان وابوو گرتنەبەری ڕێو شوێنی دی باشترە. تا دواجار بڕیاری کۆتایی بۆ ئۆجەلان هات. حەسەن لەم بارەیەوە گوتی: "ڕۆژێك تەلەفۆنم کرد بۆ ئی". مەبەستی حەسەن فەرماندەیەکی پێشووی پەکەکە بوو کە نەیەویست دەرکەوێت. حەسەن گوتی: "تەقریبەن لە کاتژمێر دووی بەیانیدا بوو، پێم گوت سەرۆك بڕیاری داوە لێرەکانێ جێگیربین و بمێنینەوە، ئەو لەوەلآمدا گوتبووی ئەوە کارێکی باشە، بەلآم گرەنتی چییە کە کاتژمێر شەش بیروبۆچوونی بگۆڕێت و شتێکی تر بڵێت؟".

لە ١٦ی مانگی یەکی ١٩٩٩ دا، ئۆجەلان بۆ دوواجار بۆچوونی لەمەڕ پرسی مانەوەی گۆڕا. ئەوەبوو فڕۆکەیەکیان بۆ ئۆجەلان گرت و ڕاستەوخۆ بەرەو فۆکەخانەیەکی دەرێی مۆسکۆ سەفەری کرد. ئەمەیش پاش ڕازیکردنی بەرپرسانی رووسیا هاتبوو لەلایەن نوێنەرانی پەکەکەوە. بەلآم رووسیا دەمو دەست لەم ڕێککەوتنە پاشگەزبوونەوە. ئەوە لەکاتێکدا بوو ئۆجەلان لەوباوەڕەدا بوو کە رووسیا بواری دەدەات تا شەش مانگ لەوێدا بمێنێتەوە. دیارە کە نوێنەرانی پەکەکە هەڵە لە دانوستانەکان گەیشتوون و لەتەك خەڵکی خۆیدا قسەیان نەکردووە، یاخۆ دروستە کە هەموو شتێك لە ڕامیاریدا قابیلی ڕوودانە. ئیدی پاش هەفتەیەك لەدەستبەسەرکردنی ئۆجەلان لە تاجیکستاندا، هەڕەشەی بەزۆر ناردنەوەی کرا بۆ سوریا. پاش ئەو حەوتە، لە ٢٩ مانگی یەکی هەمان ساڵدا، برایە سان بترسبۆرغ. لەوێشەوە لەلایەن دەریاسالارێکی خانەنشینی یۆنانییەوە، کە لەمێژە هاوسۆزی پەکەکە بوو، کاری بۆکرا و بەفڕۆکەیەکی تایبەت گەڕێنرایەوە بۆ یۆنان.

ڕۆژنامەیەکی نێزیك بە حکومەت نوسیبووی: "یۆنان وەختێ پشتیوانی پەکەکەیە کە سەرئێشەکەی بۆخۆی نەبێت. بۆنمونە داوایان کردبوو لەئیتاڵیا مافی پەنابەریی بداتە ئۆجەلان، ئیتر بەسانایی ئەوەیان بیرخۆیان بردبوویەوە کە بۆخۆیان ئەویان وەدەرناو مافی پەنابەریشیان پێنەدا. هەربۆیە هەرکات بیانزانیایە پەکەکە مەترسییە، ئیدی گوێی خۆیان لێدەخەواندو دەستبەرداری دەبوون. هەواڵی گەڕانەوەی ئۆجەلان، هەریەك لە حکومەتو سەرۆك وەزیران کۆستاس سیمیتسی دوچاری ترسو بیم کردەوە، بەگوێرەی

راپۆرتەکان کاتیٚ سەرۆك وەزیران گوێبیستی هەواڵەکە دەبێت، بەرچاوی سوور دەبێت[320]. ئەو هۆکارگەلێکی هەبوو تا ترس و دڵەراوکێی خۆی لەپەکەکە نەشارێتەوە. چونکە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تورك رایگەیاندبوو کە هەر وڵاتێکی دراوسیٚ ئۆجەلان بگرێتە خۆ ئەوا رووبەڕووی هێرشی سەربازیمان دەبێتەوە. هاوکات بەهۆی تەنگژەکانی نێوان یۆنان و تورکیا لەسەر قوبرس و دورگەکانی دەریای ئیجە، ئەوا یۆنان ئامانجێکی لەپێشچاو بوو بۆ تورکیا[321].

هەربۆیە بەرپرسانی یۆنان گوتیان بە ئۆجەلان کە وڵاتەکەیان جێبهێڵێت. بۆئەوەی ئۆجەلان و پشتیوانە یۆنانییەکانی رازیبکەن بەخواستەکەیان، بەڵێنیان پێدا لەوڵاتی هۆڵەندا دا مافی پەنابەرێتی بۆ دەستەبەر بکەن. دیارە کە ئەم بەڵێنەیش بەسبوو بۆ ئەوەی ئۆجەلان قایلبکەن تا بارگەو بنەی بپێچێتەوەو بەرەو فرۆکەخانە ملبنێتەوە. وەلیٚ پاش گەیشتن و نیشتنەوەی لە مینسك و بەلا روسیا، ئەو فرۆکەیەی کە بڕیاربوو پەیگیرییان بکات هەر نەگەیشت. دواتر ئەو گازاندەی ئەوەی دەکرد کە بۆماوەی ٤ کاتژمێر لەنێو رەوش و ژینگەیەکی بەستەڵەکاویدا لەچاوەڕوانیدا بووە[322]. ئیدی لە نیوەشەوێکی سەرەتای مانگی دوودا ئۆجەلان بە هەمان ئەو فرۆکەیەی کە پێی رۆیشتبوو، دووبارە بەرەو ئەسینا گەڕایەوە. وەلیٚ بەرپرسانی ئاسایشیی یۆنان رێگەیان بە چوونە ناوەوەی نەداو دەمودەست بەرەو دوورگەی کۆرفو دووریان خستەوە. لەویٚ پێشنیازی بۆکرابوو تا بەرەو وڵاتی کینیا بڕوات و لەڕێی ئەو وڵاتەوە بتوانێت مافی پەنابەرێتی سیاسی لە وڵاتانی ئەفریقادا دەستەبەر بکات. ئیدی ئۆجەلان تا روخسەتی رێگەیەکی نویٚ بدۆزێتەوە، لەژێر چاودێری و پاراستنی یۆناندا بوو، ئەویٚ دەم ئەو بیری لەپلان و دەسیسەی وڵاتان دەکردەوەو لەهەمبەر یۆنان دوچاری رەشبینی ببوویەوە، باش دەیزانی چ هەوڵێك لە گۆڕێدایە بۆ خۆقوتارکردن لە بوونی ئەو لەوڵاتەکەیان.

---

320 Celik, Agri, 420.
321 In their January 28, 1999 meeting. Celik, Agri, 419.
322 Inanc and Polat, Apo, PKK, 31.

لەدووی مانگی فێبریوەریدا ئۆجەلان لە پشکنینی پاسپۆرتەکەی قوتارکراو لە ڕێگەی فرۆکەیەکی یۆنانییەوە گەیەنرایە کینیا. ئۆجەلان هەر لە ڤێللای باڵوێزی یۆنان لە کینیا، ئامادەکاریکرد بۆ داواکاریێ مافی پەنابەرێتی سیاسیی لە کینیادا. لەهەمانکاتدا دەزگای هەواڵگیریی تورکیاو ئەمەریکاو هەندێك لە ولأتانی تر لەهەوڵو تەقەلای ئەوەدابوون تا شوێنو ڕێگەی ئۆجەلان دەستنیشان بکەن. دیارە پێگیریکردنی ئۆجەلان فرە دژوار نەبوو، بەتایبەت کە قسە لەسەر مانەوەی ئەو دەکرا بۆ ماوەیەکی کورت لەیۆناندا. لە نەیروبیشدا ئۆجەلان هەمیشە تەلەفۆنی بەکاردەهێناو لەدەوروخولی شوێنی مانەوەیدا بەپێیان بەنێو باخچەکاندا دەگەڕا. پاش دوو ڕۆژ لەگەیشتنی بۆ کینیا، ڕۆژنامەیەکی کینیا وێنەی ئۆجەلانی دابەزاندو بە بروزی نوسیبووی : "کێ ئەزانێت ئەم پیاوە کێیە؟".
لە ٥ی فێبریوەریدا بەرپرسێکی حکومەتی کینیا بانگهێشتی باڵیۆزەکەی کردو پێی گوت، پێویستە ئۆجەلان هەرچی زووترە ولأتەکەی بەجێبهێڵێت. دیسانەوە بەڵێنی نویێ هاتە گۆڕێ، کە باسی لە دۆزینەوەی پەناگەی ئۆجەلان دەکرد لە هۆڵەندا. فشارەکان لەسەر باڵوێزی یۆنان زیاتر بوون، بەوەی ئۆجەلان ئەوەی دابوویە دوواوە کە شوێنی مانەوەی لە کینیا جێبهێڵێت.

لە ١٢ فێبریوەریدا، کینیا کردیە سەر باڵوێزی یۆنان و پێی ڕاگەیاند کە ئەوان ئاگاداری ئەوەن کە ئۆجەلان لە باڵوێزخانەدایە، هەر بۆیە هەرچی زووترە پێویستە ئەویێ بەجێبهێڵێت. وادیاربوو کە دەزگای هەواڵبریی ئەمەریکا لەپاش تەقینەوەکەی مانگی هەشتی باڵوێزی ئەمەریکا لە نێروبی، دەستی دابوویە ئامادەییەکیی بەربلأوی بوونی خۆی لەو ولأتەدا. هاوکات بەڵگەی ئامادەیی ئۆجەلانیش درابوویە ئەمریکییەکان. بەدڵنیاییەوە ئەنکەرەیش زانیاری لەوبارەیەوە زووتر لە ئەمریکییەکان بەدەستگەیشتبوو. هەربۆیە بەرپرسانی یۆنان لە هەموو لایەکەوە کەوتبوونە ژێر فشارو بەر ڕەسییەوە. هەربۆیە پێشنیازیانکرد بۆ ئۆجەلان کە هەرچی زووترە لە کەنیسەی نێوەندی شاردا داوای پەنابەرێتی بکات. ئۆجەلان هەستی دەکرد کە ڕەوشەکە فرە دژوارە. هەربۆیە ئۆجەلان بە پەلە پرۆزیێ تەلەفۆنی کردو داوای کرد کە بیێ وەستان

هەوڵبدەن   وڵاتێکی دیکەی بۆ بدۆزنەوە تا پەنای بۆ بەرێت. هەر لەوکاتەدا تەلەفۆنی کرد بۆ ڤیللا کۆنەکەی خۆی لەحەلەب. ئەوکات فەرماندەی پەکەکە باتوفا تا ئەو وەختەیش لەوێ مابوویەوە. ئۆجەلان بەتوندی سەرزەنشتی گەریلاکانی ئەوێی کردو هەلومەرجی ناهەمواری خۆی خستە گەردنی ئەوان. هاوکات نەوالی تاوانبارکرد، ئەو خانمە فەرماندەیەکی بەهێزو کارا بوو، هاوکات هەموو ئەوانەی لەبارەگای سەرکردایەتی زاب تێوەگلاند کە لەگەڵ شەمدین ساکیك گەرەکیان بووە دەستەیەك لەبەرامبەر ئەودا دروستبکەن‌و بەرکەناری بکەن. باتوفا بەم شێوەیە روانگەی ئۆجەلانی باسدەکرد: " زۆر کەم بە خێرایی دەدوا، ئەو پێمانی وت، پێویستە سەر راستانە بنووسن، بۆم بنوسن کە پلانێك لە گۆڕێدا هەیە دژ بەمن. تەنانەت هیچ کەسێك ناهێڵێت فڕۆکەکەم لەسەر زەویی ئەودا بنیشێتەوە".[٣٢٣]

دواتر ئۆجەلان لەلایەن بەرپرسانی یۆنانەوە پێی راگەیەنرا کە هۆڵەندا ئامادەیی دەربڕیوە تا وەك پەنابەر بیگرێتە خۆی. ئەو هیچ هەڵبژاردەیەکی تری لەبەردەمدا نەبوو جگە لەوەی کە باوەڕ بە قسەکانیان بکات. لە پازدەی هەمان مانگدا توێتایەکی لاندرۆڤەر لەشوێنی مانەوەی ئۆجەلان دەرکەوت، لەوێدا پۆلیسی کینیی هاتن تا هامڕایی ئۆجەلان بکەن بۆ رۆیشتنی. وەختێ باڵیۆزی یۆنان بە ئۆجەلانی وت گەرەکیانە بەرەو فڕۆکەخانەی بەرن، ئۆجەلان بەرپەرچی دایەوەو گوتی ئەوە کارێکی ئەستەمە. پاشان باڵیۆز گوتی، کەواتە لەجیاتی ئەوان ئێمە دەتگەیەنینە فڕۆکەخانە.

ئەو ماشێنەی ئۆجەلانی بەمەبەستی فڕۆکەخانە برد،  هەر نەگەیشت. چوون هەر لەسەرەتاوە ماشێنەکە لەژێر چاودێری دەزگای هەواڵگیریی تورکیدا بوو. هەربۆیە راستەوخۆ ئۆجەلانیان بردە بەشێکی جیا لە فڕۆکەخانەکە. لەوێ فڕۆکەیەکی تایبەتی تورکیی، کە تایبەت بوو بە بازرگان و خاوەنکارە تورکییە باوەڕپێکراوەکان وەستابوو[٣٢٤]. ئۆجەلان دوواتر ئەوەی خستە روو کە هەر لەسەرەتاوە زانیبووی کە

---

[323] Cited in Celik, Agri, 423.
[324] Ozkan, Operasyon, 157.

شتێکی هەڵە خەریکە روودەدات، وەلێ هیچ چارەیەکی تری لەبەردەمدا نەبووە تا خۆی لە رووداوەکان ببوێرێت. بەگوێرەی گێڕانەوەکان ئۆجەلان تا ئەوکاتیش نەیزانیوە خەریکە چی دەقەومێ، چوونکە تا دووا خولەکیش ئەو بەراستی لەو باوەڕەدا بوو کە فڕۆکەکەی بەرەو هۆڵەندا پەرواز دەکات. پاش ئەوەی سواری مەتنی فڕۆکەکە دەکرێت، ئیدی کەلەپچە لەدەستانی دەکەن. پاشان دەمو چاوی بەتوندی دەبەستن و بێهۆش دەکرێت و دکتۆری سەربازی نێو فڕۆکەکە پشکنینی تەندروستی بۆ دەکات[٣٢٥].

دەزگای هەواڵگیریی تورکیە بەشێك لەو گەشتەی بەلانی کەمەوە تۆمارکردوو دواتر لە تەلەفزیۆنەکاندا پەخشی کرد. لەو بەشەدا هەواڵگرەکەی تورکیا دەمو چاوی بەستراوی ئۆجەلان لادەدات، ئۆجەلان بەچاوی خەواڵو و نیمە کراوەوە فرە بە هێواشی دەجوڵێتەوە.[٣٢٦] پاشان کەسەکە بە ئۆجەلان دەڵێت: "ئۆجەلان بەخێربێت بۆ نیشتیمان".

کوردەکان باوەڕیان وەهایە کە ئۆجەلان بووەتە قوربانی پلانێك، بەئاشکرایش سەرزەنشتی ئەمریکاو ئیسرائیل و تەواوی ئەورووپا دەکەن بۆ سەرگرتنی پلانێکی لەو بابەتە. چونکە بەدڵنیاییەوە ئەمەریکا رۆڵی گێڕاو ئەورووپا ئەنجامیدا (تێوەگلانی ئیسرائیلیش لەم دۆسییەیەدا لاوازتر دەبینرێت). ئەمەریکا زانیاری هەواڵگریی کۆکردبوویەوەو فشاریشی خستە سەر وڵاتانی ئەورووپا تا هیچکام لەوان مافی پەنابەرێتی بە ئۆجەلان نەدەن. هاوکات وڵاتانی ئەورووپایش رۆڵی خۆیان لەوەدا بوو کە رەنگبوو بتوانن مافی پەنابەرێتی بدەنێ و سنگفراوانی لەبەرامبەر خواستەکانی کورد دا بنوێنن، بەڵام ئەمەیان نەکرد.

دوواجار ئۆجەلان بۆخۆی بووە قوربانی ئەو کێشمە کێشە. چونکە بڕوابەخۆبوون و گوێنەگرتن بۆ هیچ کەس ئۆجەلانی بەو رۆژە گەیاند تا نەتوانێت بزوتنەوەیەکی بەهێزو

---

[325] This is denied in Ozkan, Operasyon, 157, but videos taken of him on the plane show him overly confused and slow"moving and even his speech sounds heavy, as if he had been sedated.

[326] Ozkan, Operasyon, 158.

کارا لە ڕێگەی پەکەکەوە بونیاد بنێت. هەربۆیە بەپێچەوانەوە پارمەتیدەری لاوازکردنو پوکانەوەی بزوتنەوەکە بوو. ئەو نەیدەتوانی ڕاستییەك ببینێت کە هەموو هێزەکان لای ئەو نین‌و ئەو هەمیشە ڕاست و ڕەوا نییە.

لە کۆتایدا هیچ کەسێك هێندەی خودی ئۆجەلان خۆی، خۆینەبینییەوە کە کەوتووەتە چ چارەنوسێکی هەڵەوە. ئەو وەختێ چوو بۆ ئیتالیا، هیچی لەپاش خۆی جێ نەهێشت تا ئەنجامبدرێت، جگە لە هێشتنەوەی شوێنکەوتووانی لەچاوەڕوانیدا.

### بەندیخانە

تورکیا واپێشبینی دەکرد کە بە دەستگیرکردنی ئۆجەلان ئیدی پەکەکە هەڵوەشێتەوە. لەو وەختەدا هێشتا گەریلاکان لە چیادا هەواڵەکەیان نەبیستبوو، تورکیا هەوڵی دا وێنەکانی ئۆجەلان کە لەنێوان دوو ئاڵای تورکیادا کەلەپچە لەدەستی کرابوو لەناوچەکەدا بڵاوبکاتەوە. فەرماندە سەربازییەکانی پەکەکە لەوە ترسان کە هەواڵەکە ورەی ئەندامان دابەزێنێت‌و دەستبەرداری خەباتبن. هەربۆیە ڕێگرییان کرد تا خەڵکی هەواڵێ لەبارەی پەروازی ئۆجەلانەوە نەزانن. بەڵام لەڕاستیدا بڵاوبوونەوەی هەواڵی دەستگیرکردنی پەکەکە بەشێوەیەکی بەربڵاو لەنێو پەکەکەدا پشتیوانی و ورەی هێزەکانی پەکەکەی بۆ ئۆجەلان زیاتر برەو پێدا. کوچوك زەکی دەیوت: "هەواڵی دەستگیرکردنی ئۆجەلانمان لە ڕادیۆوە بیست". [٣٢٧] ناوبراو لە کۆنگرەی شەشی پەکەکەدا بوو لە باکووری ئێراق. لەو بارەیەوە دەیگوت: "بەبیستنی هەواڵەکە هەمووان توشی شۆك بووین. لەگەڵ هەموو ئەو گرفتانەماندا لەتەك ئۆجەلان، بەڵام ئەوەمان بە دەستکەوتی تورکیا دەزانی، هەر بۆیە هیچکەسێکمان بەهەواڵەکە خۆشحاڵنەبووین‌و وەك ئەوە وابوو دنیا ڕووخابێت بەسەرمانداو هەموو لامان نیگەران بووین".

---

[327] See Hurriyet, Feb. 23, 1999 (Internet edition).

هاوكات كوردان لەهەموو شوێنێك تورەو حەپەساو بوون. لەتەواوی شارە مەزنەكانی ئەوروپا، لە لەندەنەوە تا ڤییەنا، كوردەكان دەستیان دایە دادو بێدادو نواندنی توندو تیژیی، بەتایبەت لەبەردەم باڵوێزخانەكانی كینیاو یۆنان. ئەوان تورەبوون لە دەستبەرداربوونی ئەو وڵاتانە بۆ پەنادانی ئۆجەلانو لەهەمبەر كارو كەسابەتو بەرژەوەندییەكانیان تورەیی و هەرەشەی خۆیان پیشاندا. هاوكات بەخێرایی شەپۆلی تورەیی رووی كردە باڵوێزخانەكانی ئیسرایلو لەنێوەندی پڕوپاگەندەكاندا روسیاش بە تێوەگلان لەو پلانە تاوانباركرا. لەبەرلیندا ٣ كورد پاش ئەوەی هێرشیان كردبووە سەر باڵوێزخانەی ئیسرائیل تەقەیان لێكراو كوژران. وەك نیشاندانی نارەزایی، هەندێك هەوڵیاندا ئاگر لەجەستەی خۆیان بەربدەن. لە هەریەك لە ئێران و ئێراقدا، كوردەكان زنجیرەیەك خۆنیشاندانیان ئەنجامدا. لەتوركیادا پێویستبوو پرۆتێستەكان فرە بەوریاییەوە گوزارشتیان لێوە بكرێت، هەربۆیە بازارو دوكانەكانی شارێكی وەك دیاربەكر داخرانو خەڵكی نەچوونە سەركار. لە ئەمریكادا كوردان لەبەردەم كۆشكی سپیدا گردبوونەوەو دەستگیركردنی ئاپۆیان شەرمەزاركرد. نەجمەدین كەریم وەك قسە كەرێكی هێمن و لەسەرخۆ و سەرۆكی پەیمەنگەی سەربەخۆی كوردیی لە واشینتۆنو كوردێكی ئێراق لەئەمریكا دا، هەوڵی دا تا ئامانجی ئەم نومایانەی خۆیان روونبكاتەوەو گوتی:"لێرە شوێنێك نییە تا بۆچوونی خۆمان ئازادانە دەربڕینو كۆڵینەوە لەبارەی گرفتەكانمان بكەین، ئێمە تەنها هەوڵدەدەین بۆ بەدەستهێنانی مافەكانمان وەك هاوڵاتییەكی یەكسان لەتوركیادا، لەگەڵ پاراستنی شوناسی نەتەوەیمان". [٣٢٨]

ئۆجەلان لە زیندانێدا بوویە رەمزی نەتەوەیی كوردان. چوون تا ئەوكات زیندان و بندەستكردنو بەكارهێنانو پەراوێزخستن لەلایەن نەتەوەكانەوە لەگەڵ دڵی بەرژەوەندییەكانیان یەكی دەگرتەوە. بڵاوبوونەوەی وێنەكانی ئۆجەلان بەو جۆرە زەلیلو زەبوونییەو كەلەپچەكرانی لەنێوەندی ئاڵاكانی توركیادا، تەنێ ئاماژە نەبوو بۆ

---

[328] VOA at http://www.globalsecurity.org/military/library/news/1999/02/990219"kurd2.htm.

سەركوتو چەپاندنی ئەو، بەڵكو ئاماژە بوو بۆ بندەستكردن و زەلیلكردنی هەموو كوردێك.

لەراستیدا بۆ توركەكان هۆیەك هەبوو تا لەبەرامبەر دەستگیركردنی ئۆجەلاندا خۆشحاڵی خۆیان نیشانبدەن، بەلام جگە لەنیازێكی دیاریكراو هیچ پێویست نەبوو كەسێكی چەپگەرای كورد بەو جۆرە لەپێش ئالای توركیادا زەلیل پیشانبدەن. دیارە كە ئەوە مەبەستێك بوو بۆ سوكایەتی و بێ ئەرزش نیشاندانی دۆزی كوردان لە ولاتەكەیاندا.[329] سەرۆك وەزیرانی توركیا بولند ئەجەوید پاش دەستگیركردنی ئۆجەلان وتبووی: "ئەو گرفتانەی رووبەرووی توركیا دەبنەوە، نە كێشەی كوردە نەیش گرفتی نەتەوەیی، هەروەك ئەوەی ولاتانی ئەوروپا گەرەكیانە بەو جۆرە ناوزەدی بكەن".

ئەجەوید بەپێچەوانەی ئەوەوە جەختی دەكردەوە كە كێشەكە پەیوەستە بە رەوشی دوواكەوتوویی و هەژاریی هەرێمەكەوە. ئەو ولاتەكەیەوە ساڵی ١٩٧٣دا سەرۆكایەتی داگیركردنی قوبرسی كردبوو . وەلێ توركانێك هەبوون كە پێیان وابوو ئێستەكانێ كاتی چاوخشاندنەوە بەپرسی كوردا هاتووە. دیارە كە چەندین ساڵ بوو ئەو تێگەیشتنە بەرجەستەببوو كە ئەنكەرە میتۆدی خۆی لەهەمبەر كەمینەی كورد ناگۆرێت، بەتایبەت كاتێك كە جەنگی گەریلایی دژ بەتوركیا لەلایەن پەكەكەوە راگەیەنرابوو.

تەنانەت لە كۆتایدا توركوت ئۆزالی سەرۆك كۆمار، ئەوەی بایەخی فرەی بە بەرقەراربوونو برەوی ریفۆرمەكانی ولات دەدا، ئەوەی نەشاردەوە كە ئەو لەدەستپێكی هەموو شتێكدا ئاتاج بوو بە ئاگربەستی پەكەكە. موعەمای ئەنكەرە لەوەدا خۆی دەبینییەوە كە وەك هەر ولاتێكی تر كاتێ مامەڵەی دەكرد لەگەڵ راپەرینێكی لەوجۆرەدا، ئەوا بەگرتنەبەری ریفۆرمەكان پشتیوانی لە خەباتی چەكداریی گەریلاكان لاواز دەبوو، لەبەرامبەریشدا گەریلاكان بەهێز دەبوون. چوون بانگەشەی ئەوەیان دەكرد كە ئەوان براوە بوون لە هەوڵەكانیان. لێرەدا توركیا رووبەرووی رەوشێكی جیاواز

---

[329] Sami Kohen, "Turks take hardened stance after Ocalan," Christian Sci" ence Monitor, Feb. 26, 1999.

ببوويەوە. ڕەوشەکە لەگەڵ ئۆجەلان لەزیندان و خەباتی پەکەکە و هەوڵەکانی پەکەکەدا بوو کە مژوڵی قۆناغی داهاتوی خۆیان بوون کە چۆن خۆیان بەڕێوە بەرن. تورکیایش لەو پێودانگەوە سەیری کێشەکەی دەکرد کە چۆن لەڕەگەوە کۆتایی بە گروپەکە بهێنێت.

ستوون نوسی سیاسی جەنگیز چاندەر بەمجۆرە تێبینی ڕەوشەکەی دەکرد: " ئیتر کاتی ئەوە هاتبوو چۆن بەڕێگەیەکی نەرمو نیان مامەڵەبکرێت. هەرچەند ڕەنگبوو ئەوە ڕێگەیەکی دژواربێت بۆ ئەوەی بگیرێتە بەر". ناوبراو یەکێك بوو لەو ڕۆژنامەنوسانەی کە لەسەر نوسینە واقعییەکانی لەسەر پرسی کورد، ساڵێك پێشتر تۆمەتو تانەیەکی ئێجگار فرەی ڕووبەڕوو کرابوویەوە بۆ ئەوەی لەکەداربکرێت. ئەو دەیوت:"پێم وایە کێشەکانی کورد پەکەکەو ئاپۆیان دروستکردووە، نەك بەپێچەوانەوە". چوون چارەسەرییەکان بە بوونی شوناسێکی فەرهەنگیی‌و دیموکراسیی بۆ کوردەکان خۆبەخۆ چارەدەکرێت"[٣٣٠].

کوردەکان وادیارنەبوو کە هیوایەکی مەزنیان هەبێت. دەستگیرکردنی ئۆجەلان و مانەوەی ئاماژەیەك بوو بە کلۆمدانی دەرگاکانی چارەسەریی و گۆڕانێکی واقعیی.

هەندێك لەچالاکەکانی کوردو تەنانەت ئەوانەی سەربەخۆبوون‌و دوور بوون لەپەکەکە پێیان وابوو ڕەنگە دادگاییکردنیی ئۆجەلان ببێتە ڕێگەیەك تا دۆسیەی کوردیی گوێی لێبگیرێت. بەرگری بێ ئەندازی ڕێبەری پەکەکە لە خەباتی چەکداریی، هاوتابوو لەگەڵ شیکردنەوەکانی بۆ ئەو پرسەی کە خەڵکی بگەیەنێتە ڕادەی پێویست، تا دڵنیایان بکاتەوە لەوەی کە بەڵێ کوردان بندەستن‌و پێویستییەکانی گۆڕانکاریی پێوستە بێنە گۆڕێ. لەهەمان کاتدا سەرنجی نێونەتەوەیی لەمەڕ دادگایی ئۆجەلان. بەجۆرێك بوو کە هەوڵیاندەدا دادگایەکی عادیلانە بکرێت لەنێوخۆی وڵاتدا.

هەربۆیە بەمەیش حکومەتیان ناچار بە گۆڕانکارییەکی هەمەچەشنکردبوو لە دادگای ئاسایشی میریدا. ئۆجەلان وەك دروشمێك هاتە نێومەیدان، ئیدی ئەو جیاوازبوو لەو ئۆجەلانەی کە ڕێبەری گروپێکی وەك پەکەکەبێت.

---

[330] Sabah newspaper, February 25, 1999 (Internet edition).

پارێزەری کورد ئەحمەد زەکی ئۆجئۆغلو دەیگوت: "ئەوان لەهەوڵی ئەوەدا بوون کە خەڵکی کورد دادگایی بکەن، ئەویش لەدادگایی شەخسی ئۆجەلاندا خۆی دەبینییەوە". ناوبراو لەنەوەدەکاندا بەوە خۆی جوداکردبوویەوە کە رەخنەی سەختگیرو بێ ئەمانی لە عەبدوڵا ئۆجەلان دەگرت. ئێستەکانێش خۆبەخشانە سەردەستەی تیمێکە بۆ بەرگریکردن لە عەبدوڵا ئۆجەلان. چوون لە ئێستادا عەبدوڵا ئۆجەلان ببوویە رەمزێك. ناوبراو دەیگوت:"نەمتوانی بەسانایی وەك چاودێرێك تەماشای رەوشەکەبکەمو هەروا بمێنمەوە، بریارمداو کلاوی پارێزەرییەکەم کردە سەرمو بەرگریم لەنەتەوەکەم لە شەخسی ئۆجەلاندا دەبینییەوە "[331].

گرفتەکە ئۆجەلان بوو، یەکەم لێدووانی ئۆجەلان لەسەر مەتنی فرۆکەکەدا بەجۆرێ بوو کە سەری لێشێوێنرابوو. یاخۆ نارۆشن بوو، نازانرێ ئەو ڤیدیۆیە چۆن روونبکرێتەوە. وادیاربوو ئەو برگانە لە قسەکانی وەرگیرابێتن تا هەستێکی ئاشتیخوازانەی لێبخوێنرێتەوە، چونکە ئۆجەلان لەهەوەڵ لێدوانیدا گوتی: "ولآتەکەمم خۆشدەوێتو دایکم تورکە. گەر بتوانم خزمەت بکەم، ئەوا دەبمە خزمەتکار "[332]. تەنها ئاماژەیەك بەسبوو بۆ ئەوەی بزانرێت کە ئۆجەلان لەژێر فشارو بەتۆپزی ئەو قسانەی پێکراوە، ئەوەبوو کە ئۆجەلان زۆربەتوندی بە هەواڵگرەکەی وت چیدی هیچ پرسیارێکی تری لێنەکات. هەر ئەمەیش بوو کە ئەو کەسە لەدواییدا گوتبووی گەر ئۆجەلان پرسیارەکانی وەلآم بدایەتەوە، ئەوا دەیانکرد بە خزمەتکارو دەیتوانی بیکات". هاوکات لەمیانی رۆژانێکدا کە ئۆجەلان گیرابوو، میدیای تورکی پرکرابوو لە راپۆرتگەلی دانپیانانەکانی ئۆجەلان، کەتێیاندا ئۆجەلان بەتێرو تەسەلی لەسەر چالاکییەکانی گروپەکە و گەریلاو پشتیوانەکانیان دووابوو، هاوکات رەخنەی گرتبوو لە چەکدارەکان و قسەی لەبارەی مێژوو سەنگینی تورکیاوە کردبوو. لەسەرەتاوە هاوسۆزانی پەکەکە واگریمانەیان کردبوو

---

[331] Gul Demir and Niki Gamm, “Okcuoglu says the Turkish legal system is on trial along with Ocalan," Turkish Daily News, April 8, 1999.
[332] Ozkan, Operasyon, 158.

که ئۆجەلان سەرخۆشکرابێت، یاخۆ بیریان لەوەدەکردەوە کە ئەو لێدوان و بەڵگانە کە ناودەبرێن هەموویان ساختەو دروستکراون. دووای هەموو ئەوانە، پێش ساڵێك، رۆژنامەنوسەکان هەموو ئەو دانپێدانانەیان چاپکرد، کەلەلایەن شەمدین ساکیك فەرماندەی پەکەکەوە دەستیانکەوتبوو. ساکیك ئەو کەسەبوو کە دوواتر لەدادگادا هەموو شتێکی دایەدوواوەو پەشیمان بوویەوە. بەڵام ئۆجەلان دوواتر دەستی کرد بە بڵاوبوونەوەی هەمان لێدوانەکانی خۆی و تەواوی بۆچونەکانی لەرێگەی پارێزەرەکەیەوە بۆ هەوادارو پشتیوانانی خۆی بڵاویدەکردنەوە[333].ئەو ستایشی هەلومەرجی زیندانەکەی کردبوو، فرە بەرێزەوە قسەی لەسەر ئەو سەربازانە کردبوو کە پاسەوانی دەکەن. هاوکات پێداگریی دەکرد لەسەر ئەوەی کە چەند بەباشی مامەڵەی لەتەکدا دەکرێت.

ئۆجەلان هەر لە لێدوانەکانیدا رۆچووبوو بە تانو پۆی دەوڵەتی تورکیاداو شانازی بەوەوە دەکرد کە دەوڵەتی تورکیا بە دەستگرۆیی کوردان دامەزرێنراوە. هاوکات ئەمەی وەك ئاماژەیەکی راستەوخۆ بۆ گەریلاکانی پەکەکە دەوتەوە. ئەو لە دوا لێدوانیدا لە سێپتەمبەردا داوای لە گەریلاکان کرد کە پابەندی ئاگربەست بن. گرنگترین شتێك کە ئەو ئاماژەی پێکرد بریتی بوو لە پاراستنی یەکپارچەیی خاکی تورکیاو کیانی تورکیا. لە رەوشێکی لەم جۆرەدا هاوسۆزو ئەندام و پشتیوانانی پەکەکە نەیاندەزانی کاردانەوەیان چۆن بێت. ئایا ئۆجەلان لەدانوستانایە لەگەڵ میریدا، یان دارای پلانێکی گەورەترەو ئەوە تەنها تاکتیکێکە یاخۆ بەئەشکەنجەو بە تۆپزیی ئەوشتانەی پێدەوترێت. چونکە بێ لەم ئەگەرانە ئەستەم بوو بروا بەو لێدوان و ئاخاوتنانەی ئۆجەلان بکرێت.

دادگاییکردنی ئۆجەلان بەتاوانی ناپاکیکردن لە ٣١ مانگی پێنجی ١٩٩٩دا دەستی پێکرد. دادگاکە پێکهاتبوو لە ژوورێکی دادگەی تایبەت لە دوورگەی ئیمرالی لەسەر دەریای مەرمەرە. ئۆجەلان لەوێ بەتاقی تەنهاو لە زیندانێکی بچوکی دوورگەکەدا دوور

---

[333] Many of the notes released by Ocalan's lawyers are available at the Kurdish opposition site http://www.welatparez.com/tr/arsiv/gorusmenot" lari/.

لەهەموو ئاوەدانییەك بەندكرابوو. ئەو لەسندوقێكی شوشەی گولله نەبڕەوە دەدووا. دەستپێكی قسەكانی و بەرگریی لەخۆكردنی بە داوای لێبووردن دەستپێكرد. سەرەتا ئەو ویستی هەموو لایەك لەوە دڵنیا بكاتەوە كە قسەكانی لەژێر گوشارو چاوسوركردنەوەدا نین. ئەو بەمجۆرە رایگەیاند: "دەمەوێ ئەوە بخەمە روو كە لەو رۆژەوەی كە گیراوم، بەڵێنم داوە لەپێناو ئاشتیدا بژیم، لەو رۆژەوەی كە هێنراوم بۆ توركیا، دوچاری هیچ لێدان و زۆرەملێیەكو مامەڵەیەكی خراپ نەبوومەتەوە"[334]. رێبەری پەكەكە دەمو دەس بانگەوازی ئاشتی كرد بۆ توركیاو بەڵێنی دا رێز بنوێنێتو دڵسۆزبێت بۆ كۆماری دێموكراتی توركیا. وشەكانی پڕاو پڕ وەفادارییو ئەمەكدارییەكی نوێی ئەویان لێدەخوێنرایەوە بەرامبەر بە میریی. هاوكات ئەوەی خستە روو كە ئەو لەپێناو بەئاكامگەیاندنی  ئاشتی و برایەتیدا بۆ توركیا، پێویستبوو بە زیندووی بمێنێتەوە. هەروەها رێزی خۆی نیشاندا بۆ هەموو ئەو خانەوادانەی كە سەربازەكانیان بەدەستی گەریلاكان كوژراون. لەمبارەیەوە وتی:"بەشداری خەمی ئەوانەم كە لەژیاندانو ئەوانەی كە ئازارو ناسۆریان هەیە"[335]. كاتێك دادگا داوای كرد ئایا ئەو وتانە وەك داوای لێبوردن لە خانەوادەی كوژراوەكان بنوسرێتەوە؟ ئەویش لەوەڵامدا رازیبوونی خۆی بۆ ئەوە نیشاندا.

شتێك كە ئامازەی پێنەدا ئەوە بوو كە كوردەكانیش بەهەمان شێوە ئازارو ئەزیەتیان چەشتووە. كوردەكانیش بەدەستی سەربازانی تورك كوژراون. ئەو ئامازەی بەوە نەدا كە خانەوادەو خێزانە كوردەكانیش عەزابارو خەمگینو چاوەڕێی كەسێكن لەتەرەفی توركەكانەوە كە داوای لێبوردنیان لێبكات. هەروەها ئەركی نەدایە بەرخۆی تا باسێ لە خواستەكانی نەتەوەی كورد بكاتو روونینەكردەوە بۆچی كوردەكان رۆژگارێكی دوورو درێژە لەخەباتدان و خواستی شۆڕش لە كەڵلەیاندایە؟ دووای ئەوەی ئۆجەلان

[334] Hurriyet, June 1, 1999, "Gundem: Yasamak Istiyorum." This and other articles are available at the newspaper 's on"line archives www.hurriyet.com .tr.
[335] Hurriyet, June 1, 1999, "Gundem: Yasamak Istiyorum."

ئاماژەی بەمەدا بۆ ئەوە بوو کە دادگا دڵنیا بکاتەوە لەوەی کە ئەو گەیشتووە بەو ئاکامەی کە ئاراستەی جەنگ ئاراستەیەکی هەڵەبوو. ئۆجەلان یاداوەری ئەتاتورکی بە ستایشەوە کرد، ئەوەی دامەرزێنەری کۆماری تورکیابوو. زۆرجاریش ئاماژەی بە جەنگی هاوبەشی تورك و کورد دەدا لەپێناو بونیادنانی دەوڵەتی تورکیادا لەساڵی ١٩٢٣ دا. لەلایەکی تریشەوە نکولی لە نیگەرانییەکانی مافی مرۆڤ کردوو سوربوو لەسەر ئەوەی کە پەکەکە پێویستبوو رۆژگارێك پێشتر وازی لەخەباتی چەکداری هێنابایە.

ئۆجەلان بە دادگای راگەیاند:"لەنەوەدەکاندا لەتورکیادا(کوردو تورك) هەنگاوی خێراو گەشەسەندنێکی پۆزەتیڤیان لەهەمبەر مافی مرۆڤدا هێناوەتە گۆڕێ". هەروەها وتی:"پاش ئەم گەشەسەندنە، راپەرین و سەرهەڵدانەکان هەڵە بوون، مادام رێگەی چارەسەریی گرفتەکان هەبوو".

هەڵگەڕانەوەی ئۆجەلان وەك شۆکێك وەهابوو، تەنێ بۆ ئەوانە شتێکی نۆرماڵ بوو کە ئەویان نەدەناسی. بۆرکای نەیاری سەرسەختی ئۆجەلان و سەرۆکی پارتی سۆسیالیستی کوردستان پێمی وت:"ئۆجەلان ترسنۆك بوو". بۆرکای هەمیشە سەرکۆنەی ئۆجەلانی دەکرد بەوەی توندوتیژەو کار بۆ زەمینە سازی ئاشتی ناکات. وەڵێ کە لێدوان و بەیاننامەکەی ئۆجەلانی بینی لەدادگادا ئیدی وەك هێمایەك بۆ خۆبەدەستەوەدان لێکیدایەوە.[٣٣٦]

هەروەها بۆرکای وتی:"قسەگەلێکی لەو جۆرەی ئۆجەلان لەسەروەختی دەستگیرکردنیدا دەکرا قبوڵبکرێن، چوون بەهۆی ئەوەوە بووە کە ئەو هەڵەی پێکراوەو رازیکراوە بە بیری چارەسەریی ئاشتیانە". لەبەیاننامەیەکیدا کە میدیاکانی ئەڵمان لەمیانی دادگاکەدا بلاویانکردەوە، بەم شێوەیە سەرکۆنەی ئۆجەلان کرابوو: "لێدوان و پەیامی ئۆجەلان بۆ دادگاو بۆ دەوڵەتی تورکیا بەم جۆرە بوو (هەرچییەکتان بوێت، ئامادەم ئەنجامی بدەم)، هاوکات رێزی بێپایانی بۆ کۆماری تورکیاو پێداگیریی و

---

[336] Hurriyet, June 3, 1999, "Gundem: Aglatan Ifade."

جەختکردنەوەی چەندینجاریی کە ئومێد دەکات ببێتە خزمەتکار، تەواویی کوردان و ئەندامانی پەکەکە دوچاری شۆککرد"[٣٣٧].

ئەگەری زیاد ئەوەیە کە ئۆجەلان بەتەواوی باوەڕی نەبوو کە خەریکە دەستبەردارو ملکەچی هەموو بەهاکانی تورک دەبێت. ئەو هیوای خۆی لەوەدا بینیبوویەوە کە راستەوخۆ بچێتە دانوستان‌و سازانەوە لەگەڵ دەوڵەتی تورکیادا. وادیاربوو کە ئەوان لە وتوێژدا بوون، ئۆجەلان پێی وابوو ئەوە هەنگاوێکی گرنگەو جگە لەوە شتێکی دیکە لەگۆڕێدا نییە. هەندێك لە سەرخەران و پشتیوانانی ئۆجەلانیش باوەڕیان وابوو کە ئەوە واقیعێکەو پێویستبووە لەستایشی دەوڵەتی تورکیادا برەو بەخەباتەکەیان بدەن.

ڕۆژنامەیOzgur Politikaی سەربە پەکەکە کە لەئەوروپادا دەردەچوو، سەبارەت بەو قسانەی کە ئۆجەلان لەبارەیانەوە دەدوا، ئاماژەی دابوو کە شتانێکی هەڵە خەریکن ڕوودەدەن. ڕۆژنامەکە نوسیبووی: "پەیامی ئاشتیخوازیی ئۆجەلان دەبوو ڕەچاوی ڕێزو حیکمەتی بکردایە، بەرپرسانی دادگا دەبێت زۆر بەرپرسانەتر و جدی تر ئەو ڕێگەیە و ئەو ڕاڤانە تاوتویێ بکەن". سەرەڕای هەموو ئەو ڕاڤەو ڕوانگانەی هەوادارو پشتیوانانی پەکەکە لەمەڕ بەیاننامە ئازاربەخشەکەی ئۆجەلان تاوتوێیان دەکرد. بەڵام ڕاستییەك هەبوو کە بڕیاری سەرۆکەکەیان بۆ بەرگریی نەبوو لەخەباتی کورد، بەڵکو هەوڵێك بوو بۆ پاراستنی ژیانی خۆی لە بەندییەتیدا.

نموونەی خیانەتێکی لەم جۆرە سەیر نەبوو، چوون ئۆجەلان دەکرا پاش ئەوەی لەسوریا دەربەدەرکرا، ڕوبکاتە باکووری ئێراق‌و لەوێدا پەنای خۆی بدات. زۆرێك لە ڕێبەرانی کورد لەوێندەر خۆیان هێشتبوویەوەو بارەگاو بنەیان لەوێ بوو. هەرچۆنێك بووایە لەو ڕەوشەدا پەکەکە گرنگتربوو لە مانەوەی خودی خۆی لە ژیاندا، وەلێ ئەو بڕوای بەو ڕاستیە نەدەکرد.

---

337 Hurriyet, June 25, 1999, "Gundem: Apo Diktator."

ئۆجەلان هیچ کات لەسەر پلان و ئامانجێك جێگیر نەبوو، ئەو هەموو فرە بواریی و هەمە چیزییە ببوویە بەشێك لە هێزی پەکەکە. ئێستا کە ئەو لە زیندانی تورکیا بوو، رەنگە بۆی روونبووبێتەوە کە لۆژیکیترین ئامانجو پلان ئەوەیە کە خۆیان وابەستەکەن بەهێزو هەرەکەتی میرییەوە. ئەگەرچی ئەمە وەك خیانەتێکی تەواو لەپەکەکە لێکدەدرایەوەو کێشەی کورد نارۆشن و گومەساربوو لەپلانەکەدا[٣٣٨].

پارێزەر ئەحمەد زەکی ئۆکچۆغلو، سەردەستەی تیمی بەرگریکار لە دۆسیەی ئۆجەلان، وەختێ زانی ئۆجەلان نایهەوێت بەرگریی لەمافی کوردو جەنگی کورد بکات، دەستی لەکار کێشایەوە. ئەو بە گلەییەوە دەیگوت: " بۆ هەموو دیکتاتۆرەکان، ئەوان ژیانی خۆیان لەهەموو شتێك پێ گرنگترە". هەروەها دەیگوت: "شتێك لە گۆرێدا نییە کە نەتوانرێت قوربانی بۆ بدرێت" [٣٣٩].

فرە بەداخەوە بۆ ئۆجەلان، چونکە میریی هیچ چاوپۆشییەکی لەپاکانەکانی ئۆجەلان نەکرد، کاتێك لە ٢٩ی مانگی شەشدا حوکمی دادگا خوێنرایەوە، هەروا بە هەوانتە بریارەکەی دادگایان نەخستبووە رۆژی دەرچوونی بریاری دادگا بۆ لەداردانی سەرکردەی نەتەوەیی کورد شێخ سەعیدی پیران لە دیاربەکر. ئۆجەلانیش بەهەمان شێوە سزای مەرگی بەسەردا سەپێنرا. هەر لەهەمان دادوەریدا کەبۆ ئۆجەلان بریاردرابوو، هەموو کارێکی خزمەتگوزاریی گشتی لێقەدەغەکرابوو. ئیدی چاودێران و کۆڵەرانی بواری یاسا خرۆشانو سرودی نیشتیمانی تورك تەواوی وڵاتی گرتەوە. هاوکات پەکەکە بێ سەرکردەو سەردار مایەوە، لەبەر ئەوە سەردەمی نوێ و پلانی هەنگاوی ئاینده دەبوو بگیرێتە بەر.

---

338

339 Hurriyet, June 25, 1999, "Gundem: Apo Diktator."

